# بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

(اللهم انی أسألک خشیتک فی الغیب والشهادە)

ناوی پەڕاو: ئەودەتبینێت

نووسەر: ئەندازیار عوسمان محمد رەشید

دیزاین: مەریوان ئەحمەد

نۆبەی چاپ: یەکەم، ٢٠١٨

چاپکردن: کتێبخانەی گەشە. سلێمانی - بازاڕی ڕاپەڕین

بۆ پەیوەندیکردن: ٠٧٥٠ ١٢١ ٤٧ ٧٣

پەیجی نوسەر: andaziar osman

لەبەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان

ژمارە سپاردنی ( )ـی سالی (٢٠١٨)ـی پێدراوە..

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ وَقُلِ ٱعْمَلُوا۟ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۖ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ١٠٥ ﴾ التوبة: ١٠٥

## پێشەکی:

سوپاس وستایشی بێپایان بۆخواو درروودوسلاویش لەسەرگیانی سەرداری پێغەمبەران و یارو یاوەران. سوپاس بۆخوا بەدرێژایی ٤٥ ساڵ کارکرکردنم لەبواری بانگەوازدا هەمیشە جەختم کردۆتە سەر پەروەردەی ئیمانی، لەهەموو نووسراوەکانمدا و لەوتارەکانمدا گرنگی دان بەو بوارە بەئاشکرا دیارە، هەمیشە وتوومە کە خۆزگە بانگخوازان و وتاربێژان گرنگی تەواویان بدایە بەم لایەنەو خەڵکیان فێری خواناسی راستەقینە بکردایە، کەئەمەش بەوە ئەبێت وتارەکانیان تایبەت بکەن بە زانستی بێپایانی خواو ئاگالێبوونی خوا، تاخۆیان وخەڵکیش بگەنە پلەی ئیحسان کە هەست بکەن خوا ئەبینن، جائەگەر ناتوانن خوا ببینن خۆ خوا ئەمان ئەبینێ..

بۆئەمەش ئەم پەڕاوەم تایبەت کرد بەو باسە، زۆر ئایەت و فەرموودەو نموونەم هێناوە، کە هەندێکی لەپەڕاوەکانی پێشوومدا باسمکردوون و هەرچیەکی تازەشم لابوو بۆم زیادکردووە، بەوهیوایەی کە سوودی هەبێت بۆ تازەکردنەوەی ئیمانمان، ئەوەتا قورئان داوا لەبڕواداران ئەکات ئیمانیان تازەبکەنەوەوئەفەرموێت: ئەی بڕواداران بڕوا بهێنن ((يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ عَلَى رَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي أَنْزَلَ مِنْ قَبْلُ **النساء: ١٣٦-١٣٧**))،چونکە ئیمان لاواز ئەبێت و پێویستی بە تازەکردنەوەیە خۆشەویستمان دروودی خوای لەسەر ئەفەرموێت: ( جدِّدوا إيمانكم قيل يا رسولَ اللهِ وكيف نُجدِّدُ إيمانَنا قال أكثِروا من قولِ لا إلهَ إلَّا اللهُ ). جابەڕاستی بڕوادار جاری واهەیە تووشی ئیزدیواجیەت و غافڵبوون ئەبێ،بۆیە وەك حەسەنی بەصری ئەڵێت:ئیستیغفارەکەمان پێویستی بە ئیستیغفارە..

## لەنزیک نزیکتر:

خوای گەورە لەنزیك نزیکترە لێمان و ئەوەی بەخەیاڵمانا دێت ئاگای لێیەتی و، ئەوەی لەهەموو تەمەنمانا ئەیکەین پێش ئەوەی بیکەین ئەزانێ ئەیکەین، واتە بۆخوا ئێستاو رابردوو داهاتوو نیە..عالیمی غەیب و شەهادەیە..

- ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴾ البقرة: ١٨٦.

کاتێ بەندەکانم لە بارەی منەوە پرسیاریان کرد لەتۆ و گوتیان: خودا دوورە یان نیزیك؟ بلێ:) قەتعەن من نیزیکم (نیزیکتر لە رەگی گەردن) جوابی دوعای دۆعاکەر دەدەمەوە ( و نیازی جێبەجێ دەکەم) جا ئەوانیش لە فەرمانی من دەرنەچن و دەعوەتی من ببیستن و جوابی من بدەنەوەو بە من ئیمان بێنن (و بڕوای تەواویان بە من بێ) تا ئەوان بکەونە سەر راستەڕێ.

- ﴿إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُجِيبٌ﴾ هود:٦١. بەڕاستی پەروەرندەی من نزیکەو وەڵامیش ئەداتەوە.

- ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي أَنْفُسِكُمْ فَاحْذَرُوهُ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ البقرة: ٢٣٥. بزانن کەخوا دەزانێ چی لەدڵ ودەرونتانایە، لەخوابترسن وبزانن کەخوا لەگوناە دەبورێ و لەسەرخۆیە.

- ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ﴾ ق:١٦. دیارە ئێمە مرۆڤمان بەدیهێناوەو ئەشزانین چ خەیاڵاتێ بەدڵیا دێ، وەئێمە بۆ ئەو لەشادەماری لاملی نزیکترین.

جا لەبەرئەوەی خوا ئەوەندە نزیکە لێمان و (یا) ی بانگکردنیش لەزمانی عەرەبیدا بۆکەسێکە لەدوورەوە بانگی بکەین، بۆیە لەهەموو قورئاندا دوعاکان (یا)ی نیدائی لەگەڵ نەهاتووە.

- ﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ﴾ آلعمران: ٨.

- ﴿ رَبِّ هَبْ لِي حُكْمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ﴾ الشعراء: ٨٣.

بەڕاستی تێگەیشتن لەم راستیەو رەنگدانەوەی لەژیانمانا زۆر پێویستە.

## بۆ بانگخوازانمان:

هەرچەند لەبارەی زانست و ئاگالێبوونی خواوە قسەبکەن کەمە، گەشتێکی خێرا بەقورئان و فەرموودەدا ئەو راستیەمان بۆ ئەسەلمێنێت، موسڵمانان لەوەدا لێیان قەوماوە، هەموو لەئیمان و ئیسلامدا ئەخولێنەوەو کەمی هەنگاو ئەنێت بەرەو ئیحسان و، کەمی هەیە گەیشتبێتە ئەوەی کە خواپەرستی بکات و واهەست بکات خواوەند ئەبینیێ خۆئەگەر ئەمیش نەیبینێت ئەو ئەم ئەبینێت، من وتاربێژبوومایە یەك ساڵ(٤٨ وتار) باسی ئەو مەسەلەیەم دەکرد.

مامۆستا عبدالخالقی روناکی وتی: ساڵی ٢٠٠٣ لەعومرەبووم، لەمەدینە هات بەخەیاڵمدا بگەڕێم نەوەیەکی هاوەڵان بدۆزمەوە کەخۆشەویست دوعای بۆکردون کەخوا رەحم بەخۆیان وچەند پشتیشیان بکات، بەداخەوە زۆر پرسیارم کرد کەسم نەدۆزیەوە.

کەهاتینە مەککە باسەکەم بیرچۆوە، سەرقاڵی عەمرەکاران بووم، پیاوێکی باریکەلە لەدوورەوە هات و بەدەم ڕێوە ئەیووت: خوایە بەشایەت بە من موسڵمانانم هەموو خۆش دەوێت، لەناو هەموویاندا هات باوەشی کرد بەمنداو وتی: من نەوەی عەبدوڵای کوڕی مەسعودم ودوو خێزانم هەیە وحەزدەکەم لەماڵەوە لەخزمەتتا بم. منیش سوپاسم کردو وتم: سەرقاڵی عەمرەکارانم ماڵت ئاوابێت،ئیتر ڕۆیشت. دواتر کە لەدەرگای حەرەمیش چوومە دەرەوە بینیمەوە و

بەهەمان دەستوور باوەشی پیاکردم و وتی: من نەوەی عەبدولای کوڕی مەسعودمو حەزدەکەم لەخزمەتتا بم، سوپاسم کرد، کەڕۆیشت بیرم کەوتەوە کەخوا لەسەرنیەتی خۆم بۆی ناردوم تانەوەی هاوەڵان ببینم، بەداخەوە ئەو فرسەتەم لەدەستچوو کەنانی ماڵی نەوەیەکی هاوەڵان بخۆم.

قورئان ئەفەرموێت: ئاگاداربن، خۆتان بپارێزن، بزانن کەخوا چی لە نەفستانایە ئاگای لێیە... ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي أَنْفُسِكُمْ فَاحْذَرُوهُ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ البقرة: ٢٣٥.

## گەیشتویتە پلەی ئیحسان؟

زۆربەی موسڵمانان لە ئیمان و ئیسلامەتیدا وەستاون و هەوڵنادەن بگەنە پلەی ئیحسان، کەبریتیە لەوەی کەهەست بکەی خوا دەبینی، خۆئەگەر تۆ ئەو نەبینی ئەوتۆ ئەبینێت.

قورئانی پیرۆزو فەرموودە زۆرجەخت ئەکەنە سەرئەوەی کە خوا ئەبینێت و ئەبیستێت، ئەوەتا هانی بڕواداران ئەدات کاربکەن وخوا دەیانبینێت ﴿ وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ وَسَتُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ التوبة: ١٠٥.

جا کەبڕوادار لەوە حاڵی بوو کە خوا دەیبینێ و هەموو هێزو تواناوجوڵەیەکیش لەخواوەیە (لاحول ولا قوه الا بالله)، ئەوسا زیاتر کاردەکات وکاریگەری دەبێت و چاونەترس ئەبێت.

رۆژێك پیاوێکی جل سپی کە ناسەواری سەفەری پێوەدیارنەبوو، هاتە مەجلیسی خۆشەویستەوە دروودی خوای لەسەرو پرسیاری ئیمان و ئیسلام و ئیحسان و نیشانەکانی قیامەتی لێکردو هەروەڵامێکیشی ئەدایەوە پشت راستی

نەکردەوەو، ئەیووت: ڕاست ئەکەیت.. هاوەڵان لایان سەیر بوو باشە کەئەیزانێت و تەسدیقی وەڵامەکانی خۆشەویست ئەکات (دروودی خوای لەسەر)ئەی بۆ پرسیار ئەکات.. ئیتر پاش ئەوەی ڕۆیشت خۆشەویست فەرمووی: ئەوە جوبرائیل بوو هاتبوو بەو پرسیارکردنە ئاینەکتان فێربکات.

## چەند فەرموودەیەکی خۆشەویست لەباسی ئیحساندا:

پیاوباشان ئەڵێن لەخوابترسە بەهێندەی ئەوەی کە توانای هەیە بەسەرتدا، شەرمی لێبکە بەهێندەی نزیکی لێتەوە، هەرچی کاربۆخوابکات وەك ئەوەی خوا ببینێت ئەوە عاریفە، هەرچیش کاربکات و بزانێت خوا ئەو ئەبینێت ئەوە موخلیصە، خۆشەویستیش دروودی خوای لەسەر ئەفەرموێت:

– **افضل الإيمان أن تعلم ان الله معك حيثما كنت**.. (الطبراني وابو نعيم في الحلية عن عبادة بن الصامت) واتە: باشترین ئیمان ئەوەیە کەبزانیت لەهەرکوێ بیت خوات لەگەڵدایە.

– پرسیارکرا لەخۆشەویست دروودی خوای لەسەر:چۆن مرۆۋ دەروونی خۆی پاکبکاتەوە؟ **ما تزكية المرء نفسه؟ . . فقال: يعلم أن الله معه حيث كان**.( رواه البيهقي في السنن الكبرى من طريق الزبيدي عن يحيى بن جابر) واتە: تەزکیەی نەفس بەوە ئەبێت کەبزانێت لەهەرکوێ بێت خوای لەگەڵدایە.

– وە لەپێناسەی ئیحساندا ئەفەرموێت:...**أَنْ تَعْبُدَ اللّٰهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ**... مسلم.

– هەروەها دەفەرموێت:

**ثلاثة في ظل الله تعالى يوم القيامة، يوم لا ظل إلا ظله، رجل حيث توجه علم أن الله معه**.. الطبراني عن ابي امامة.. سێ کۆمەڵ لەژێر سێبەری خوادان

لەقیامەتدا، یەکێکیان ئەوکەسەیە کە بۆهەرکوێیەك بچێت بزانێت خوای لەگەڵدایە..

## قەدری خوا بزانە

قورئانی پیرۆز زۆر جەخت دەکاتە سەر ناسینی خواو تێگەیشتن لەدەستی قودرەتی، تاوەکو خەڵکی لەخوای گەورە بترسن و قەدری خواو فەرمانەکانی بزانن و دەفەرموێت:

**یەکەم:** ﴿ **وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ**﴾ الزمر:٦٧. واتە: ( ڕێز و قەدری خوایان نەگرتووە بەو ڕێز و قەدرەی شایەنی ئەوبێت، نەیانناسیوە بەوناسینەی لایەقی ئەو بێت و، کەمتەر خەمن بەرامبەر ئەو خوایەی کە هەموو زەوی لەڕۆژی دواییدا وا لەچنگی قودرەتیدا و ئاسمانەکانیش بەتوانا و قودرەتی دەپێچرێنەوە و لادەبرێن، وەخوا پاك و بێگەردە لەهەموو کەم و کوڕیەك، بەرزوبڵندە لەوەی هاوبەشی بۆ بڕیاربدەن ).

لەفەرموودەشدا هاتووە کە خۆشەویست درروودی خوای لەسەر دەفەرموێ:

﴿ **يَقبضُ اللهُ تعالى الارض ويَطوي السماءَ بيَمينه، ثم يقول: انا الله اينَ ملوكُ الارض**﴾ بوخاری و موسلیم، گێڕاویانەتەوە، واتە: ( خوای گەورە زەوی لەچنگی قودرەتیدا دەبێت و، ئاسمانەکانیش دەپێچێتەوە و دەفەرموێت: من خوام کوان پادشایانی سەر زەوی؟! ).

یان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ **لِمَنِ الْمُلْكُ الْيَوْمَ لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ**﴾ غافر:١٦. واتە: (موڵك ئەمڕۆ بۆ کێیە؟ بێگومان بۆ خوای تاكو تەنهای زاڵو بەدەسەڵاتە).

دووەم: ﴿مَا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا (١٣) وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا (١٤) أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا (١٥) وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجًا (١٦) وَاللَّهُ أَنْبَتَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ نَبَاتًا (١٧) ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا (١٨) وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ بِسَاطًا (١٩) لِتَسْلُكُوا مِنْهَا سُبُلًا فِجَاجًا﴾ نوح: ٢٠.

واتە: ( بۆچی لەخوا ناترسن‌و قەدری خوا نازانن؟، لەکاتێکدا کە بەچەند قۆناغ‌و پلە دروستی کردوون، ئایا نابینن کە خوا چۆن حەوت ئاسمانی یەك لەسەر یەکی دروستکردووە؟، مانگی گێڕاوە لەناویاندا بە رووناك‌و خۆری گێڕاوە بە چرا!، وە ئێوەی رواندووە لە زەوی بە رواندن، پاشان دەتانباتەوە ناوی‌و دەرتان دەهێنێتەوە لێی بەدەرهێنان، خوا زەوی بۆ راخستوون، تا هاتووچۆ بکەن بە رێگە کراوەکانیدا)...

سێیەم: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَاسْتَمِعُوا لَهُ إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ لَنْ يَخْلُقُوا ذُبَابًا وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ وَإِنْ يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئًا لَا يَسْتَنْقِذُوهُ مِنْهُ ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ (٧٣) مَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾ الحج:٧٤. واتە: ( ئەی گرۆی ئادەمی، نموونەیەك هێنراوەتەوەو باس کراوە، باش گوێی بۆ بگرن‌و دڵی بدەنێ، بەڕاستی ئەوانەی ئێوە بانگ‌و هاواریان لێدەکەن‌و دەیانپەرستن لە جیاتی خوا، هەموو ئەوانە ناتوانن تاقە مێشێك دروست بکەن، ئەگەر هەموویان کۆ ببنەوەو هاوکاری یەکتریش بکەن، چونکە (گیان)ی دەوێت‌و گیانیش شتێکە هەموو دروستکراوەکانی خوا لە ئاستیدا دەستەپاچەو بێدەسەلاتن، وە کەس نازانێ (گیان) چیەو لە چی پێك هاتووە.

قورئان مێشی بۆیە کردە نموونە، چونکە دەستە پاچەیی لە ئاستی مێشێکدا باشتر بێهێزیو زەبوونی دەردەخات.

جا ئەگەر مێش شتێکیان لێ بسێنێو بیبات بەهەموویان ناتوانن لێی بسێننەوە، داواکەر کە بتپەرستو هاوەڵ پەیداکەرانەو، داوالێکراو کە بتەکانن (یان هەر شتێك کە بێجگە لە خوا بپەرسترێ) لاوازو بێدەسەڵاتو زەبوونن.

ئینجا قورئان دەفەرموێت: (ما قَدَرُوا اللهَ حَقَّ قَدرِهِ)، خوایان نەناسی بە ناسینێك کە شایستەی ئەوە، ئەوەتا هاوبەشو هاوەڵی بێدەسەڵاتیان بۆ بڕیار داوەو قەدرو ڕێزی خوایان نەگرتووە بەو جۆرەی کە لایەق بەوە... بەڕاستی خوا بەهێزو زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا...

**چوارەم: ﴿ وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِذْ قَالُوا مَا أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى بَشَرٍ مِنْ شَيْءٍ قُلْ مَنْ أَنْزَلَ الْكِتَابَ الَّذِي جَاءَ بِهِ مُوسَى نُورًا وَهُدًى لِلنَّاسِ تَجْعَلُونَهُ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا وَعُلِّمْتُمْ مَا لَمْ تَعْلَمُوا أَنْتُمْ وَلَا آبَاؤُكُمْ قُلِ اللَّهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ (٩١) وَهَذَا كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ مُصَدِّقُ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَلِتُنْذِرَ أُمَّ الْقُرَى وَمَنْ حَوْلَهَا وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ يُؤْمِنُونَ بِهِ وَهُمْ عَلَى صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴾ الأنعام: ٩١-٩٢.**

واتە: ئەوانە خوایان نەناسیوە بەچاکی، وە قەدری خوایان نەزانیوە قەدرزانینێکی تەواو، لەکاتێکدا کە دەیانوت: خوا هیچ شتێکی نەهێناوەتە خوارەوە بۆ سەر هیچ ئادەمیەك، پێیان بڵێ: ئایا کێ ئەو نامەیەی ناردووە کە مووسا هێنای، کە ئەو نامەیە روناکیو ڕێنمایی مەردمان بوو.. ئەو بەرنامەیە کە ئێوە ـ واتە جوولەکەکان ـ بەش بەشتان دەکردو هەندێکتان دەردەخستو زۆریشتان دەشاردەوە... جا ئێوە شتی وا فێرکران کە نە خۆتانو نە باوو باپیرتان نەتاندەزانی...

پێیان بڵێ (ئەی محەممەد) ئەو کەسەی ئەو بەرنامەیەی نارد بۆ مووسا خوابوو، ئنجا لێیان گەڕێ لەناو ناهەقی و نەفامیەکەیاندا با گەمەو گاڵتە بکەن (واتە تۆ بەرپرسیار نیت لێیان)، وە ئەم قورئانەش کە ئێمە ناردوومانەتە خوارەوە، پیرۆزو پڕ فەرو بەرەکەتە، وە داندەنێ بەڕاستی پەڕاوەکەی پێش خۆیدا... وە هەروەها تاوەکو مەککەو دەوروبەری بترسێنێ لە سزای سەختی خوا... ئەوانەش کە بڕوایان بە دوارۆژە بڕوای پێدێنن، وە ئەوانە پارێزگاری لە نوێژەکانیان دەکەن...

جا کە مرۆڤ قەدری خوای زانی و لە مەقامی گەورەو بەرزی خوا تێگەیشت، جڵەوی نەفسی خۆی دەگرێتو بەوەش سەرفراز دەبێت ﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى (٤٠) فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى﴾ النازعات: ٤١.

پیاو باشێك دەڵێت (سەیری بچووکی گوناە مەکە، سەیری گەورەیی ئەو خوایە بکە کە لێی یاخی دەبیت)..

## چی لەخوا تێگەیشتووی؟؟

قورئان کە بۆپەروەردەو راستکردنەوەی مرۆڤ هاتووە زۆرکار لەسەر ئەوەدەکات کەخوا دەمانبینێ ولەقیامەتدا لێپرسینەوە دەکات. بۆنموونە:

- ﴿ قُلْ أَرَأَيْتُمْ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ لَكُمْ مِنْ رِزْقٍ فَجَعَلْتُمْ مِنْهُ حَرَامًا وَحَلَالًا قُلْ آللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى اللَّهِ تَفْتَرُونَ﴾ یونس: ٥٩..

بڵێ: پێم بڵێن بزانم ئەو رزق و رۆزیەی خودا بۆی خوڵقاندوونە و بۆی وەدیهێناون و ئێوە هێندێك لە وانە بەحەرام دەزانن و هێندێکیشیان بەحەڵاڵ دەزانن، جا خودا ئیزنی داون (کە ئاوا بکەن) یان بەدەمی خواوە درۆ هەڵدەبەستن.

- ﴿ وَمَا ظَنُّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّ اللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ ﴾ يونس: ٦٠..

ئەو کەسانەی بە دەمی خواوە درۆ هەڵدەبەستن، گومانیان ڕۆژی قیامەت دەبێ چۆن بێ؟ (وە سەبارەت بە حاڵ و ئاکامی خۆیان لە قیامەتدا دەبێ چۆن بیربکەنەوە؟) بێگومان خودا دەرحەق بە خەڵك خاوەن لوتف و کەرەمە، هەرچەند زۆربەی ئەوان شوکرانەبژێر نین.

- ﴿وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُو مِنْهُ مِنْ قُرْآنٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ وَمَا يَعْزُبُ عَنْ رَبِّكَ مِنْ مِثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَلَا أَصْغَرَ مِنْ ذَلِكَ وَلَا أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ ﴾ يونس: ٦١.

(ئەی پێغەمبەر) تۆ هیچ کارێك ناکەی و هیچ بەشێك لە قورئان ناخوێنیەوە، وە (ئێوە ئەی موسڵمانان) هیچ کارێك ناکەن، مەگین کە ئێمە لەسەرتان حازرین (و بارودۆخی ئاکاری ئێوە دەبینین و لە ڕەفتارتان ئاگادارین) هەر ئەوکات و ساتەی دەستی پێدەکەن و سەرگەرمی دەبن. وە هیچ شتێك بە ئەندازەی تۆز و خۆڵێك بێ، وە چکۆڵەتر لە ئەوە یان گەورەتر لە ئەوە، لە زەویدا بێ، یان لە ئاسماندا بێ، لە پەروەردگاری تۆ ون و نادیار نابێ. وە لە کتێبی ئاشکرا و دیارێك (بە نێوی لەوحی مەحفووز) سەبت و زەبت دەکرێ.

## بۆ نازانیٚ خوا دەیبینیٚ!

قورئان هەر لەسەرەتای دابەزینیەوە گرنگی زۆری داوە بەوەی کە خوا دەبینیٚو دەبیسیٚ و زانایەو مسقاڵە زەڕەی لێون نابێت، کەئەمەش ئەگەر بەڕاستی لەدلا دامەزرێت مرۆڤ شەرم دەکا لەخواو توخنی خراپە ناکەوێت: بۆنموونە سورەتی (عەلەق ) زۆر زوو دابەزی کەدەفەرموێت:

﴿ أَرَأَيْتَ الَّذِي يَنْهَى..﴾ ئایا ئەو کەسە دەبینی کە خەلکی لە چاکە دەگێڕێتەوە؟

﴿ عَبْدًا إِذَا صَلَّى..﴾ (بەرگری دەکا) لە بەندەیەك کات و ساتێ نوێژێ دەکا؟

﴿ أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ عَلَى الْهُدَى..﴾ پێم بلێ: ئەگەر ئەو تاغیە رێگای هیدایەت و رێنوێنی گرتبا (چۆن پلەوپایە و مەقام و مەنزیلەتێکی لە پێشگای خودا دەبوو؟).

﴿ أَوْ أَمَرَ بِالتَّقْوَى..﴾ یان ئەگەر (لە جیاتی بەرگری خەلکی لە نوێژ و عیبادەتی دیکە) فەرمانی بە پارێزگاری دابا (ئایا ئەوە بۆی باشتر نەبوو؟).

﴿ أَرَأَيْتَ إِنْ كَذَّبَ وَتَوَلَّى..﴾ پێم بلێ: ئەگەر هەق وراستی بە درۆ بزانێ و پشت بکاتە ئیمان و تەواوی ئاکارانی باش، لە قیامەتدا حالّی چۆن دەبێ؟ ئەوەندەی بەسە ئاگری جەهەندەمی تێ بەربێ!.

﴿ أَلَمْ يَعْلَمْ بِأَنَّ اللَّهَ يَرَى..﴾ ئایانەیزانیوە کە خودا هەموو حالّو ئەحوالّی ئەو دەبینێ؟

﴿ كَلَّا لَئِنْ لَمْ يَنْتَهِ لَنَسْفَعَنْ بِالنَّاصِيَةِ..﴾ هەرگیزا وهەرگیز (وانییە کە ئەو خەیالّ دەکا). ئەگەر ئەو وازنەهێنێ، کاکۆلّ و قژی نێوچاوانی دەگرین و کێشی دەکەین بەرەو جەهەننەم.

﴿ نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ..﴾ نێوچاوانی درۆزنی بەهەلّەچووی تاوانبار.

﴿ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ..﴾ جا با هاومەجلیسان و هاونشینانی خۆی بانگ بکا و بۆ یارمەتی (تا لە جەنگ و شەڕی ئەوان لەگەلّ موسلّمانان کۆمەکی بکەن).

﴿ سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ..﴾ ئێمەش هەرچی زووتر کاربەدەستانی دۆزەخ بانگ دەکەین تا ئەوی ببەنە جەهەندەمێ.

﴿ كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَاسْجُدْ وَاقْتَرِبْ..﴾ هەرگیزاو هەرگیز بە گوێی ئەو مەکە، وە (بە نوێژکردنی خۆت درێژە بدە و لە بەرابەری خولقێنەری خۆتدا) کڕنوش بیە و( لە پەروەردگاری خۆت) نیزیك بەوە.

جا هەستکردن بەوەی کەخوا ئەتبینێ پلەی ئیحسانە کەپێویستە هەموو هەوڵ بدەین بیگەینێ تاشەرم بکەین لەخوا، خۆشەویستمان درووودی خوای لەسەر ئەفەرموێت:ئەوەی پێغەمبەران جەختیان کردۆتە سەرو ماوەتەوە بۆ خەلکی ئەوەیە: ئەگەر شەرم لەخواناکەی ئەوا چیدەکەیت بیکە.. (إن مما ادركَ الناسُ مِن كلامِ النُّبُوَّةِ الأولى، إذا لم تَستَحِ فافعَلْ ما شِئْتَ.) صحيح الالباني.

## زانینی خوا بێ کۆتاییە:

زانینی خوای گەورە بێکۆتاییەو، قورئانی پیرۆز بۆ ئەوەی لە مێشکی مرۆڤی نزیك بکاتەوە، بە وشە تابلۆیەك دەنەخشێنێ، کەبیری لێدەکەیتەوە هەر دەبێتەوە بە ناکۆتایی، بۆ نموونە دەفەرموێت:

**یەکەم:** ﴿ قُلْ إِنِّي عَلَى بَيِّنَةٍ مِنْ رَبِّي وَكَذَّبْتُمْ بِهِ مَا عِندِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِ إِنْ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلَّهِ يَقُصُّ الْحَقَّ وَهُوَ خَيْرُ الْفَاصِلِينَ (٥٧) قُلْ لَوْ أَنَّ عِندِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِ لَقُضِيَ الأَمْرُ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِالظَّالِمِينَ (٥٨) وَعِنْدَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ هُوَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَا تَسْقُطُ مِنْ وَرَقَةٍ إِلاَّ يَعْلَمُهَا وَلاَ حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الأَرْضِ وَلاَ رَطْبٍ وَلاَ يَابِسٍ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُبِينٍ (٥٩)﴾ الأنعام.

واتە: پێیان بڵێ: من زۆر دڵنیام و، بە بەڵگەوە پەروەردگارم دەناسم و دەیپەرستم، کەچی ئێوە باوەڕتان پێی نیە، ئەوەی ئێوە پەلەتانە بۆتان پێش بێت لە تۆڵە و سزای خوایی بەدەست من نیە و لای من نیە، حوکم و فەرمانڕەوایی

هەمووشت هەر بەدەست خوایە، ئەو زاتە راستییەکان دەخاتەڕوو، چاکترین جیاکەرەوەشە لە نێوان هەق و ناهەقدا..

پێیان بڵێ: ئەگەر بەراستی ئەوەی ئێوە پەلەتانە لە پێشهاتنی سزای خوایی بەدەست من بوایە، ئەوکاتە هەمووشت لە نێوانماندا کۆتایی دەهات و لەناودەچوون، خواش هەمیشە زاناترە بەستەمکاران.

ئنجا دەیەوێ باسی زانینی بێکۆتایی پەروەردگار بکات تا بڕوادار دڵنیا بێت لەدانایی و کاردروستیەکەی و دەفەرموێ: کلیلی هەموو شاراوەکان و زانینی هەموو نهێنیەکان بەدەست خوایە و هەر لای ئەوە، کەس نایزانێت جگە لەو زاتە، هەرچی لەسەر وشکانیە لە گیاندار و بێگیان و زیندەوەرانی وردو درشت لە سەر زەوی و لەناو خاکدا خوا پێی دەزانێت، هەروەها هەرچی لە دەریاکانیشدا هەیە ئاگای لێیەتی و هیچ گەڵایەك ناکەوێتە خوارەوە خوا پێی نەزانێت، هەروەها دەنکێك یان تۆوێك لەتاریکاییەکانی زەویدا نیە و، هەروەها هیچ تەڕو وشکێك نیە لەخوا پەنهان بێت و لە (لوح المحفوظ) دا، یاخود لە دۆسیەو پەڕاوی تایبەتدا تۆمار نەکرابێت.

**دووەم:** ﴿قُلْ لَوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَادًا لِكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَنْ تَنفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَدًا﴾ الكهف: ١٠٩. واتە: پێیان بڵێ ئەگەر دەریا هەموو مەرەکەب بێت و زانست و زانیاری پەروەردگارمی پێ بنوسرایە، دەریا تەواو دەبوو پێش ئەوەی زانست و زانیاری پەروەردگارم تەواو ببێت، ئەگەر چەندەها ئەوەندەی تر دەریاش بهێنن و بیکەنە مەرەکەب زانیاری ئەو تەواو نابێت، چونکە زانست و زانیاری پەروەردگار کۆتایی نایەو بێ سنورە..

سێیەم: ﴿ وَلَوْ أَنَّمَا فِي الأَرْضِ مِنْ شَجَرَةٍ أَقْلامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِنْ بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللهِ إِنَّ اللهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ لقمان: ٢٧، واتە: ئەگەر هەرچی درەخت هەیە لەزەویدا ببنە پێنوس، دەریاش چەندەیە ببێتە حەوت ئەوەندەو ببێتە مەرەکەب و زانست و نهێنی دروستکراوەکانی خوا بنووسنەوە، ئەوە هێشتا زانست و زانیاری خوا تەواو نابێت، بە راستی خوای گەورە بەدەسەڵات و دانایە.

وردبەرەوە لەم ئایەتە: ئەڵێن نزیکەی سێ ترلیۆن درەخت هەیە لەسەر زەوی، باشە ئەم سێ ترلیۆن درەختە بکرێنە قەڵەم ئاخۆ ببێتە چەند؟ دیارە لەژماردن نایەت!!، جا بەو قەڵەمانە نەك دەریایەك بەڵکوحەوت دەریاش ببنە مەرەکەب و هەرچی بەنی ئادەمە خەریکی نووسینەوەی زانستی خوابن تەواو نابێت، کەواتە زانستی خوا بێکۆتاییە..

بەڕاستی هەقە دڵمان خۆش بێت بەوەی کە خوایەکی ئاوا زاناوکاردروست ومیهرەبانمان هەیە و پێویستە باشتر لەناوو سیفەتە بەرزەکانی شارەزابین، ئەوەتا بێکەسی شاعیر لە چەند لەحزەیەکی سەفادا هەست بەمە ئەکات و ئەڵێت:

مەڵێن بێکەس بێکەسە بێکەس

بێکەس تۆی هەیە ئەی تۆ کێت هەیە بێکەس

## ئەو کەسەی کەسە:

مەحوی گلەیی لەحاڵی خۆی دەکات ودەڵێت:نەئەو کەسە بووم کەس لام بێ بەکەس، نەدەستم گەیشتە ئەو کەسەی ئەو من بکات بەکەس!

ئەوکەسە ئەبێت چ کەسێك بێت؟؟

کورد دەڵێت: ئەو کەسە کەسە ئەلفێکی بەسە!

ئەو ئەلفە کامەیە کەئەمان کات بەکەس؟

دەشتەکیەك هاتە خزمەت خۆشەویست وتی: ئامۆژگاریەکی کورتم بکە! ئەویش فەرمووی: ﴿ فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ (٧) وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ (٨)﴾ الزلزلة.

کابرا وتی: بەسمە! هاوەڵان وتیان: وەرە چیت بەسە جاریێ لەکوێتە؟ خۆشەویست دروودی خوای لەسەر فەرمووی: وازی لێبێنن تێگەیشت بەسیەتی..

ئەو دەشتەکیە دەستی گەیشتە ئەوکەسەی کردی بەکەس و ئەلفێکی بەس بوو، کە ئەویش ئەوەیە( خوا ئەتبینیێ و مسقاڵەزەرەیەکی کردەوەکان بەرپرسیاری بەرامبەری.کەواتەشەرم بکە لەوخوایەی ئەتبینیێ کەهەموو پێغەمبەرانیش سەلامی خوایان لێبێت بۆئەوەهاتوون: ئەگەرشەرم ناکەیت لەخوا برۆ چی دەکەیت بیکە)!

## بزانن کەخوا ئەبیستێ و ئەبینێ وزاناو ئاگادارە:

سەیری ئەم چەند ئایەتە بکەن لەسەرتەڵاق ومردنی مێردو عیددەیە،جا لەبەرئەوەی زۆرجار ستەمی تیائەکرێت بەرامبەر بەئافرەتان چۆن لەکۆتایی ئایەتەکاندا جەخت ئەکاتەوە سەر ئاگالێبوونی خوا و پارێزکاری:

﴿ وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِتَعْتَدُوا وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ وَلَا تَتَّخِذُوا آيَاتِ اللَّهِ هُزُوًا وَاذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمَا أَنْزَلَ عَلَيْكُمْ مِنَ الْكِتَابِ وَالْحِكْمَةِ يَعِظُكُمْ بِهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ (٢٣١) وە کاتێ ژنانتان تەڵاقدا و گەییشتن بە ئاخر و ئۆخری ماوەی (عیددەی) خۆیان، جا یا ئەوان بە شێوەی باش و چاك بهێننەوە یان بە شێوەی باشو چاك دەست بەرداریان بن. وە بۆ زەرەر و زیان گەیاندن و زوڵم و زۆر کردن، ئەوان (مەهێننەوە و) رامەگرن. کەسێك ئاوا بکا و ستەم بەو جۆرە لە ژن بکا لە خۆی زوڵم دەکا.

ئایەتەکانی خودا بە گاڵتە مەگرن. وە نیعمەتی خودا کە پێی داون یادکەن وئەوەی خودا لە کتێب و حیکمەت ناردوویەتە خوارێ و ئێوە بە ئەو (کتێب و حیکمەتە) ئامۆژگاری دەکا. وە لە خودا بترسێن و بزانن بێگومان خودا ئاگاداری هەموو شتێکە.

﴿ وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَنْ يَنْكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ إِذَا تَرَاضَوْا بَيْنَهُمْ بِالْمَعْرُوفِ ذَلِكَ يُوعَظُ بِهِ مَنْ كَانَ مِنْكُمْ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَلِكُمْ أَزْكَى لَكُمْ وَأَطْهَرُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ (٢٣٢) ﴾

وە کاتێ ژنەکانتان تەڵاق دا و گەییشتن بە دوایین ماوەی عیددەیان بەرهەڵستیان و مەنعیان مەکەن لەوە کە شوو بکەنەوە بە مێردەکانیان (یا بە کەسانێکی دیکە) ئەگەر بە چاکی و باشی لە یەك رازی بن و لەگەڵ یەك رێکەون. ئەوە شتێکە کە ئامۆژگاری کەسێك لە ئێوەی دەکرێ کە ئیمانی بە خودا و بە رۆژی قیامەت هەبێ. ئەو (یاسایە) بۆ ئێوە بەسوودتر و پاکترە (لە تاوانی رێگرتن لە شووکردنی ژنان). وە خودا دەزانێ (سوودی دونیا و ئاخیرەتی ئێوە لە چیدایە) و ئێوە نازانن.

﴿ وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا لَا تُضَارَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوْلُودٌ لَهُ بِوَلَدِهِ وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَنْ تَرَاضٍ مِنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا وَإِنْ أَرَدْتُمْ أَنْ تَسْتَرْضِعُوا أَوْلَادَكُمْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُمْ مَا آتَيْتُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (٢٣٣) ﴾

دایکان دەبێ دوو ساڵی رەبەق بە منداڵانیان شیر بدەن، ئەوە بۆ کەسێکە بیەوێ شیری تەواو بدات. لەسەر ئەو کەسەی منداڵەکانی بۆ هاتۆتە دنیا (کە

باوکە، لەو ماوەیەدا) بژێوی دایکان و جل و بەرگی ئەوان بە باشی و چاکی لەسەری واجبە. هیچ کەسێك زیاتر لە توانای خۆی داوای لێناکرێ. زەرەرو زیان نابێ بە باب بگەیەندرێ بە هۆی منالەکەیەوە (دیتنی مندالەکە حەقی هەردووکیانە. باب دەبێ دادگەرانە خەرجی بدا، دایکیش دەبێ بە جوانی بە مندالەکە شیر بدا. ئەگەر بابەکە بمرێ، یا لەبەر هەژاری نەتوانێ خەرجی بدا) لەسەر میراتگر وێنەی ئەوە (ئەوەی لەسەر باب بوو لەسەر ئەوە). وە ئەگەر (باوکی مندال و دایکەکەی پێش تەواوبوونی دوو سال) بە رەزامەندی و راوێژی هەردووکیان ویستیان مندالەکە لە شیر ببڕنەوە، هیچ گوناهیان ناگاتێ. وە ئەگەر ویستتان کە دایەن بگرن بۆ مندالەکانتان هیچ گوناهتان لەسەر نییە، بەو مەرجە ئەوەی بۆتان داناون بە باشی وچاکی بیاندەنێ. وە لە خودا بترسێن و بزانن بێگومان خودا ئەوەی دەیکەن دەیبینێ.

﴿ وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنْكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنْفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِي أَنْفُسِهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ (٢٣٤)﴾

وە ئەوانەی لێتان دەمرن و ژنانێك لە پاش خۆیان بەجێدێڵن، ژنەکانیان چوار مانگ و دە رۆژ دەبێ عیددە رابگرن (نابێ شوو بکەن و خۆ برازێننەوەو لە مال وەدەرکەون، مەگەر کارێکی گرنگ بێتە پێش و ناچاری واداریان کا). جا کاتێ گەیشتنە کۆتایی ماوەیان (و ئاخری عیددەیان) گوناهێك لەسەر ئێوە نییە لە بەرابەر کارێکدا کە (چاك و رەوا بێ ئەو مێرد مردووانە) بیکەن (وەکو جلوبەرگ گۆڕین و چوونە مالان و شووکردن و خۆڕازاندنەوە بە پێی باوی کۆمەڵی موسلمانان) بە جوانی و باشی و شێوەی پەسەند. خودا لە هەر کارێك کە دەیکەن تەواو ئاگادارە.

﴿ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُمْ بِهِ مِنْ خِطْبَةِ النِّسَاءِ أَوْ أَكْنَنْتُمْ فِي أَنْفُسِكُمْ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ وَلَكِنْ لَا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّا أَنْ تَقُولُوا قَوْلًا مَعْرُوفًا وَلَا تَعْزِمُوا عُقْدَةَ النِّكَاحِ حَتَّى يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي أَنْفُسِكُمْ فَاحْذَرُوهُ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ (٢٣٥)﴾

وە هیچ گوناهێکتان ناگاتیّ ناڕاستەوخۆ لە ژنانی (مێردمردوو لە عیددەدا) خوازبێن و داواکاری بکەن، یان لە دڵی خۆتان بگرن (و خۆشتان بوێن، بەڵام نەیدرکێنن) خودا دەزانیّ (بەپێی سروشت) یادیان دەکەن (و لە نەزەریان دەگرن) بەڵام نەهێنی و لە ژێرەوە وەعدەو بەڵێنی (خوازبێنی) بە ئەوان مەدەن، تەنیا ئەوە نەبیّ بە جوانی و بە باشی (وکینایە) قسەی چاك و پەسەند بکەن (وەکو: ئەگەر خوا بۆم ڕێکبخات دەمەویّ ئافرەتێکی چاك بخوازم، بەهەرحاڵ) بڕیاری مارەبڕین مەدەن و باسی مارەکردن مەکەن تا ماوەی عیددەی تەواو دەبیّ و بەسەر دەچیّ. بزانن کە خودا دەزانیّ ئێوە چیتان لە دڵو دەرووندایە، جا کەوایە خۆتان لە (تووڕەیی و عەزابی) ئەو بپارێزن (و قەسدی شتی وا مەکەن) وە بزانن بێگومان خودا زۆر بەخشەر و لەسەرخۆیە.

﴿ لَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِنْ طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أَوْ تَفْرِضُوا لَهُنَّ فَرِيضَةً وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدَرُهُ مَتَاعًا بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُحْسِنِينَ (٢٣٦) ﴾

ئەگەر ژنان تەلاق دەن، پێش ئەوەی نیزیکیتان لەگەڵ کردبن، گوناهێکتان ناگاتیّ، (بەڵام وا چاکە یارمەتیەکیان بکەن و شتێکیان بدەنیّ) دەوڵەمەند بە پێی توانای خۆی، وە نەدار بە ئەندازەی توانای خۆی، دیارییەکی شیاو و خواپەسەند بە ئەو ژنانە بە جوانی و قازاخی بدەن، ئەوە مافێکی پێویستە لەسەر چاکەکاران.

﴿ وَإِنْ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ إِلَّا أَنْ يَعْفُونَ أَوْ يَعْفُوَ الَّذِي بِيَدِهِ عُقْدَةُ النِّكَاحِ وَأَنْ تَعْفُوا أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَلَا تَنْسَوُا الْفَضْلَ بَيْنَكُمْ إِنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (٢٣٧) ﴾

وە ئەگەر تەلاقتان دان بەر لەوەی لەگەڵیان نیزیکی بکەنو بخەون، لە حاڵێکدا مارەییشتان بۆ بڕیار داون و بۆتان بڕیونەوە، دەبێ نیوەی مارەیەکەی بۆتان بڕیارداون بیاندەنێ، مەگین خۆیان پێیان ببەخشن (ئەگەر بچووك یان شێتو نەزانن) ئەو کەسە پێتان ببەخشێ کە مارەبڕین بەدەست ئەوە. وە ئەگەر ئێوە (پیاوان تەواوی مارەیەکە بە ژنەکان بدەن و پێیان) ببەخشن لە تەقواو پارێزگاری نیزیکترە. سەرفی نەزەرکردن و لێبوردن و چاکە و چاکەکاری لەنێوان خۆتاندا فەرامۆش مەکەن، بێگومان خودا ئەوەی دەیکەن دەیبینێ.

## خوا ئاگادارەو گوناهی بەندەکانی ئەبینێت:

﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى الْحَيِّ الَّذِي لَا يَمُوتُ وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِ وَكَفَى بِهِ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ خَبِيرًا ﴾ الفرقان: ٥٨.

وە (لە هەمو کاروبارێکدا) پشت بە خودایەك ببەستە کە هەمیشە زیندووە و قەت نامرێ، وە حەمد و سەنای ئەو بەجێ بێنە (و بزانە تۆ بەرپرسی ئیمان هێنان و کافر بوونی خەڵك نیت). وە ئەوە بەسە کە خودا لە گوناهانی بەندەکانی خۆی ئاگادار و خەبەر دار بێ.

﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنَ الْقُرُونِ مِنْ بَعْدِ نُوحٍ وَكَفَى بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ خَبِيرًا بَصِيرًا ﴾ الاسراء: ١٧.

زۆر گەل و نەتەوەشمان پاش نووح لەناوبردووە (بەهۆی سەرکێشی و نافەرمانیانەوە). بەسە پەروەردگاری تۆ لە گوناهانی عەبدانی خۆی ئاگادار و خەبەردار بێ و تاوانیان ببینێ.

جا لەقیامەتدا لەوەی کە کردویانە نکوڵی دەکەن (لەگەڵ ئەوەدا کە هەرچیان کردووە لەچاك وخراپ بەهێندەی مسقاڵە زەرِەش بێت تۆمارکراوە) دەست وقاچ وپێستیان ئەکەونە شایەتی دان لەسەریان بەفەرمانی خوا:

﴿ وَيَوْمَ يُحْشَرُ أَعْدَاءُ اللَّهِ إِلَى النَّارِ فَهُمْ يُوزَعُونَ﴾ (١٩)

ڕۆژ و ڕۆژگارێك دوژمنانی خودا (واتە: کافران و موشریکانی گشت نەتەوەکانی مێژوو) بەرەو ئاگری جەهەنەم راپێچ دەکرێن و لەسەر لێواری جەهەنەم کۆدەکرێنەوە. (وە دەستەکان و تاقمەکانی پێشوو ڕادەگرن تا دەستەکان و تاقمەکانی دوایی بگەنە ئەوان).

﴿ حَتَّى إِذَا مَا جَاءُ وهَا شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَارُهُمْ وَجُلُودُهُمْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ (٢٠)﴾

کاتێك دەگەنە کەنار ئاگری جەهەنەم، گوێچکەکانیان و چاوەکانیان و پێستەکانیان (و تەواوی ئەندامەکانیان) لەسەر کار و بارێك کە (لە دونیا دا) کردوویانە گەواهی و شایەتی دەدەن.

﴿ وَقَالُوا لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدْتُمْ عَلَيْنَا قَالُوا أَنْطَقَنَا اللَّهُ الَّذِي أَنْطَقَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ (٢١) ﴾

ئەوان بە پێستەکانیان دەڵێن: بۆ دژی ئێمە گەواهی وشایەتیتان دا؟ دەڵێن: ئەو خودایەی هەموو شتێکی وە زمان و قسە هێناوە، ئێمەی وە زمان و قسە هێناوە، هەر ئەو زاتە یەکەمجار (لە نەبوون ئێوەی هێناوەتە بوون و) خولقاندونی و

دروستی کردوون، وه (دوای مەرگ دەتان ژێنیتەوه و) بۆ لای ئەو دەگێردرێنەوه.

﴿ وَمَا كُنْتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَا أَبْصَارُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَكِنْ ظَنَنْتُمْ أَنَّ اللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِمَّا تَعْمَلُونَ (٢٢)﴾

وه ئێوه ئەگەر خۆتان حەشار دەدا و دەشاردەوه، نه بە هۆی ئەوه بوو چونکه گوێیەکانتان و چاوەکانتان و پێستەکانتان (و گشت ئەعزا و ئەندامتان) شایەتیتان لەسەر دەدەن، وه بەڵکو واتان بیر دەکردەوه کە خودا زۆربەی ئەو شتانەی کە دەیانکەن نازانیٚ و لێیان ئاگادار نییه.

﴿ وَذَلِكُمْ ظَنُّكُمُ الَّذِي ظَنَنْتُمْ بِرَبِّكُمْ أَرْدَاكُمْ فَأَصْبَحْتُمْ مِنَ الْخَاسِرِينَ (٢٣) ﴾

وه ئەو گومانەتان لە بارەی پەروەردگاری خۆتان دا بوو کە تەفروتونای کردن و کەوتنە نێو ڕیزی زیانباران و زەرەر مەندان.

﴿ فَإِنْ يَصْبِرُوا فَالنَّارُ مَثْوًى لَهُمْ وَإِنْ يَسْتَعْتِبُوا فَمَا هُمْ مِنَ الْمُعْتَبِينَ (٢٤)﴾ فصلت..

ئەگەر ئەوان خۆڕاگرن (یان خۆڕانەگرن، یەکسان و بەرابەرە) ئاگری جەهەنەم جێگایانه (و ڕێی نەجاتیان لە ئەویٚ نییه). وه ئەگەر بیانەویٚ عوزر بهێننەوەوداوای لێبوردن بکەن لێیان وەرناگیریٚ و داوای گەڕانەوەش بکەن ناگەڕێنەوه.

**ئەرزو ئاسمانەکان گوێڕایەڵی خوان. ئەی ئادەمیزاد تۆ خۆت لێبوە بەچی لەکاتێکدا خوا ئەتبینێ!!؟**

**إِذَا السَّمَاءُ انشَقَّتْ** (١) کاتو ساتێ ئاسمان لەت و پەت دەبێ.

**وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ** (٢) وە ملکەچی فەرمانی پەروەردگاری بوو، وە حەقیش ئەوەیە (ملکەچی فەرمانی پەروەردگاری بێ).

**وَإِذَا الْأَرْضُ مُدَّتْ** (٣) وە کاتو ساتێ زەمین پان راخرا و تەخت کرا (و سەروخوار و پەستی و بلێندی نەما و ساف و سووف بوو).

**وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتْ** (٤) وە ئەوەی تێیدایە (لە خەزێنان و مردووان) فرێی دەداتە دەرێ و خالّی دەبێت.

**وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ** (٥) وە ملکەچی فەرمانی پەروەردگاری بوو، وە حەقیش ئەوەیە (ملکەچی فەرمانی پەروەردگاری بێ).

**يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَى رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَاقِيهِ** (٦) ئاهای ئەی بنیادەم! تۆ بە رەنج و تێکۆشانی زۆر و زەوەند و پەیتا پەیتا و بێ وێستان، بەرەو پەروەردگاری خۆت دەڕۆی و سەرەنجام پێی دەگەی و دیدەنی دەکەی (و بەرهەمی کارو کردەوەو ئاکامی چاکی و خراپی خۆت دەبینی).

پیاوباشێك بەکەسێکی وت: تەمەنت چەندە؟وتی: شەست ساڵ.وتی: سبحان الله شەست ساڵە بەرێوەی بەرەو لای‌خوا رەنگەزۆرت نەمابێت بگەیت..زۆرجار بیردەکەمەوە ژیانێکی کورتی کەم دراوە پێمان و بەرەو ژیانێکی نەبڕاوەی ئەبەدی ئەچین..خۆزگەم بەوەی ئاکارو کرداری جوانەو رووی دێت بمرێت..

**فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ** (٧) **فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا** (٨) جا ئەو کاتە هەرکەس نامەی ئاکاری درا بە دەستی راستیەوە.دوای ئەوە حیساب و کیتابێکی سووك و سادەی لەگەڵ دەکرێ.

**وَيَنْقَلِبُ إِلَى أَهْلِهِ مَسْرُورًا** (٩) و شاد و شەنگوڵ بۆ لای کەسان و خزمانی خۆی دەگەڕێتەوە ( کە تەواوی پیاوان و ژنانی ئیماندارن).

**وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ وَرَاءَ ظَهْرِهِ** (١٠) **فَسَوْفَ يَدْعُو ثُبُورًا** (١١) **وَيَصْلَى سَعِيرًا** (١٢) وە ئەمما ئەو کەسەی نامەی ئاکاری لە پشت سەریەوە دەدرێتە دەستی.

جا دوای ئەوە (ئاواتی مەرگی خۆی دەخوازێ و) هاوار دەکا: ئەی مەرگ وەرە (گیان لە لەشم دەربەرە و بە فەریام وەرە!).

وە دەکەوێتە نێو ئاوری گڕدار و بلێسەدارەوە و پێی دەسووتێ.

**إِنَّهُ كَانَ فِي أَهْلِهِ مَسْرُورًا** (١٣) **إِنَّهُ ظَنَّ أَنْ لَنْ يَحُورَ** (١٤) ئەوەش بە هۆی ئەوەیە کە لەنێو خانەوادەو کەس‌وکاریدا (لە سەر دونیا، سەرمەستی هەوا و هەوەس و دەڵبەستەو سەوداسەری کەیف‌و خۆشی) بووە.

ئەو وای گومان دەبرد کە هیچ کاتێ (بۆ لای خودا، بۆ حیساب و کیتاب) ناگەڕێتەوە.

**بَلَى إِنَّ رَبَّهُ كَانَ بِهِ بَصِيرًا** (١٥) بەڵێ کە (زیندوو دەبێتەوە بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە و) پەروەردگاری ئەوی دیوەو ئاگای لە (حاڵ و باڵ و ئاکار و وتاری) ئەو بووە ( دەم بە دەم و لەحزە بە لەحزە، ئەوی لەبەرچاو گرتووە).

**فَلَا أُقْسِمُ بِالشَّفَقِ** (١٦) سوێند بە سوورایی دەوری ئاسۆ.

**وَاللَّيْلِ وَمَا وَسَقَ** (١٧) وە سوێند بە شەو و بە هەرچی لەبەر خۆیان دەگرێ و لە ژێر تاریکی خۆی کۆیان دەکاتەوە.

**وَالْقَمَرِ إِذَا اتَّسَقَ** (١٨) وە سوێند بە مانگ لە ئەو کات و ساتەدا کە (دەگاتە شەوی چواردە و پڕ شەبەق و گەشەدار دەبێ و خڕهەڵدەگەڕێ و) کۆدەبێتەوە.

لَتَرْكَبُنَّ طَبَقًا عَنْ طَبَقٍ (١٩) قەتعەن ئێوە لە پلەو بارێکەوە دەکەونە پلەو بارێکەوە (وە لە چۆنایەتی و دۆخێك، سەر لە چۆنایەتی و دۆخێك دەردێنن).

فَمَا لَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ (٢٠) جا ئەوان بۆچی دەبێ ئیمان نەهێنن.

وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنُ لَا يَسْجُدُونَ (٢١) وە کاتێ قورئانیان بۆ دەخوێندرێتەوە بۆ دەبێ سوژدە نەبەن (و لە بەرابەری خاوەنی قورئان، پەروەردگاری جەهان، خولقێنەری زەمین و ئاسمان، نەکەونە سەر خاك و کڕنووش نەبەن!).

بَلِ الَّذِينَ كَفَرُوا يُكَذِّبُونَ (٢٢) بەڵکی کافران (بە هۆی بە خوو و خدەی بابان و باپیران و پێشینانی خۆیان، وە پەیڕەوی لە ئاکارو کردەوەی رابردووانی گەل و هۆزیان، وە پاراستنی پلەوپایە، وە بە خاتری دونیادۆستی و ماڵ خۆشەویستی هەوا و هەوەس پەرستی، ئایاتی ئیلاهی و زیندووبوونەوەو پەسڵان و بەهەشت و جەهەندەم) بە درۆ دادەنێن و نادروست دەزانن.

وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُوعُونَ (٢٣) خودا زاناترە (لە خۆیان) بە ئەوەی لە دڵی دەگرن (و بۆ بەربەرەکانی و دژایەتی لەگەڵ ئیسلام لە دەروونیاندا رایدەگرن).

فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ (٢٤) جا موژدەی عەزابێکی بەژان و ئۆفیان بدەیە.

إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ (٢٥)

بەڵام ئەو کەسانەی ئیمانیان هێناوە، وە کاران و کردەوانی باش‌و چاکیان کردوە، ئەوان پاداشتی نەبڕاوەو بێشوماریان هەیە.

## خوا زاناو ئاگاداره به غه‌یبه‌کان:

دکتۆر صباح بەرزنجی دەڵێ: یەکێ لەسەرکردەکانی کۆمۆنیستەکان شەوێك گوێی لەم ئایەتە ئەبێت لەرادیۆیەکەوە ﴿ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ (٣٤)﴾ لقمان.

ئەویش دەڵێت: جا ئەوەچییە، بۆ نازانم بەیانی چی دەبێت و چی پەیدادەکەم، من سبەینێ ئەچم بۆ کارو وەك هەموو رۆژێك پارەی خۆم پەیدادەکەم، کەچی سبحان الله بەیانی کەرۆژ بووەوە ٣١ی ئاب بوو ساڵی ١٩٩٦، ئەوە قەوما کە لەبیری کەسدا نەبوو، خەڵکی لەترسی هاتنەوەی بەعس ئاوارەبوون، ئەمە ئەبێت بەدەرس بۆی و بڕوا بە قورئان دەکات و وازی لەکۆمۆنیستی هێناو چووە لای برادەرەکانی و وتی: نەئەتانناسم و نە ئەمناسن وئیتر من تەواو لەگەڵتانا.

## لە قورئاندا باسی سێ غەیب کراوە

### یەکەم: غەیبی ڕابردوو:

ئەو ڕووداوانەیە پێش پێغەمبەرﷺو دابەزینی قورئان ڕوویانداوە، هەروەك باسی دروست بوونی ئادەم و ئاسمانەکان و زەوی و ژیاننامەی پێغەمبەران و گەلەکانیان.

### دووەم: غەیبی ئێستا:

ئەو ڕووداوانەیە کە قورئان باسی کردوون و لە زەمانی پێغەمبەرﷺ ڕوویانداوە، هەروەها باسی پەروەردگار و مەلائیکەت و پەریەکان کە بوونیان هەیە و ئێمە هەستی پێ ناکەین.

## سێیەم: غەیبی داهاتوو:

هەموو ئەو هەواڵ و بەڵێنانەی قورئان دەگرێتەوە کە هەر لە زەمانی پێغەمبەرەوە (د.خ) تا قیامەت ڕوودەدەن.

ئەم غەیبانەش کە قورئان باسیان دەکات و هەندێکی کەمیان ئاشکرا بوون و هاتونەتەدی و ئەوانی تریش بەڕێوەن و، بەڵگەن لەسەر موعجیزەی ئەم قورئانە بەعیلمی خوا دابەزیوە،هەروەها بەڵگەی فراوانی و بێپایانی زانستی خوایە.. نموونەش بۆ ئەم باسە زۆرە وەك:

***

## سەرکەوتنی ڕۆم بەسەر فارسەکاندا

## گرنگی پێشبینیەکەی قورئان:

پێشبینیەکانی قورئان لایەنێکی دیاری ئیعجازی قورئانن، کە خوای گەورە بۆپشتگیری پێغەمبەرەکەی هێناونی‌و، مرۆڤ لە ئاستیانا سەرسام دەبێ.

ئەو باروزروفەی کە قورئان ئەمەی تیا ڕاگەیاند بێگومان موعجیزە بوو چونکە:

أ - بارو زرووف و ڕووداوەکان بەهیچ جۆرێك ئەوەیان لێنەدەخوێنرایەوە کە ئەو پێشبینیە دێتەدی.

ب - دیاری کردنی ماوەی (٣) تا (٩) ساڵ بۆ هەستانەوەی گەلێکی ژێرکەوتووی شپرزی بێدەسەلاتی وەك ڕۆمەکان لەو سەردەمەدا بەعەقڵی کەسدا نەدەچوو.

بەڵام دیارە دنیا هەروا بەگوترە نارِوات بەڕێوەو، پەروەردگار دەستی لێ بەرنەداوەو فەرمان هەرفەرمانی ئەوەو چی بوێت لە بوونەوەرەکەیدا ئەوە دەکات و هیچ شتێك نیە بتوانێ دەستەوسانی بکات.

لەو ڕۆژەدا ڕۆمەکان لەپەلەقاژێی مەرگ وگیانەڵادابوون بەدەست فارسە ئاگر پەرستەکانەوە و پەنجا هەزاریان لێ بەدیل گیرابوو لە دوایەمین جەنگیاندا.

دەنگ وباسی سەرکەوتنی فارس بەسەر ڕۆمدا گەیشتە مەککەوکافرانی مەککە کەوتنە پڕوپاگەندە ولاف وگەزاف لێدان وتانووتدان لە موسڵمانان، گوایە خۆ فارسەکان بەلای ئێوەوە ئاگر پەرستن و ڕۆمەکانیش ئەهلی کیتابن، ئەی بۆچی فارسەکان سەرکەوتن بەسەر ڕۆمەکاندا، کەواتە ئێمەش سەردەکەوین بەسەر ئێوەدا، هەرچەندە ئێوە خۆتان بەڕاست دەزانن وخۆتان بەخاوەنی کتێبی ئاسمانی دەزانن.

ئالـەم کاتەدا قورئان هاتە خوارەوەو فەرمووی: ﴿ الم غُلِبَتِ الروم في أدنى الأرض وهُمْ مِن بعدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبون في بِضْعِ سنين لله الأمرُ مِن قبل ومِن بعد ويومئذٍ يفرحُ المؤمنون بنصرِ الله ينصُرُ مَنْ يشاء وهو العزيزُ الرحيم وعدَالله لايُخْلِفُ اللهُ وَعْدَهُ ولكن اكثر الناسِ لايعلمون يعلمون ظاهراً من الحياة الدنيا وهم عن الآخِرَة هم غافلون﴾ الروم:٧.

واتە: ئەلیف لام میم، ڕۆمەکان بەدەستی فارسەکان تێکشکێنران، لەنزیکترین و نزمترین وڵاتیاندا، بەڵام لە ئایندەدا نۆرەیان دێتەوەو ڕۆمەکان دوای شکستیان سەردەکەونەوە، لەچەند ساڵێکدا (٣تا ٩) ساڵ،هەموو کارو فرمانێك تەنها بەدەست خوایە، لەوەو پێش و لەوەو دوایش و لەهەموو کات وشوێنێکدا. جائەو ڕۆژە بڕواداران خۆشحاڵ و شادمان دەبن، بەسەرکەوتنی خوا کە بەخششی بە بڕواداران، ( کەلەبەدردا سەری خستن )، هەرکەسێك یان هەردەستەیەك ئەوزاتە بیەوێت سەری دەخات، هەرئەو خوایەش خاوەنی دەسەڵاتی بێ سنوورە و زۆریش میهرەبانە. بێگومان ئەوە بەڵێنی خوا خۆیەتی کە کێی بوێت سەری دەخات، خوا بەڵێنی خۆی دەباتە سەر، هەرچەند زۆربەی خەڵکی تەنها ڕواڵەت لەدنیا دەزانن وعەقڵیان لەچاویاندایە، ئەوانە بێئاگاو بێ خەبەرن لەڕۆژی دوایی وقیامەت. ئەوانە هەر ڕواڵەت لە ژیانی دنیا بەدی دەکەن، لەبەرامبەر قیامەتیشەوە بێئاگان.

## بارو زرووفی ئەو ڕۆژگارە:

لەپەڕاوی (انحطاط وسقوط الامبراطورية الرومية) دا مێژوونووسی ئینگلیزی ناسراو (ئیدورد جیبون) باسی ئەو سەردەمە دەکات، کە چەندە ڕۆمەکان لاوازو شپرزو بێ دەسەڵات بوون: (لەو ڕۆژگارەدا کسری ئەپرویز (خسرو) لەساڵی ٦٠٣ ی زاییندا هێرشی کردەسەر دەوڵەتی ڕۆم وتوانی قەڵاکانی ڕۆمەکان داگیر

بکات ولە ڕووباری فورات بپەڕێتەوەو بەرەو شام بکەوێتە ڕێ وحەڵەب داگیر بکاو پاشان (ئەنتاکیە) ش بگرێ، کەپایتەختی بەشی ڕۆژهەڵاتی دەوڵەتی بیزەنتی بوو، ئنجا دیمەشقیان گرت وپاشان خەلیل و ڕۆژهەڵاتی ئەردەن و، کەنیسەکانیان سوتاندن و هەرچیماڵی وەقفی تیابوو کە لە سێ سەدەدا کۆکرابوونەوە هەرهەموویان بەتاڵان برد، تەنانەت خاچی ئەسڵی (TRUE CROSS) یشیان برد بۆ ئێران و نزیکەی نەوەد هەزار گاوریان کوشت.

ئنجا فارسەکان چوون بەرەو میسرو داگیریان کردو سنووری فارسەکان گەیشتە حەبەشەو تەڕابلوسی ڕۆژئاواو بەمەش دەستیان گرت بەسەر زۆر ناوچەی ئەفریقیادا..

## هۆی هێرشی فارسەکان بۆسەر ڕۆمەکان:

کاتی خۆی کیسرا ئەبرویز خەسرەو کوڕی هرمزی کوڕی ئەنوشیروان، ڕای کرد لەدەست (بەهرام جور)، کە هورمزی باوکی لەسەرتەخت هێنایە خوارەوە و، چوو بۆلای ڕۆمەکان و پاشای ڕۆمەکانی ئەوکاتە (موریقس) ڕێزێکی شاهانەی لێگرت و تەنانەت دەڵێن کچی خۆشی دایەو،پاشان سوپاشی لەگەڵ نارد بە سەرکردایەتی جەنراڵ (نارشز) و تەختی پاشایی باوو باپیریان بۆسەندەوە لەساڵی (٥٩٠) ی زایینیدا. ئەمەش وای لەخەسرەوشا کرد کە هەمیشە وەك باوکێك سەیری (موریقس) بکات و هەردەم خۆی بەمنەتباری بزانێت. لەساڵی (٦٠٢) زایینیدا (منوقس) کەیەکێ بوو لەجەنراڵاتی سوپای ڕۆم شۆڕشی کرد دژی (موریقس) و کوشتی و ماڵ ومناڵی لەناوبردو لەسەر تەختی پاشایەتی (قوستەنتینیە) دانیشت، ئنجا سەفیری خۆی نارد بۆلای ئێرانیەکان.

کاتێ کیسرا خەسرەو شا بەمەی زانی زۆر نارەحەت بوو، دانی نەنا بەم حکومەتە تازەیەداو ویستی تۆڵەی (موریقس) بکاتەوە، بۆیە ساڵی ٦٠٣ ی زایینی هێرشی کردە سەر دەوڵەتی رۆم (کەئەمەش حەوت ساڵ پێش هەڵبژاردنی حەزرەت ﷺبوو بۆپێغەمبەرایەتی ).

## شۆڕشی هرقل:

لەو رۆژگارەدا کە دەوڵەتی رۆم لە گیانەڵادا بوو، هرقل کە حاکمی ئەفریقیابوو شۆڕشی کرد دژی (فوقس) و لەساڵی (٦١٠) ز دا سەرکەوت بەسەریاو کوشتی، هەرئەوەندە کاروباری گرتە دەست، هەواڵی داگیرکردنی (ئەنتاکیە) ی پێگەیشت لەلایەن فارسەکانەوە. فارسەکان کۆڵیان نەداو بەردەوام بوون لەسەر داگیر کردن و پەلاماردان وگوێیان بەم گۆڕانکاریانە نەدا، تاساڵی ٦١٦ی زایینی کە رۆمەکان تەواو شکان و زۆر وڵاتیان لەدەست داو ئەورووپاش پشێوی و نائارامی زۆر رووی تێکرد.

لەساڵی (٣٠٣) ی زایینەوە لەمیسرەوە خواردن و دانەوێڵە دەهات بۆ ( قوستەنتینیە) ی پایتەختی رۆمەکان و دابەش دەکرا بەسەرخەڵکدا، بۆ ئەوەی خۆش گوزەران بن و لەپایتەختدا بمێننەوەو جێگیر بن، کەچی کەئەو باروزروفە هاتە پێشێ ومیسر لەلایەن فارسەکانەوە داگیرکرا، بۆیەکەمجار لەساڵی (٦١٨) زایینیدا، ئەو دانەوێڵەو خواردنەی میسر بڕاو نەهات، کە ئەمەش بووە هۆی برسیەتی و تێکچوونی باری گوزەرانی خەڵك لەپایتەختدا.

## هرقل وگۆڕانیكی سەیر:

مێژوونووسەكان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی كە (هرقل) لەگەڵ ئەوهەموو دەست درێژیەی فارسەكاندا بۆسەر وڵاتەكەی، كابرایەكی ساردوسڕو بەندەی هەواو ئارەزووی بوو، هەروەهاخەریكی خورافات و شتانێك بوو كە دوورن لە ڕەوشتی پاشایەكی مەزنی ئیمپراتۆریەتێكی گەورەو بەرفراوان.

ئالەو شەوەزەنگەی ڕۆمەكاندا لەساڵی ٦١٦ی زایینیدا قورئان دابەزییە سەر پێغەمبەرێكی نەخوێندەواری ناو چوار دیواریماڵێكی قوڕین لەمەككەداو پێی فەرموو (غُلِبَتِ الروم في ادنى الارض وهم مِن بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبون)..

( جیبون )ی مێژوونووس دەڵێت: (محمدﷺئەم هەواڵەی دا لە كاتێكدا كە فتوحاتی ئێرانیەو فارسی لەوپەڕی بەهێزیدابوو، لەكاتێكدا كە هەستانەوەی ڕۆمەكان بەعەقڵی كەسدا نەدەچوو (بگرە هەر ئەستەم بوو)، چونكە دوانزە ساڵی یەكەمی حوكمی هرقل ئەوەی لێدەخوێنرایەوە، كەباری دەوڵەتەكە ڕۆژ بەڕۆژ خراپتر دەبێت ) ج ٣ ل ٣٠٣ (انحطاط وسقوط الامبراطورية الرومية)..

لەگەرمەی ئەو هەموو ناهەمواریەی دەوڵەتی ڕۆمەكاندا، هرقل ویستی (قوستەنتینیە) بەجێ بهێڵێ و بچێ بۆشاری (قرتاجنە) لەنزیك (تونس) و بیكاتە پایتەختی خۆی. كەلوپەل و ئاڵتون وهەرچی هەبوو لە كۆشكی پاشایەتیدا سواری كەشتی كران و لەوەدا بوون بڕۆن، یەكێ لەپیاوە ئایینیەكان زۆر هانی داو ورەی بەرز كردەوە كەبجەنگێ و پایتەخت بەجێ نەهێڵێ.

(هرقل) قەناعەتی كردو چوو بۆ كەنیسەی (st - sophia ) وسوێندی بۆخواردن كەژیان و مردنی لەگەڵ ڕەعیەتەكەیدا بێت و بەجێیان نەهێڵێ.

بەڵێ.. گۆڕانێكی گەورە بەسەر (هرقل) داهات و شەوگاری تاریكی تەمومژاوی گۆڕدرا بەڕۆژی ڕوناك و بووە پاڵەوان و سوارچاكی مەیدان و،

هێزەکانی کۆکردەوە لە ( کەنداوی ئەسکەندەرۆنە) وبە بوتەی لابردنی پەردەش لەسەر پەیکەری (عیسا)، وتاریکی ئاگرینی بوخەلکەکە داو، داوای لیکردن کە تولە بکەنەوە لە فارسە ئاگرپەرستەکان.

هرقل کەوتە هێرش کردنە سەرفارسەکان و سەرکەوتنی باشی بەدەستهێناو، توانی بچێتە ناوئێرانەوەو دیلە ڕۆمەکان ئازاد بکات و، لە هەلمەتەکانیدا کارێکی وای بەفارس کرد، خەریك بوو بەیەکجاری تەفروتوونایان بکات. هرقل توانی ئالای ڕۆمەکان لەسەردلی فارسەکان لەئێراندا بچەقێنێ و بەسەریانەوە بشەکێتەوە.

ئەم سەرکەوتنە مەزنەش لەسالی (٦٢٥) ی زایینیدا بوو کەبەرامبەر سالی دووی کۆچی یە (کەموسلمانان تیایا لەشەڕی بەدردا سەرکەوتن)..

مێژوونووسان سەرسامن لە گورج بوونەوەو گۆڕانی (هرقل) و دەلێن: دەستی قەدەر هرقلی برد بەرەو ئەو کارە کە لەخەیالی کەسدا نەبوو، پاشان (هرقل) گەڕایەوە سەرحالی جارانی وخەیالی دایە رابواردن و، هەروەك جارانی کەوتەوە سەر ئەو بیرەی کە نابێت ژیانی پاشاو کاربەدەستان هەر لە گۆڕەپانی جەنگدابێت، ئەم حالەش درێژەی کێشا تا ڕووبەڕووبوونەوەیان لەگەل سوپای ئیسلامدا.

موعجیزەکانی ئەو پێشبینیە:

١) ئایەتەکە دەفەرموێت ڕۆمەکان ژێرکەوتن لەنزمترین و نزیکترین ناوچەدا کەئەمەش ڕاستەو، ڕۆمەکان لای دەریای مردوو ژێرکەوتن کەنزمترین ناوچەیە لەجیهاندا (في أدنى الارض).

٢) ئایەتەکە هەوالی دا کە لە (بضع سنين) دا سەردەکەونەوە، بۆیە ئەبوبەکر گرەوی کرد لەگەل کافرانی مەککەدا و خۆشەویست دروودی خوای لەسەر پێی فەرموو لە (سێ تا نۆ) سال دیاری بکە. هەرواش دەرچوو لە نۆ سالەکەدا

ڕۆمەکان هەستانەوەو سەرکەوتن کەهیچ تەفسیرێکی نیە مەگەر ئەوەی کەئیرادەی خوا بوو هەستنەوە.

٣) ئایەتەکە هەواڵی سەرکەوتنی موسڵمانان دەدات شان بەشانی سەرکەوتنی ڕۆمەکان، کەدیارە ئەمەش هەرشتێکی سەیرو ئەستەم بوو لەو کاتەدا کەموسڵمانان چەوساوەبوون لە مەککەداو کافران لەوپەڕی دەسەلآت و تواناداا بوون، ئەوەبوو لەو ساڵەدا کە ڕۆمەکان سەرکەوتن و هەواڵەکە گەیشتە موسڵمانان، ئەمانیش دڵخۆشبوون بەسەرکەوتنیان لەجەنگی بەدردا کەخۆی لەخۆیدا موعجیزەو سەرسامی بوو، وەلەعەقڵی کەسدا نەبوو ( وَيَومَئِذٍ يَفرَحُ المُؤمِنُون بِنَصرِ اللهِ يَنصُرُ مَن يَشاءُ وَهُوَ العَزِيزُ الحَكِيم وَعدَالله لايُخلِفُ اللهُ وَعدَهُ وَلكنَ اَكثَرَ النَاسِ لايَعلَمُون ) الروم: ٤.

## خوا رازیان ئەزانیٚ لەهەرجێیەک بن:

- ﴿ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُهُمْ بِمَا عَمِلُوا أَحْصَاهُ اللَّهُ وَنَسُوهُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ (٦)﴾ ڕۆژ و ڕۆژگارێك خودا هەمووان زیندوو دەکاتەوە، وە لە ئەوەی کردوویانە ئاگاداریان و خەبەرداریان دەکا، ئەو کارانەی خودا تۆمار و سەرئەژمێری کردووە و ئەوان فەرامۆشیان کردووە و لەبیریان چووە. خودا لەسەر هەر شتێك حازر و نازرە و ئامادە و ئاگادارە.
- ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مَا يَكُونُ مِنْ نَجْوَى ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَا أَدْنَى مِنْ ذَلِكَ وَلَا أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا ثُمَّ يُنَبِّئُهُمْ بِمَا عَمِلُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ (٧)﴾

ئایا نەتزانیوە کە بێگومان خودا دەزانێ و ئاگادارە لە ئەوەی لە ئاسمانان و لە زەمیندایە؟ سێ کەس لەگەڵ یەکتر سرتە و چپە ناکەن مەگین خودا چوارەمیانە، وە پێنج کەس لەگەڵ یەکتر سرتە و چپە ناکەن مەگین خودا شەشەمیانە. وە نە کەمتر لە ئەوەندە و نە زیاتر لە ئەوەندە نین مەگەر خودا لەگەڵیانە لەهەر جێیەك بن (و رازیان دەزانێ). پاشان رۆژی پەسڵان ئاگادار و خەبەرداریان دەکا لە ئەوەی کردوویانە. بێگومان خودا لە هەموو شتێك ئاگاداری ئاگادارە.

- ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ نُهُوا عَنِ النَّجْوَى ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَيَتَنَاجَوْنَ بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَمَعْصِيَةِ الرَّسُولِ وَإِذَا جَاءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ اللَّهُ وَيَقُولُونَ فِي أَنْفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا اللَّهُ بِمَا نَقُولُ حَسْبُهُمْ جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ الْمَصِيرُ (٨)﴾

ئایا سەرەنجی ئەو کەسانە نادەی کە لە سرتە و چپە سڵەمێندراونەوە، بەڵام لە پاشان دیسان دەگەڕێنەوە سەر ئەو شتەی لێی سڵەمێندراونەوە، وە بۆ ئەنجامدانی گوناه و دوژمنایەتی و نافەرمانی لە پێغەمبەر لەگەڵ یەکتر دەکەونە سرتە و چرپە؟! وە کاتێك دێنە لای تۆ بەجۆرێك سڵاوت لێدەکەن کە خودا بە ئەو شێوە سڵاوی لێ نەکردووی، وە لە دڵی خۆیاندا دەڵێن: (ئەگەر کاری ئێمە خراپە و خودا پێی دەزانێ) ئەدی بۆ خودا بەهۆی ئەوەی دەیڵێین عەزابمان نادا؟! جەهەننەمیان بەسە، ئەو جەهەننەمەی تێی دەکەون و پێی دەسووتێن. جا چەندە سەرەنجامێکی خراپ و چەندە جێگایەکی نالەبارە!

دیقەت بدەن لەم ئایەتە: (**وَيَقُولُونَ فِي أَنْفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا اللَّهُ بِمَا نَقُولُ**) وە لە دڵی خۆیان دا دەڵێن: (ئەگەر کاری ئێمە خراپە و خودا پێی دەزانێ) ئەدی بۆ خودا بەهۆی ئەوەی دەیڵێین عەزابمان نادا؟!ئەمە زانست و زانیاری خوامان

بۆدەرنەخات کە رازی ناودڵیان و خەیاڵەکانی ناو نەفسیانمان بۆ ئەخاتەڕوو، کەخۆیان بەتەنها ئەیزانن و نهێنیەکی شاردراوەیە وکەس ئاگای لێنیە..

## خوای زانا ناخی ئەهلی کیتاب ئاشکرا دەکات:

ئەوەی ئەهلی کیتاب دەیشارنەوە ئەیداتەوە بەروویاندا، ئەوەتا پێیان دەفەرموێت: ئێوە دڵنیان و ئەزانن گۆڕینی قیبلە بەرەو مەککە هەقەو لەخواوەیەو وەئەشزانن کە محمد پێغەمبەری خوایەو لەکوڕەکانی خۆتان باشتری دەناسن، ئەم شێوازەی قورئان کەبەو موسەیتەریە رووبەڕوویان ئەبێتەوە بەڵگەیە کەلەخواوەیەو کەس نەبووە ئاوا رووبەڕوویان ببێتەوە.چونکە کتێبەکانیان تەنها بەزمانی خۆیانبووەو تەنها خۆشیان شارەزابوون لێی وئنجا بەئەنقەست دەستکاریشیان کردووە.

﴿ قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنْتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ..﴾

جارجارە رووبەرەو ئاسمانی تۆ دەبینین و پەیامی دڵی تۆ بۆ ئاڵوگۆڕکردنی رووگە وەردەگرین. جا ئێمە تۆ روو بە ڕووگەیەك دەکەین کە پێی رازی دەبی و پەسەندی دەکەی. دەی (هەر ئێستا) روو بکە لای مەسجیدولحەرام وە (ئەی ئیمانداران) لە هەر جێیەك بوون لە نوێژدا روو بکەنە ئەوێ.

﴿ وَإِنَّ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّهِمْ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ (١٤٤)﴾

ئەو کەسانەی کتێبیان پێدراوە چاك دەزانن ئەو رووتێکردنە (و بەرەو مەسجیدولحەرام راوەستانە) راستو دروستە و بە فەرمانی پەروەردگاریانە. (ئەمما

هەرچەند ئەوە دەزانن لە فیتنەو فەساد دەست هەڵناگرن) و خودا لە ئەوەی دەیکەن غافڵ و بێخەبەر نییە ( رۆژێك تێدەگەن چیان بەسەر دێ).

﴿ وَلَئِنْ أَتَيْتَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ بِكُلِّ آيَةٍ مَا تَبِعُوا قِبْلَتَكَ وَمَا أَنْتَ بِتَابِعٍ قِبْلَتَهُمْ وَمَا بَعْضُهُمْ بِتَابِعٍ قِبْلَةَ بَعْضٍ وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُمْ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ إِنَّكَ إِذًا لَمِنَ الظَّالِمِينَ (١٤٥)﴾

وە ئەگەر هەموو جۆرە بەڵگەو نیشانەیەك بۆ ئەهلی کتێب بێنی ئەوان پەیڕەوی لە رووگەی تۆ ناکەن و رووی تێناکەن وە ئەتۆش پەیڕەوی لە رووگەی ئەوان ناکەی و رووی تێناکەی، وە هێندێکیشیان (لە جوولەکان و مەسیحیان) روو ناکەنە رووگەی هێندێکیان. وە ئەگەر تۆ وە شوێنی ویست و حەزی ئەوان کەوی دوای ئەوەی زانست و شارەزاییت بۆ هاتووە، ئەو وەختە لە زومرەو ریزی ستەمکاران دەبی.

﴿ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمْ وَإِنَّ فَرِيقًا مِنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ (١٤٦) الْحَقُّ مِنْ رَبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ (١٤٧)﴾

ئەو کەسانەی کتێبمان پێداون ئەو (پێغەمبەرە کە موحەممەدی ناوەو دوایینی پێغەمبەرانە چاك) دەناسن بە وجۆرەی کە کوڕەکانیان و منداڵەکانیان دەناسن. وە بێگومان تاقمێك لە ئەوان حەق و حەقیقەت دەشارنەوە، هەرچەندیش دەزانن. هەق و راستی لە پەروەردگاری تۆوەیە هەرگیز لەگومانبەران مەبە.



## چاودێری وسەرپەرشتی خوا بۆ خۆشەویستمان:

خوا دڵی خۆشەویستمان ئەداتەوەو پەروەردەی ئەکات کە ئەیبینێت و ئاگای لێیەتی و ئەو کارە مەزنانەشی بۆ کردووە:

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيم

**وَالضُّحَى، وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى..** سوێند بە چێشتەنگاو وە سوێند بە شەو، لە کاتێکدا کە تاریك دەبێ و وڵات دادەگرێ و ئارام دەگرێ.

**مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى.. وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَكَ مِنَ الْأُولَى.. وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَى.**

پەروەردگارت وێڵی نەکردووی و دەستی لێ هەڵنەگرتووی و ناخۆشی نەویستووی و لێت بێزار نەبووە.وە دوایی ژیان، بۆ تۆ باشتر دەبێ لە سەرەتای ژیان.وە پەروەردگارت لەمەودوا ئەوەندەت پێ دەبەخشێ و پێ دەدا (لە نیعمەتو قودرەت و پیرۆزی و سەرکەوتوویی) کە رازی دەبی.

**أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَآَوَى..** ئایا خودا ئەتۆی بە هەتیوی نەدی و پەنای دای حەوانیتیەوە؟

**وَوَجَدَكَ ضَالًّا فَهَدَى..** وە ئایا تۆی سەرگەردان و حەیران (لە نێوان بتپەرستان و یەهوودیان و کافران و ملهوڕان و کوشتو کوشتاری جاهیلانی گەل و هۆزاندا) نەدی و رێنوێنی کردی (و لە ژێر شەبەقی وەحی و پەیامی ئاسمانیدا ئایینی ئیسلامی فێر کردی؟)

**وَوَجَدَكَ عَائِلًا فَأَغْنَى..** وە ئایا تۆی هەژار و نەداری نەدی و دەوڵەمەند و دارای کردی؟

**فَأَمَّا الْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ. وَأَمَّا السَّائِلَ فَلَا تَنْهَرْ. وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ.**

جا کەوایە لە هەتیو تووڕە مەبە (و ماڵ و دارایی هەتیو مەخۆ و دڵی بەدەست بێنە). وە سواڵکەر دەرمەکە.وە بەڵکی قسە لە نیعمەتی پەروەردگارت بکە (و شوکرانەبژێری بکە و لێی بە هەژار و لێقەوماو بدە).

جابا بانگخوازان دڵخۆش بن ئەوەندەی پێغەمبەران چاودێری و سەرپەرشتی دەکرێن، ئەمانیش کە جێگرەوەی پێغەمبەرانن ئەوەیان بۆدەکرێت. ﴿ **وَكَذَلِكَ نُنْجِي الْمُؤْمِنِينَ**﴾ الأنبياء: ٨٨.

## ئەزانین تۆ خەم ئەخۆیت:

﴿ قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُ لَيَحْزُنُكَ الَّذِي يَقُولُونَ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ (٣٣) وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِنْ قَبْلِكَ فَصَبَرُوا عَلَى مَا كُذِّبُوا وَأُوذُوا حَتَّى أَتَاهُمْ نَصْرُنَا وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِ اللَّهِ وَلَقَدْ جَاءَكَ مِنْ نَبَإِ الْمُرْسَلِينَ (٣٤)﴾ الأنعام.

چاك دەزانین ئەو قسەی ئەوان دەیکەن بێگومان تۆ خەمبار دەکا. ئاخر ئەوان خۆ تۆ وەدرۆ ناخەنەوەو بە درۆ نازانن، بەڵکی ستەمکاران ئایاتی خودا ئینکار دەکەن.

وە بەر لە تۆ پێغەمبەرانێك بە درۆزن داندراون (و ئەزیەت و ئازار دراون). جا ئەوان سەبریان کردووە و خۆیان راگرتووە لە بەرابەری بەدرۆزن دانان، وە شکەنجە و ئازار دراون تا ئەو رادەی کە یاری و یارمەتی ئێمە پێیان گەییشتووە (و لە بەربەرەکانێ و خەباتی حەق و باتڵدا پیرۆز و سەرکەوتوو بوون. تۆش وابە، لەسەر رێگای خودا بە، جا خودا پیرۆزت دەکا. ئەوە قسەی خودایە) وە هیچ شتێك قسەی خودا ناگۆڕێ. وە دیاریشە دەنگ و باس و خەبەری پێغەمبەرانت پێگەییشتووە (کە چیان کردووەو چیان بەسەر هاتووە).

ئاوا خوا پێغەمبەرەکەی دڵنیادەکاتەوە کە ئاگای لێیەتی و ئەیبینێت و ڕێنمایی پێویستی ئەکات بۆ خۆڕاگری..

## خوا زۆرچاکتان ئەناسێت

١) قورئان دەفەرموێت: ﴿ رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ إِنْ يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ أَوْ إِنْ يَشَأْ يُعَذِّبْكُمْ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ وَكِيلا * وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِمَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ النَّبِيِّينَ عَلَى بَعْضٍ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا﴾ الأسراء: ٥٤-٥٥).

واتە: پەروەردگارتان چاکتان دەناسێت، خۆ ئەگەر بیەوێت ڕەحمتان پێدەکات کاتێك ڕێی چاکە دەگرنەبەر، یان ئەگەر بیەوێت سزاتان دەدات کاتێك ڕێبازی خراپە دەگرنە بەرو، ئێمە تۆمان بۆ ئەوە نەناردووە کە چاودێرو پارێزەری ئەوان بیت، تا ئەوان بەناچاری باوەڕبهێنن، پەروەردگارتان چاکتر دەزانێت بەوەی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، بێگومان ئێمە فەزڵی هەندێ لە پێغەمبەرانمان داوە بەسەر هەندێکیاندا و داودیش پەڕاوی زەبوورمان داوەتێ.

٢) خواباشتر ئەزانێت کێ پارێزکارە﴿ هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُمْ مِنْ الأَرْضِ وَإِذْ أَنْتُمْ أَجِنَّةٌ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ فَلا تُزَكُّوا أَنفُسَكُمْ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ اتَّقَى﴾ النجم: ٣٢.

واتە: خواوەند چاکتان دەناسێت، لە کاتێکدا ئێوەی لە زەویدا دروستکردووە و، لەوکاتەشدا ئێوە کۆرپەلەی بچووك بوون لە سکی دایکتاندا، کەواتە خۆتان بە چاك مەزانن و (تەزکیەی خۆتان مەکەن)، هەر خوا خۆی دەزانێت کێ بەڕاستی پارێزکارە.

خوای گەورە ئەزانێت کێ بەڕاستی پارێزکارەو ڕاست ئەکات لەگەڵ خوادا، ئاگای لەنیەتە، برای خۆشەویستم مامۆستا هەردی صابر پاش ئەوەی لەسەرخانەقای مەولانا خالید کتێبێکی نووسی و بڵاوی کردەوە، نزیکەی سێسەد لاپەڕەشی لەسەر جەنابی مەولانا خالید نووسی، لەنیەتی خۆیدا بڕیار ئەدات ئەگەر کەس نەبوو چاپەکەی بگرێتە ئەستۆ سەیارەکەی خۆی بۆ بفرۆشێت، خوای گەورە لەجیاتی یەکێك دووانی بۆنارد کە ئامادەییان بۆدەربڕی ئەرکی چاپەکەی لەئەستۆ بگرن.

٣) خوا ئەزانێت کێ باوەڕدارە بەڕاستی و کێش دووڕووە ﴿ وَمِنْ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللهِ جَعَلَ فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللهِ وَلَئِنْ جَاءَ نَصْرٌ مِنْ رَبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمْ أَوَلَيْسَ اللهُ بِأَعْلَمَ بِمَا فِي صُدُورِ الْعَالَمِينَ * وَلَيَعْلَمَنَّ اللهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْمُنَافِقِينَ﴾ العنكبوت: ١٠-١١.

واتە: هەندێك لە خەڵکی هەن دەڵێن: باوەڕمان بەخوا هێناوە، جا کاتێك یەکێك لەوانە لە پێناوی خوادا ئازار درا، وا دەزانێت سزاو ئەشکەنجەی خەڵکی وەك هی خودایە و لە دین وەردەگەڕێ، بەڕاستی ئەگەر پەروەردگارت سەرکەوتنێکی بەخشی، دووڕووەکان بەگەرمی دەڵێن: خۆ ئێمەش بێگومان هاوکارتان بووین، مەگەر خوا زاناترین نیە بەهەرچی هەیە لە دڵ و دەروونی هەموو خەڵکی جیهاندا،سوێند بێت، خوا ئاگادارە بەوانەی باوەڕیان هێناوە، هەروەها بەوانەش کە دووڕوون..

٤) ئاشکراو نهێنی لای خوا وەك یەکە ﴿ وَإِنْ تَجْهَرْ بِالْقَوْلِ فَإِنَّهُ يَعْلَمُ السِّرَّ وَأَخْفَى﴾ طه:٧.

واتە: ئەگەر بە ئاشکرا قسە بکەیت، ئەوە بێگومان ئەو زاتە نهێنی وشاراوەتر لە نهێنیش دەزانێت. (نهێنی ئەوەیە کە لە نێوان دوو کەسدا شتێك بەنهێنی باسکرێ و بوترێ، لەوەش نهێنی تر ئەوەیە کە لە دڵی یەك کەسدا بێ و وەك خەیاڵێك بێت بەمێشکیدا، دەی خوا هەموو حاڵەتەکان دەزانێ و هیچی لێ ناشاردرێتەوە و هیچی لێون نابێت).

٥) خۆی ئەزانێت چی دروست کردووە﴿أَلا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾ الملك: ١٤.

واتە: مەگەر خوا نازانێت کێی دروستکردووە و چۆنی دروستکردووە، لەکاتێکدا ئەو زاتە وردکارو بەسۆزو بە ئاگایە..

## پیشت بەخوای زانا ببەستە لەچوون بەرەو ئاشتیدا:

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ادْخُلُوا فِي السِّلْمِ كَافَّةً وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ ﴾ البقرة: ٢٠٨. واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە هەر هەمووتان بچنە ژێر سایەی ئیسلامەوە و بە تەواوی پەیڕەوی بکەن (کە مایەی ئاشتی و بەختەوەری دنیاو قیامەتە ) ودوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون،چونکە بە ڕاستی ئەو دوژمنی ئاشکراتانە..

ئیسلام تەنانەت ئاشتی دەوێت لەگەڵ دوژمناندا،بەڵام ئاشتیەك کە موسڵمانان بەهێز بن، نەك لە بێ هێزیەوە بێت و دوژمن شەرت و شروتی خۆی بسە پێنێ.

قورئان دەفەرموێت:﴿ فَلَا تَهِنُوا وَتَدْعُوا إِلَى السَّلْمِ وَأَنْتُمُ الْأَعْلَوْنَ وَاللَّهُ مَعَكُمْ وَلَنْ يَتِرَكُمْ أَعْمَالَكُمْ ﴾ محمد:٣٥. واتە:ئێوە سستی مەکەن و لاوازمەبن ولە بێ هێزیەوە داوای ئاشتی مەکەن، چونکە هەر ئێوە سەرکەوتوون و خواش لەگەڵتانەو کاروکردەوەتان بەزایە نادات.

بەڵێ...ئەگەر ئەوان ئاشتیان ویست و دەست درێژیان نەکرد ﴿وَإِنْ جَنَحُوا لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ الأنفال:٦١.
واتە: ئەگەر دوژمنان حەزیان بە ئاشتی کرد تۆش ئامادەیی خۆت دەربڕە و پشت بە خوا ببەستە. کەبەڕاستی خوا بیسەرو زانایە وئاگاداری کاروکردەوەتانە.

## خودا بیسەری ئاگادارەوهەرکەسی بویٚ پاکی دەکاتەوە لەگوناە:

﴿ وَلَكِنَّ اللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ الْإِيمَانَ وَزَيَّنَهُ فِي قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ الْكُفْرَ وَالْفُسُوقَ وَالْعِصْيَانَ أُوْلَئِكَ هُمُ الرَّاشِدُونَ، فَضْلاً مِّنَ اللَّهِ وَنِعْمَةً وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ الحجرات: ٧-٨. بەفەزڵ و ڕەحمەتی خوایە کە بڕوا لەدڵمانا جوان وخۆشەویست کراوەو ڕێی ڕاستمان گرتووەو ئیسلامەتیمان هەڵبژاردووە، کە ئەمەش گەورەترین نیعمەتە خوا پێی بەخشیوین، بۆیە چەند باسی ئیمان وئیسلامەتی بکەین هێشتا هەرکەمەو، چەند باسی بانگەوازکردن بکەین بۆ ئەم پەیامە پیرۆزە لە وێنە نەبووە، کەمایەی سەرفرازی دنیاو قیامەتە هەر دڵۆپێکە لە دەریایەك.

کە ئەوەش هەمووی فەزڵ و میهرەبانی خوایە بەرامبەرمان: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ وَمَنْ يَتَّبِعْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ فَإِنَّهُ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ وَلَوْلا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ مَا زَكَى مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ أَبَداً وَلَكِنَّ اللَّهَ يُزَكِّي مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ النور: ٢١..

ئەی کەسانێك کە ئیمانتان هێناوە! پێ بە پێی شەیتان مەڕۆن. هەرکەسێك پێ بە پێی شەیتان بڕوا و وەدوای شەیتان کەوێ دوچاری گەندەڵی و چەپەڵی و لادەری و لاڕێیی دەبێ چونکە ئەو تەنیا دەستوور بە گوناهی گەورە دەدا و ڕێنوێنی بۆ ئاکاری پیس و ناپەسەند دەکا. وە ئەگەر گەورەیی و کەرەم و لوتف و مەرحەمەتی خودا لەگەڵتان نەبا، هیچ کەسێك لە ئێوە هەرگیز (لە پیسی و

چەپەڵی گوناه و بەئاوی تۆبە) پاك نەدەبۆوە. وە بەڵام خودا هەركەسی بوێ پاكو خاوێنی دەكاتەوە وە خودا بیسەری ئاگادارە.

## خوا فراوانگیرو زانایەو تێنە کۆشن کەسانی تر ئەخاتە جێتان:

خوای گەورە بەم ئوممەتە دەفەرموێت:﴿هَاأَنتُمْ هَؤُلَاء تُدْعَوْنَ لِتُنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَمِنكُم مَّن يَبْخَلُ وَمَن يَبْخَلْ فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَن نَّفْسِهِ وَاللَّهُ الْغَنِيُّ وَأَنتُمُ الْفُقَرَاء وَإِن تَتَوَلَّوْا يَسْتَبْدِلْ قَوْماً غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوا أَمْثَالَكُمْ ﴾ محمد:٣٨.

ئاگادار بن! ئەوە ئێوەن (لەلای پەروەردگارتانەوە) داواتان لێ دەكرێ لە رێگای خوادا ببەخشن. هێندێك لە ئێوە بەرچاوتەنگی و رژدی دەكەن. هەركەس چرووكی بكا، بە زیانی خۆی چاوچنۆكی و بەرچاوتەنگی دەكا، خوا دەوڵەمەندە و ئێوە هەژارن. ئەگەر ئێوە ڕوو وەرگێڕن (و پشت لە فەرمانی خودا كەن) خودا گەل و هۆزێكی غەیری ئێوە بەجێی ئێوە دادەنێ (و كار و باریان پێ دەسپێرێ) گەل و هۆزێك كە هەرگیز وەك ئێوە نابن. (گیانیان و ماڵیان فیدای دین و ئایین دەكەن و لە فەرمانی خودا دەرناچن و لە ڕێی ڕاست لا نادەن).

یان دەفەرموێ ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَلاَ يَخَافُونَ لَوْمَةَ لآئِمٍ ذَلِكَ فَضْلُ اللّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ المائدة: ٥٤.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە هەركەس لەئێوە لە ئاینەكەی وەرگەڕێتو پاشگەزبێتەوە، ئەوە هەر خۆی زەرەردەكات و خوا لەئایندەدا كەسانێك دەهێنێتە كایەوە كەخۆشی دەوێن و ئەوانیش خوایان خۆش دەوێت، ملكەچ و

فەرمانبەردارو بەسۆزن بۆ بڕواداران و سەربلندو بە عیزەتن بەسەر بێ باوەڕاندا، جیهاد دەکەن لەڕێی خواداو لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسن، کە ئەمەش فەزڵی خوایە و دەیبەخشێت بە هەر کەسێك کەبیەوێت و شایستەی بێت، خواش فراوانگیرو زانایە.

یان دەفەرموێت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ انفِرُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ اثَّاقَلْتُمْ إِلَى الأَرْضِ أَرَضِيتُم بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا مِنَ الآخِرَةِ فَمَا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلاَّ قَلِيلٌ، إِلاَّ تَنفِرُواْ يُعَذِّبْكُمْ عَذَاباً أَلِيماً وَيَسْتَبْدِلْ قَوْماً غَيْرَكُمْ وَلاَ تَضُرُّوهُ شَيْئاً وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ التوبة:٣٩..

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەوە چیتانە کاتێك بانگدەکرێن بۆ جیهاد لە ڕێی خوادا زەمین گیردەبن و دەلکێن بەزەویدا و لەشتان قورسە، ئایا ئێوە دنیا بە گرنگتر دەزانن لە ئاخیرەت، بێگومان ژیانی دونیا بەراورد لە گەڵ ژیانی ئاخیرەتدا زۆر کەم تەمەن و کەم خۆشیە..ئەگەر بۆجیهاد نەچن ئەوە سزایەکی زۆر بەئێشتان دەدات و کەسانێکی تر دەهێنێتە کایەوە لە غەیری ئێوە، بەمەش هیچ زیانێك بە خوا ناگەیەنن، خواش هەمیشە بە سەر هەمووشتێکدا دەسەڵاتدارە.

بەڵێ..ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەوڵ دەدات پەروەردەی بڕواداران بکات کە هەمیشە ورە بەرز و ئیرادەپۆڵایین بن..

لاوێکی موسڵمان بۆخوێندن دەچێت بۆ لەندەن و لەماڵی پیرێژنێکی ئینگلیزدا دەبێت، هەموو بەیانیەك پیرێژنەکە سەرنج دەدات ئەم لاوە بەوساردو سەرمایە لە خەو هەڵدەستێت و جێگەی گەرم و نەرم بەجێ دێڵێ و دەچێت بۆ مزگەوت بۆ نوێژی بەیانی، ڕۆژێك پێی دەڵێت: ئەوە ناکرێت خەو لە خۆت حەرام نەکەیت و دواتر هەستی، ئەویش وتی: ئاخر ئەوە خواوەند وای دەوێت و ناتوانم دوای بخەم، پیرێژنەکەش وتی: ئەوە ئیرادەیەکە ئاسن دەشکێنێ!

بەراستی هەروایە برواداران وبانگخوازان نەبێت ئیرادەیەکی ئاسن شکێنیان هەبێ و پشت بە خوا لە هەوڵ وکاردا بن بۆ گەیاندنی پەیامی خوا.

## لەنهێنی نهێنی تر:

ئیبن قەیم کە بانگخوازێکی خواناسی خاوەن ئەزموونە دەڵێت:

(وكم من مغروربستر الله عليه،مفتون بثناء الجُهال عليه، مُلَبس عليه بقضاء الله حوائجه، وهو عند الله ملعون ولا يشعر ).. واتە: چەندها کەس هەیە لەخۆی بایی بووە بەوەی کەخوا گوناهەکانی پەردە پۆش کردووە، تووشی فیتنە بووە بە شیعرو شانامە وپیاهەڵدانی نەفامەکان بۆی، کارەکانی لێشێواوە و، خۆی بەباش دەزانێ بەوەی کە خوا پێویستیەکانی بۆ جێبەجێ دەکات، لەڕاستیش دا ئەو کەسە لای خوا نەفرەتی لێکراوە و هەستی پێناکات..

ئالێرەوە پێویستە لەسەر هەریەکەمان کە بە خۆماندا بچینەوە بەشیعرو شانامەی کەس نەخەڵەتێین چونکە ئەوان ڕووکەشمان دەبینن وخۆمان چاکتر دڵ و دەروون و ناخی خۆمان دەناسین، ئاشکراشە شیعرو شانامەی خەڵك هیچ سوودی نیە و خوای گەورە سەیری سەروسیما وجەستەی مرۆڤ ناکات بەڵکو سەیری دڵ و کردەوەکانی مرۆڤ دەکات هەروەك پێغەمبەر (د.خ)دەفەرموێت:( إن الله لاينظر الى صوركم ولا الى اجسامكم ولكن ينظر الى قلوبكم ) ئاشکراشە کەخوا ئاگای لەخیانەتی چاوی مرۆڤە و ئەزانێ چی لە سنگیا شاردۆتەوە ﴿ يَعْلَمُ خَائِنَةَ الْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ﴾ غافر:١٩، ﴿يَعْلَمُ السِّرَّ وَأَخْفَى﴾ طه:٧.

واتە: خوا لەنهێنی و لەنهێنی نهێنی تریش ئاگادارە!!

کەسی وا هەیە ئەوەندە ڕاستگۆیە و بەدوای ڕاستگۆیی دا دەگەڕێت، تا لەلای خوا ناوی بەڕاستگۆ تۆمار دەکرێت، هی واش هەیە ئەوەندە درۆ دەکات

وبەدوای درۆدا دەگەڕێت تالای خوا بەدرۆزن ناوی تۆمار دەکرێت هەروەك لەفەرموودەدا هاتووە:

(عليكم بالصِّدقِ فإنَّ الصِّدقَ يَهدي إلى البرِّ وإنَّ البرَّ يَهدي إلى الجنَّةِ وما يزالُ الرَّجلُ يصدقُ،ويتحرَّى الصِّدقَ حتَّى يُكتبَ عندَ اللهِ صدِّيقًا وإيَّاكم والكذبَ فإنَّ الكذبَ يَهدي إلى الفجورِ، وإنَّ الفجورَ يَهدي إلى النَّارِ،وما يزالُ العبدُ يَكذبُ ويتحرَّى الكذبَ حتَّى يُكتبَ عندَ اللهِ كذَّابًا)_ترمذی، صحیح.

## ناتوانن هیچ لەخوا بشارنەوە:

﴿ أَلَا إِنَّهُمْ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ لِيَسْتَخْفُوا مِنْهُ أَلَا حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ (٥) وَمَا مِنْ دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ إِلَّا عَلَى اللَّهِ رِزْقُهَا وَيَعْلَمُ مُسْتَقَرَّهَا وَمُسْتَوْدَعَهَا كُلٌّ فِي كِتَابٍ مُبِينٍ (٦)﴾ هود.

ئەها! ئەوان (موشریکان) سینگەکانیان پێچ دەدەن و خۆخواردکەنەوە تا خۆ لە خودا بشارنەوە! ئەها! ئەوان کاتێ (لێفە و پەتوو ) جلکەکانیان بەخۆ دادەدەن و خۆیان دادەپۆشن، خودا دەزانێ ئەوەی بە دزی دەیکەن و دەیشارنەوە، وە ئەوەی بە ئاشکرا دەیکەن و بە ئاشکرا دەیلێن: بێگومان خودا لە (رازی دڵان) وە ئەوەی لەنێو سینگاندایە ئاگاداری ئاگادارە.

هیچ زیندەوەرێك لەسەر زەمیندا نیە مەگین کە رۆزی لەسەر خودایە (و لە دەشت و بیابان و شاخ و داخ و دەریا و ئاو، بژێوی پێدەگەیەنێ) وە دەزانێ بنکە و ژینگەی (رابواردنی پێش مەرگی) و ئارامگا و حەشارگای (دوای مەرگی) کوێیە. هەموو ئەوانە لە کتێبێکی دیار و روون (بە نێوی لەوحی مەحفووز) دایە.

## خوا ئەزانێت چی لەدڵی هەموو خەڵکی جیهاندایە:

- ﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللَّهِ وَلَئِنْ جَاءَ نَصْرٌ مِنْ رَبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمْ أَوَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِمَا فِي صُدُورِ الْعَالَمِينَ ﴾ العنكبوت:١٠.

واتە: هەندێك لەخەڵكی هەن كە دەڵێن: باوەڕمان بەخوا هێناوە، جاكاتێك یەكێك لەوانە لەپێناوی خوادا تووشی ئازارو ناخۆشی كرا بەرگەناگرێت وئارامی نیە و وادەزانێت سزاو ئەشكەنجەی خەڵكی وەك سزای خوا وایەو، واز لە دین دێنێت، ئنجا ئەگەر پەروەردگارت سەركەوتنێكی بەخشی، دووڕوەكان بەگەرمی دەڵێن: خۆئێمەش بێگومان لەگەڵتان بووین و هاوكارتان بووین، (بۆئەوەی بچنە پێشەوەو غەنیمەتیان دەست بكەوێت)، مەگەر خوا خۆی نازانێت چی لەدڵی هەموو خەڵكی جیهاندا هەیە؟!

- ﴿ وَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْمُنَافِقِينَ﴾ العنكبوت:١١. (سوێند بێت خوا ئاگادارە بەوانەی باوەڕیان هێناوە، هەروەها ئاگادارە بەوانەش كەدووڕوون و ڕاست ناكەن)..

- ﴿ يَعْلَمُ مايَلَجُ في الارض وما يَخْرُجُ منها ومايَنْزِلُ مِن السَّماءِ ومايَعْرُجُ فيها وهو الرحيم الغفور ﴾ السبأ:٢. واتە: خواوەند دەزانێت چی دەچێت بەناخی زەویداو چیشی لێ دێتە دەرەوە و، چی لەئاسمان دێتە خوارەوەوچیش پیایدا بەرزدەبێتەوە، بەڕاستی ئەو خوایە میهرەبان و لێخۆش بووە..

- ﴿ يَعْلَمُ مايَلَجُ في الارض ومايَخْرُجُ منها ومايَنزِلُ من السماءِ وما يَعْرُجُ فيها وهو معكم أينما كنتم والله بما تعلمون بصير ﴾ الحديد: ٤. واتە:خواوەند دەزانێت چی دەچێت بەناخی زەویدا و چیشی لێ دێتە دەرەوە، چی لە ئاسمان دێتە خوارەوەو چی پیادا سەردەكەوێت،جالەهەر شوێنێكدا بن ئەوزاتە لەگەڵتاندایەو پێتان دەزانێت،دڵنیا بن كەخوا بەهەموو ئەو كارو كردەوانەی ئەنجامی دەدەن بینایە.

## دلّنیابەخوا(سمیع.بصیر.علیم.قریب.مجیب)ە

### یەکەم:

عەبدولاّی کوڕی موبارەك کە ساڵی (١٨١) کۆچی دونیای بەجێهێشتووە،لە جەنگێکدا موجاهیدێك دەبینیّ زۆر خەمبارە بۆ ئەسپەکەی کەمرداربۆتەوە، ئەمیش دڵی ئەداتەوەوئەڵێ: پێم دەفرۆشیت بە ٤٠٠ درهەم؟؟ کابرا دەڵێ باشەو پارەکە وەردەگرێت. شەویّ لەخەویا دەبینێت کە ئەسپەکەی حەوت سەد ئەسپی بەدواوەیە، دەچیّ بۆلایان، پێی دەڵێن: تادوێنیّ هی تۆ بوو، ئێستا هی عەبدولاّی کوڕی موبارەکە. بۆبەیانی دێتە لای عەبدولاّی کوڕی موبارەك و ئەڵێت: خەوێکی وام دیوە نایفرۆشم، ئەویش پارەکەی لێوەرناگرێتەوەو دەڵێ: ئەوەی تۆ بەخەودیوتە ئێمە بەچاو بەرۆژی رووناك دیومانە.واتە ئێمە هەمیشە ئەوپاداشتەمان لەبەرچاوەو لێی دڵنیاین. جا منیش دەپرسم ئاخۆ چەند دڵنیاین لە پاداشتی قیامەت، ئەگەر دڵنیاین ئەی بۆ وا ساردو سڕوکەم هیممەتین؟؟

زاهیدی بەسرە تەلق کوڕی حەبیب دوعای دەکردو دەیووت:(اللهم انی أسألُك تَوَكُلَ الموقنين بك، ويقين المُتوكلين عليك ).

دڵنیابە خوا وەعدی خۆی دەباتە سەر( ومن أوفى بعهده من الله )، (ومن أصدق



من الله قيلا)، نەبەخوا کەس وەك ئەو زاتە پایەبەرزە ناتوانێ بەوەفابێت لە بردنە سەری وەعدەکانیدا، چونکە هەرچی لەبوونەوەردایە بەندەو دروستکراوی ئەوە.بۆنموونە ١٤٣٩ ساڵ لەمەوبەر کە خۆشەویست (د.خ) مەککەی بەجێهێشت خوا وەعدی دایە خۆی و دینەکەی سەردەخات و دینەکەی بەرۆژهەلات و رۆژئاوادا بلاّودەبێتەوە، ئاخر ئەم پەیمانە بۆمرۆڤ ئاسان نیە.

ئەزانن ئیمبراتۆریەتی فارس و رۆم خاوەنی چی بوون، زۆر لە ئەمریکاکەی ئەمرۆ بەهێزتربوون، خاوەنی شارستانیەتی هەزاران ساڵەبوون، دونیایان دابەشکردبوو،ئەوە نەخشەی قەڵەمرەوی رۆمەکان بزانن تاکوێ بووە، رۆما کەپایتەختیان بوو تەمەنی ٢٥٠٠ ساڵە، پەیمانەکەی خوا هاتە دی و ئیسلام گەیشتۆتە دڵی مەسیحیەت لەرۆماو ساڵی ١٩٧٤ سی هەزارمەتر دووجا زەوی درا بۆمزگەوت و ساڵی ١٩٨٤ بەردی بناغەی بۆدانراو ساڵی ١٩٩٥ ئیفتتاح کرا کە گەورەترین مزگەوتی ئەورووپایە، جا هەروەك ئەو پەیمانە هاتەدی وموسڵمانانی پێشین نەیاندی من وتۆ لەم سەردەمەدا بەچاوی خۆمان دەیبینین ئاوەهاش هەموو ئەوانەی ماون لەدونیاو قیامەتدا دڵنیابن دێنە دی.



**دووەم:** دکتۆر سەلمان فەهد عۆدە دەڵێت: خوایە یەقینی کچە منالەکەم بدەری!! ڕۆژێك گوێم لێبوو دوعای کرد و وتی: خوایە باران، چەند دڵۆپێك باری..

وتی: خوایە زیاتری بکە، زیاتر باری وەدەمو چاوی تەڕکرد، وتی: خوایە زیاتر بارانەکە زیاتر بوو، زۆری پێخۆشبوو، وتی خوایە سوپاس بۆتۆ، دڵنیا بوو کەبۆ ئەو باریوە، تۆ بڵێ ی وابێت؟؟ جا کێ دەڵێ وانیە؟؟

دکتۆر لۆرەنس براون پسپۆڕی چاوەوئەمریکیە وئێستا لەمەدینە دائەنیشێت بۆی گێڕامەوە، کچە تازەبووەکەیان دڵی تەواونەبوو، لەخەستەخانە شین و مۆربۆوەو دکتۆرەکان بێهیوابوون لێی، ئەمیش دەچێتە ژوورێکی چۆڵەوەو چارەکێك لەخوا دەپاڕێتەوەو دەڵێت: خوایە ئەگەرهەیت و گوێت لێمە کچەکەم بۆچاك بکەرەوە، پەیمان بێت ئاینی ڕاست بدۆزمەوە، دوایی هاتەوە لای دکتۆرەکان بەفەزڵی خوا کچەکەی چاکبوو، دکتۆرەکان کەوتبوونە تەفسیراتی پزیشکی بۆی ئەمیش دڵنیابوو خوا شیفای داوە بۆی، ئەمەش بووە هۆی موسڵمانبوونی.

ئەبو ساڵحیش دکتۆرێکی پاکستانیەو یەکێکە لە قوتابیەکانم، لەبەریتانیا دائەنیشێت،باوکی پیربوو سەردانم کرد، ئەبوساڵح بۆی گێڕامەوە کە لەکاتی لاویدا گوناهێك دەکات و تەوبە دەکات و دێتە مەککەو زۆر دوعادەکات کەخوا نیشانەیەکی پیشان بدات کە تەوبەکەی قبوڵکردووە، دەگەڕێتەوە لەندەن، کەدەچێ بۆمزگەوت،کابرایەکی ڕەش دەبینێت بۆلەی دێت.ئەڵێ: هاچیتە؟ ئەڵێ: داوام لەو ئیمامەکردووە فێری ئیسلامەتیم بکات، دەڵێ: ئەبێ فێری پاکستانی ببیت، ئاخر من ئیشم بەزمانی ئەو چیە؟؟

دەڵێ: وەرە من فێرت دەکەم، دائەنیشێ لەگەڵیاو فێری ئیسلام ونوێژو فاتیحەی دەکات و هەر لەو مەجلیسەدا دەیان کەسی تر موسڵمانبوون، ئەبوساڵح زۆردڵی خۆش بوو وتی: پشت بەخوا ئەوە تەوبەکەم قبوڵ بووە بۆیە خوا ئەو دەرگایەی لێکردمەوە.. ئەوەش وێنەی،دکتۆر لۆرنس براون:



## زۆرمان ماوە بگەینە یەقین:

لەهاوەڵاندا کەسی وایان هەبوو دەیوت: ئەوەندەم یەقین هەیە ئەگەر خوای گەورەش ببینم زیادناکات.. یا الله ئەوە چ پلەیەکە؟؟

یان هی وایان هەبوو ئەگەر بیزانیایە سبەینێ قیامەتە هەرئەو ئیشەی دەکرد کەدەیکردو هیچی تر نەمابوو بیکات!

ئەوەی من تێگەیشتووم پاش تەمەنێك دینداری ئەمەیە، ئایا دڵنیایت خوا (سمیع، بصیر،علیم، قریب مجیب)ە، ئەگەر بەڕاستی تێی گەیشتوویت و دڵنیایت، ئایا ئەمە لە ژیانتا ڕەنگی داوەتەوە؟ ئەوەتا خۆشەویست (د.خ) دوعا دەکات کەخوا یەقینێکی بداتێ موسیبەتەکانی دونیای لەسەر سووك بکات، تۆ لەسەری سووك

کردویت؟، یان داوادەکات (اللهم انی أسألك یقینا صادقا)، ئایا یەقینەکەت لە راستەکانە؟؟

ساڵی ١٩٦ ی کۆچی لەخەلافەتی عەباسیدا (عەبدوڵای کوڕی ئەغلەب) ببوە ئەمیرو ستەمی دەکرد، زانای ناوداری ئەو کاتە(حفص کوڕی حەمید)هاتە لای و وتی: جەنابی ئەمیر گەنج و جوانیت لەخوابترسەو ستەم مەکەو باج و خەراج و سەرانە لەسەر خەڵك هەڵگرە. بترسە خوا لاشەت بسوتێنێ، پەیڕەوی قورئان و سوننەت بکە.

ناوبراو بەگوێی نەکردو خراپتربوو. شێخ حفص بەخەڵکەکەی وت: لە مەخلوق بێهیوابین لە خالق بێهیوا نابین، دوای نوێژی خەوتنان بەکۆمەڵ دوعایان لێکرد، تووشی برینێك بوو لەژێر گوێیدا کەهەقی نەبیست پاش پێنج ڕۆژ کوشتی.

## پەنجەرەی سەرغەیب:

خەوی راست کە پەنجەرەیەکە لەسەرغەیب و بەشێکە لە چل وشەش بەشی وەحی، کەدوای خۆشەویستمان وەحی نەما، ئەوە خەوی راست بۆ موبەشیراتەو ئەمەش مەسەلەیەکی هەستیارەو دیارە هەموخەوێك ناگرێتەوە، بەڵام شتی سەیر هەیەو بەڵگەیە کەئێستاو رابردوو داهاتوو لای خوا هەمووی کەشفەو ئەگەر بیەوێت پیشانی کەسانێکیشی ئەدات و پاش ماوەیەك ئەوەی بینیویانە دێتە دی بۆنموونە:

کاك جەمالی ژن برام ساڵی ١٩٨٨ تووشی نەخۆشی پرۆستات بوو بوو، هەر لەسەرەتاوە خەوێکی سەیری بینی، لەخەویا لەحەوشەو گەراجەکەیان لە بەغدا ژنانی عەبا بەسەر دانیشتبوون و پورزایەکی تابووتێك دێنێ لەگەڵ چەندکەسێکی

ترداو ئەزانێ کەبۆ ئەمیان هێناوە، لەهەمان کاتدا تابووتێکی تریش دەکەن بەژووورداو لەتەنیشت ئەوی ترەوە دای ئەنێن.

سبحان الله دوای چەند ساڵێك خەوەکە هاتەدی ئەو رۆژەی ئەم لەبەغدا کۆچی دوایی کرد خوشکە گەورەکەشی لەسوید وەفاتی کردو هەردوکیان لەسلێمانی یەك تەعزیەیان بۆدانان. ئەمەش بەڵگەیەکی ئاشکرایە کەلای خوا هەمووشت نووسراوەو رابردووئێستاو داهاتوو لای ئەو زاتە پایەبەرزە وەك یەکە.

***




لەپەیجی ئەندازیار عوسمان وەرگیراوە

## خوا هەموو دروستکراوەکانی ئەبینێت:

قورئانی پیرۆز سەرنجمان ڕادەکێشێت بۆ باڵندە و فڕینەکەی کە چۆن خوای گەورە لەشی وا دروستکردووە کە بەئاسمانا بفڕێت و نیزامێکی تایبەتی وای بۆداناوە کە ژیانی ئاسان بێت، هەروەك دەفەرموێت: ﴿ أولَم يَرَوا إلى الطيرِ فوقَهُم صافات ويقبضن ما يُمسكهُن إلا الرحمنُ إنهُ بِكل شيءٍ بصير﴾ الملك:١٩.

واتە: ئایا سەرنجی باڵندەیان نەداوە بەسەریانەوە پۆل پۆل دەفڕن و باڵەکانیان لێك دەنێن، ئەو باڵندانە جگە لەخوای میهرەبان کەس بەئاسمانەوە ڕاگیریان ناکات، بە ڕاستی ئەو زاتە بەهەموو شتێك بینایە و هیچی لێ ون نابێت و چاودێری هەموو دروست کراوەکانی دەکات.

باڵندەی (زەقزاق)ی ئاڵتونی: کۆچ دەکات لە (ئالاسکا)وە بۆ دوورگەکانی (هاوای) بۆئەوەی زستانی تیا بەسەر بەرێت، جا لەبەرئەوەی لە ڕێگاکەیدا دوورگەی تر نیە، ناچارە چوار هەزار کیلۆمەتر بەیەك جار ببڕێت و نزیکەی دووسەد و پەنجا هەزار جار باڵ بدات بەیەکدا و ئەم گەشتەشی (٨٨) سەعات دەخایەنێت..

کێشی ئەم باڵندەیە لەسەرەتای کۆچ کردندا (٢٠٠)گرامە کە (٧٠)گرامی چەوری یە و بۆ وزە بەکاری دەهێنێت، جا ئەگەر بڕی ئەو وزەیەی پێویستێتی بۆ ئەم گەشتە حسابی بکەین دەبینین پێویستی بە هەشتا ودوو گرامە، واتە دوانزە گرامی کەمە بۆئەوەی گەشتەکەی تەواو بکات..

خوای گەورە وای دروست کردوون کە بەشێوەی (٧) بفڕن و بەوەش کەمترین وزە سەرف دەکا و لەسەدا بیست و سێی وزەکەی بۆ دەگەڕێتەوە، واتە لەجیاتی ئەوەی وزەی لێ ببڕێت، نزیکەی شەش گرام چەوریشی زیاد دەبێت کە دەتوانێت بۆ حاڵاتی (طواری) سوودی لێوەرگرێت ( ل٥٢ التصميم في الطبيعة –هارون يحيى)..

## نهێنیەکانی ئاسمان وزەوی لای خوا ئاشکرایە:

﴿ قَالَتِ الأَعْرَابُ آمنَّا قُلْ لَم تُؤمِنوا ولكِنْ قُولوا أسْلَمْنَا ولَمَّا يَدْخُلِ الإيمانُ في قُلوبِكُمْ وإنْ تُطِيعُوا اللّه ورَسُولَهُ لا يَلتكُم مِنْ أعمالِكُمْ شَيئَاً إنَّ اللّه غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ الحجرات: ١٤.

واتە: هەندێك لە عەرەبە دەشتەکیەکان وتیان: باوەڕمان هێناوە، پێیان بڵێ: نەخێر، باوەڕتان نەهێناوە، بەڵام بڵێن: بەناچاری موسوڵمان بووین، هێشتا باوەڕ نەچۆتە ناو دڵەکانتانەوەو تیایدا جێگیر نەبووە، خۆ ئەگەر بەڕاستی ئێوە گوێڕایەڵی فەرمانی خواو پێغەمبەر بن، ئەوا خوای گەورە لە پاداشتی چاکەکانتان هیچ کەم ناکاتەوە، چونکە بەڕاستی خوا لێخۆشبووی میهرەبانە.

ئینجا قورئان دێتە سەرباسی بڕواداری ڕاست و دروست و تەواو ﴿ إنَّما الْمُؤمِنُون الَّذينَ آمَنُوا باللهِ ورَسُولِه ثُمَّ لَمْ يَرتابُوا وجَاهَدُوا بأَمْوالِهِم وأنفُسِهِم في سَبيلِ اللهِ أُولئِكَ هُمُ الصَّادِقُون ﴾ الحجرات:١٥. واتە: بێگومان بڕوادارانی ڕاست ئەوانەن کە باوەڕیان بەخواو پێغەمبەرەکەی هێناوەو پاشان نەکەوتونەتە هیچ گومان و دوودڵیەکەوە، بەخۆیان و سەروماڵیشیانەوە تێکۆشاون لەپێناو ئاینی خوادا، تەنها ئائەوانە ڕاستن.

ئنجا دەفەرموێت: ﴿ قُلْ أتُعَلِّمُونَ اللّه بِدِينِكُم واللّهُ يَعْلَمُ ما في السَّماواتِ وما في الأرضِ واللّهُ بِكُلِّ شيءٍ عَليمْ ﴾ الحجرات:١٦. واتە: ئەی محمد (د.خ) پێیان بڵێ: ئایا ئێوە خوای گەورە لەئاینی خۆتان ئاگادار دەکەن و دەڵێن بڕوادارین، لەحاڵێکدا (ئێوە قسە بکەن یان نەیکەن) خوا ئاگادارو زانایە بەهەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، خوا بەهەموو شتێك زاناو ئاگادارە؟!

ئنجا کە خوا بەهەموو شت ئاگادارەو دەزانێ ئیمان و بڕواکەیان چۆنە دەفەرموێت:

﴿ يَمُنُّونَ عَلَيكَ أنْ أسلَمُوا قُلْ لاتَمُنُّوا عَلَيَّ إسْلامَكُمْ بَلِ اللّٰهُ يَمُنُّ عَليكُمْ أنْ هَدَاكُمْ للإيمَانِ إنْ كُنتُمْ صادِقِينْ، إنَّ اللهَ يَعْلَمُ غَيبَ السَّماواتِ والأرضِ واللهُ بَصِيرٌ بِما تَعمَلُونْ﴾ الحجرات:١٨. واته: ئەوانە منەت دەکەن بەسەر تۆدا کە موسوڵمان بوون، پێیان بڵێ: منەتم بەسەردا مەکەن کەموسوڵمان بوون، بەڵکو خوا منەت دەکات بەسەر ئێوەدا کە هیدایەتی داون بۆ ئیمان و باوەڕ ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن لەئیمانەکەتاندا، بەڕاستی خوا نهێنی و شاراوەکانی ئاسمان و زەوی دەزانێت، هەروەها خوا بینایە بەهەموو ئەو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن..

بەڵێ: خوای گەورە مسقاڵە زەڕەیەك و کەمتر لەوەشی لێ ون نابێت لەم گەردوونە بەر فراوانەداو ئاگای لە ئیمان و بڕوای بڕوادارانەو ئەشزانێ کێ بەڕووکەشی موسوڵمان بووەو ئیمانی دانەمەزراوە، جا بۆیە با هەوڵ بدەین دڵ و دەروونمان بەچاکی ئیمان بچێژێ و، دوودڵی و ڕاڕایی واز لێبهێنین و ئێمەش وەك عەرەبە دەشتەکیە نەفامەکان منەت نەکەین و، بزانین کە خوا خاوەن منەت و فەزڵە بەرامبەر بەئێمەو هەردەم سوپاس گوزاربین.

## خوا ئاگاداری پیلانی دووڕووەکانە

کاتێك کافرانی قوڕەیش و هاوپەیمانەکانیان هاتنە سەرمەدینەو فشارێکی زۆریان خستە سەر شارو، لەپشت چاڵەکەوە مۆڵیان خوارد و، هەوڵی هێرش هێنانیان بوو بۆسەر مەدینە، ئالەو کاتەدا ئەوانەی دووڕوو بوون و دڵیان نەخۆش بوو کەوتبوونە پڕوپاگەندەکردن و دڵ ساردکردنەوەی خەڵکی، قورئان دەفەرموێت: ﴿ يا أيُّها الَّذِينَ آمَنُوا اذكُرُوا نِعمَةَ اللهِ عَلَيكُم إذ جاءَتكُمْ جنُودُ فَأرسَلنا عَلَيهِم رِيحاً وَجنُوداً لَم تَرَوها وَكانَ اللهُ بِما تَعمَلُونَ بَصِيراً، إذ جاءُوكُمْ مِنْ فوقِكُمْ ومِنْ أسفَلَ مِنكم وإذ زاغَتِ الابْصارُ وبَلَغَتِ القُلوبُ الحناجِرَ وتظنُّونَ

باللهِ الظنونا، هنالك أبْتُليَ المؤمِنونَ وزُلْزِلوا زِلزالاً شديداً، وإذ يقولُ المنافِقون والذين في قلوبهم مَرَضٌ ماوعَدَنا اللهُ ورَسولُهُ إلاّ غُروراً ﴾ الأحزاب:٩.

واته:ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە یادی نیعمەتی خوا بکەنەوە لەسەرتان (مەبەست جەنگی خەندەقە کەخوای گەورە فریای ئیمانداران کەوت)، کاتێك سەربازانی کوفر هاتنە سەرتان، ئێمەش ڕەشەبایەکی بەهێزو سەربازانێکمان ناردە سەریان کە نەتاندەبینین، خوای گەورە بینابوو بەهەوڵ و کۆششتان، کاتێکیش دوژمنان لەسەروخوارتانەوە هاتنە سەرتان کاتێکیش چاوەکان ئەبڵەق بوون، دڵەکان گەیشتبوونە گەروو، گومانی جۆراو جۆرتان دەبرد بە بەڵێنەکانی خوای گەورە (بەسەرکەوتنی بڕواداران).

لەوێدا ئیمانداران تاقیکرانەوەو تووشی تەنگانەو سەختیەکی زۆر توندو بەهێز بوون و تووشی دڵە لەرزەیەکی زۆر سەخت کران.

کاتێکیش دووڕووەکان و ئەوانەی دڵیان نەخۆشی گومانی تیابوو دەیانووت: بەڵێنی خواو پێغەمبەرەکەی تەنها بۆ خەڵەتاندن نەبێ هیچی تر نەبوو؟!

## بڕواداران و دڵنیایی بەرامبەر بەڵێنی خوا

خوای پەروەردگار کە ئاگاداری بەندەکانیەتی لە بارەی هەڵوێستی بڕوادارە تەواوەکانەوە لەجەنگی خەندەق دا دەفەرموێت: ﴿ ولَمّا رَءا المؤمنون الاحزاب قالوا: هذا ماوعدَنا اللّهُ ورَسُولُهُ وصَدَقَ اللهُ ورَسُولُهُ، ومازادَهُمْ إلاّ إيماناً وتسليماً، مِن المؤمنين رجال صَدَقُوا ماعاهَدوا اللهَ عليه، فَمِنْهُمْ مَنْ قضى نَحْبَهُ ومِنهم مَنْ يَنتظِرُ وما بَدَّلُوا تبديلا﴾ الاحزاب: ٢٢-٢٣. واته:کاتێك بڕواداران ئەو هەموو دەستەو تاقمەیان بینی کەهاتبونە سەریان وتیان: ئەمە ئەوەیە کە خواو پێغەمبەرەکەی بەڵێنیان پێداوین، کەئاوا دژایەتی ئاینەکەی دەکرێت و کافران و

دووڕووەکان پیلان دادەنێن بۆ ڕیشەکێشکردنی، دیارە کەخواو پێغەمبەرەکەی ڕاستیان فەرموو لە پێشهاتنیدا، بێگومان ئەودژایەتیە باوەڕ و ملکەچی نەبێت هیچی تری بۆ زیاد نەکردن (واتە سوورتربوون لەسەرئیمان)...

پیاوانێکی زۆرهەن لەئیمانداران ئەو پەیمانەی داویانە بەخوا، ڕاستیان کرد، لەسەری ژیان و پابەندبوون پێوەی ولایان نەدا لێی، جاهەیانە پەیمانەکەی بەجێگەیاندو مرد لەسەری، هەشیانە چاوەڕوانە، بەهیچ شێوەیەك نەگۆڕان و لاری ڕووی تێنەکردون.

بەڕاستی ئەم دوو هەڵوێستە بەردەوام دووبارە ئەبێتەوە، بڕواداره ڕاستەکان دڵنیان لەوەی کەکێشمەکێشی نێوان هەق وناهەق بەردەوامەوئەگەر بۆ ماوەیەکیش بەری خۆری ئیسلام بگیرێت، ئەوە کاتیەو خۆری ئیسلام تارۆژی قیامەت ئاوانابێت وخوای گەورەش دەیەوێ بڕواداران کاربکەن بەڕاستی بۆخواو سەرەنجامیش تەنها بەدەست خوایە کە بەڵێنی سەرکەوتنی داونەتێ.

دووڕووەکانیش هەمیشە وان لە دوودڵی و ڕاڕاییداو گومانیان هەیەو گومانیش بۆ دەوروبەریان دروست دەکەن، گوایە ئیسلام بەسەرچووەو جارێکی تر ناتوانێ ڕۆڵی خۆی لە ژیاندا ببینێتەوە.

﴿ فَإِنْ آمَنُوا بِمِثْلِ مَا آمَنتُمْ بِهِ فَقَدْ اهْتَدَوا وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ فَسَيَكْفِيكَهُمْ اللَّهُ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ * صِبْغَةَ اللهِ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنْ اللهِ صِبْغَةً وَنَحْنُ لَهُ عَابِدُونَ * قُلْ أَتُحَاجُّونَنَا فِي اللهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ وَلَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُخْلِصُونَ * أَمْ تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطَ كَانُوا هُودًا أَوْ نَصَارَى قُلْ أَأَنْتُمْ أَعْلَمُ أَمْ اللهُ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ كَتَمَ شَهَادَةً عِنْدَهُ مِنْ اللهِ وَمَا اللهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ البقرة: ١٤٠.

واتە: ئەگەر ئەوان (ئەهلی کیتاب) باوەڕیان هێنا، وەك ئەوەی ئێوە باوەڕتان پێهێناوە، ئەوە بەراستی مانای وایە ڕێبازی هیدایەتیان دۆزیوەتەوە، بەلام ئەگەر پشتیان تێکرد، ئەوە بێگومان دەکەونە دژایەتی و دووبەرەکیەوە، بەلام دڵنیابە ئەی محمد (د.خ)، ئەی برِوادار، خوا دەتانپارێزێت لە پیلان و تەڵەکەیان، چونکە خوا بیسەر و زانایە..ئەم ئاین و بەرنامەیە ئەو ڕەنگ و نەخشەیەیە کە خوا دایڕشتووە، کێ هەیە لە خوا چاکتر ڕەنگ و نەخشەی جوان بکێشێت و دایڕێژێت، لە هەموو بارودۆخێکدا ئێمەی ئیماندار هەرئەو دەپەرستین.

هەر لە زەمانی خۆشەویست دا (د.خ) ولەدوای غەزای بەدر کەسانێکی ناحەزو لاواز دەیانووت (محمد ) (د.خ): غەنیمەتی بۆخۆی لاداوە،ئەمەش ڕەنگی دایەوە لەسەر هەندێ لە تیرهاوێژان لەجەنگی ئوحودا کەخێرا بێنە خوارێ وغەنیمەت کۆبکەنەوە نەك بەشیان نەمێنێ و دوایی لێی لابدرێ، قسەو قسەلۆك ئەوەندە زۆر بوو کە قورئان لەسەری هاتە جواب و فەرمووی:

﴿ وَما كانَ لِنَبيّ أن يَغُل وَمَن يَغلُل يَأتِ بِما غَلَّ يَومَ القِيامَةِ ثُمَّ تُوفَى كُلُّ نَفسٍ مَّاكَسَبَتْ وَهُم لايُظلَمُون* أَفَمَنْ اتَّبَعَ رِضوانَ اللهِ كَمَن باءَ بِسَخطٍ مِّنَ اللهِ وَمأواهُ جَهَنَّمَ وَبِئسَ المَصيرِ* هُم دَرَجاتٌ عِندَاللهِ وَاللهُ بَصيرٌ بِما يَعمَلُون* لَقَدْ مَنَّ اللهُ عَلى المُؤمِنينَ إذ بَعَثَ فِيهِم رَسُولًا مِّن أَنفسِهِمْ يَتلُو عَلَيهِم آياتِهِ وَيُزَكِهِم ويُعَلِمُهُمُ الكِتابَ وَالحِكمَةَ وَإن كانُوا مِن قَبلُ لَفِي ضَلالٍ مُّبين ﴾ ال عمران: ١٦٤.

واتە:بێگومان بۆهیچ پێغەمبەرێك نەبووە کە نادادی و خیانەت بکات و غەنیمەت بۆخۆی لا بدات،هەرکەس کاری وا بکا لە ڕۆژی قیامەت دا ئەوەی لای داوە و ئەو ناهەقیەی کردویەتی بە کۆڵیەوەیەتی،لەوەو دوا پاداشتی هەرکەسێك بەگوێرەی کردەوەکانی دەدرێتەوە و ئەوانە ستەمیان لێ ناکرێ،ئایا ئەو کەسەی شوێنی ڕەزامەندی خوا کەوتبێت وەکو ئەو کەسە وایە کە بەهۆی

گوناه و تاوانەوە شایستەی خەشم وقینی خوا بێت؟ بێگومان شوێنی ئەو جۆرە کەسانە دۆزەخە کە سەرەنجامێکی ناخۆشە.

هەریەك لەو دوو دەستەیە پلەوپایەی خۆی هەیەلای خوا ( لە بەهەشت یان لە دۆزەخدا ) بەڕاستی خوا بینایە بۆ ئەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن، سوێند بێت بێگومان خوا منەتی ناوەتە سەر ئیمانداران کاتێ پێغەمبەری بۆڕەوانە کردوون لەخۆیان، ئایەتەکانی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوە ودڵ ودەروونیان پاك و پوخت دەکاتەوە، هەروەها فێری قورئان و دانایان دەکا، بە ڕاستی پێشتر لە گومڕاییەکی ئاشکرادا ڕۆچووبوون....

ئاشکرایە لەناو کۆمەڵگای ئیسلامیدا دووڕوو هەبوون، قورئان هەوڵی چارەسەری دەدا و، ئەسڵ لەناویاندا پەردەپۆش کردن بوو،خۆشەویست (د.خ)کەخوا ناوی دووڕووەکانی بەوەحی پێڕاگەیاندبوو تەنها لای (کاتم سر ) حوزەیفەی کوڕی یەمان باسی کرد بۆئەوەی فیتنەی زیاتری لێ نەکەوێتەوە.

دووڕووەکان ئازاری زۆری پێغەمبەر (د.خ) و موسوڵمانانیان دا، تەنانەت بوختانیان بۆ خاتوو عائیشە کرد، ڕووداوەکە ئەوەندە کاریگەر بوو، قورئانی لەسەر دابەزی و موسوڵمانانی تەمێ کرد کە جارێکی تر بەقسەی ئەم وئەو بڕوا نەکەن و،ئەو جۆرەشتانە بە کەم نەزانن چونکە دەم وەردان لە ناموس و شەرەفی خەڵکی لای خوا گرانە﴿إِذْ تَلَقَّوْنَهُ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُمْ مَا لَيْسَ لَكُمْ بِهِ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُ هَيِّنًا وَهُوَ عِنْدَ اللَّهِ عَظِيمٌ (١٥) وَلَوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُمْ مَا يَكُونُ لَنَا أَنْ نَتَكَلَّمَ بِهَذَا سُبْحَانَكَ هَذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ (١٦) يَعِظُكُمُ اللَّهُ أَنْ تَعُودُوا لِمِثْلِهِ أَبَدًا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ (١٧) ﴾النور .

واتە:ئەوە بۆهەردەماو دەم قسە لە زمانی یەکتر وەردەگرن بێ لێکدانەوە،کاتێك بەزارتان شتێك دەڵێن کە هیچ ئاگاداری نین،ئێوە وادەزانن ئەو بوختانە شتێکی ئاسانە؟لە کاتێکدا ئەوە لای خوا زۆر گەورەو ناقولآیە،دەبوایە کاتێ گوێتان لەو بوختانە بوو، بتانووتایە: ئێمە بۆمان نیە قسەی وا بکەین،پاکی وبێگەردی بۆخوایە،ئاخر ئەمە بوختانێکی زۆر گەورەیە،خوا ئامۆژگاریتان دەکات کە هەرگیز شتی وا دووبارە نەکەنەوە ئەگەر ئێوە بڕوادارن.

بەڵێ.. لەکۆمەڵگای ئیسلامیدا کەسانێك هەبوون کە ئاگری فیتنەیان دادەگیرسان و لەهەل دەگەڕان خوا کەزانایەو ئاگاداری دڵەکانە لە بارەیانەوە دەفەرموێ ﴿لَوْ خَرَجُوا فِيكُمْ مَا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا وَلَأَوْضَعُوا خِلَالَكُمْ يَبْغُونَكُمُ الْفِتْنَةَ وَفِيكُمْ سَمَّاعُونَ لَهُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ (٤٧)﴾ التوبة ئەگەر دووڕووەکان دەرچونایە بۆغەزاو لەناوتاندا بوونایە هیچیان بۆئێوە زیاد نەدەکرد بێجگە لەسستی نەبێ ودەستیان دەکرد بە چرپە چرپ لەناوتانداو دەگەڕان بۆ دۆزینەوەی کەلێنێ لەنێوانتاندا بەئاواتی هەڵگیرسانی فیتنەوئاشوب، کەسانێکیش هەن لەناو ئێوەدا گوێیان بۆدەگرن،خوای گەورەش ئاگادارە بە کاروکردەوەی ستەمکاران..

## خوا ئاگادارە لە پێ دزەی دووڕووەکان بۆخۆ دزینەوە:

﴿ لَا تَجْعَلُوا دُعَاءَ الرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَاءِ بَعْضِكُمْ بَعْضًا قَدْ يَعْلَمُ اللَّهُ الَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنْكُمْ لِوَاذًا فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَنْ تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ (٦٣) أَلَا إِنَّ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ قَدْ يَعْلَمُ مَا أَنْتُمْ عَلَيْهِ وَيَوْمَ يُرْجَعُونَ إِلَيْهِ فَيُنَبِّئُهُمْ بِمَا عَمِلُوا وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ (٦٤)﴾ النور.

واتە: بانگکردنی پێغەمبەر (بۆ کۆبوونەوە بۆ کارێکی گرنگ ) لەنێو خۆتاندا، وەکو بانگکردنی هەندێکتان لە هێندێکتان حیساب مەکەن. بێ گومان خودا ئاگادارە لە ئەو کەسانەی خۆ دەدزنەوە لەچوون بۆ جیهادو خۆیان پەنا دەدەن و بێ دزەی دەرباز بوونیانە (تا پێغەمبەر نەیان بینێ و لە دەرچونیان ئاگادار نەبێ). جا ئەوانەی دژی فەرمانی ئەو دەجوڵێنەوە و لە فەرمانی خوا نافەرمانی دەکەن، بترسێن لە ئەوەی بەڵایەکیان بەسەر بێ، یان عەزابێکی بەژان و ئۆف یەخەیان بگرێ (وەکو قاتی و قڕی و موسیبەتەکانی دیکەی جیهان، وە جەهەنەم و جەزرەبەکانی ڕۆژی پەسڵان).

ئاهای (ئەی خەڵکینە، ئاگادار بن و بزانن) ئەوەی لە ئاسمانان و لە زەمین دایە هی خودایە. خودا دەزانێ ئەوەی (ئێستا ئەی خەڵکینە) ئێوە لەسەرنی و دەیکەن، وە ڕۆژێك کە دەگێڕدرێنەوە بۆلای ئاگاداریان دەکا لە ئەوەی کردویانە (و سەزا و پاداشتی وتار و ڕەفتاریان دەداتەوە). وە خودا لە هەر شتێك ئاگاداری ئاگادارە (و ئەحواڵ و ئەوزاع و موافەقەت و موخالەفەت و ئیخلاس و نیفاقی هیچ کەس لەخودا ون نابێ).

## فێڵ لەخوا ناکرێت

هەندێ کەس وا دەزانێت ئەگەر توانی شتێك لەخەڵکی بشارێتەوە دەتوانێت لەخواشی بشارێتەوە، یان بەمانایەکی تر چۆن هەندێ خەڵکی دەخەڵەتێنێ وادەزانێ دەتوانێ خواش بخەڵەتێنێ، کەدیارە ئەمەش ئەستەمە، چونکە هیچ شتێك نیە لەم بوونەوەرەدا ورد یان درشت خوا ئاگای لێی نەبێت: ﴿ قُلْ أَرَأَيْتُمْ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ لَكُمْ مِنْ رِزْقٍ فَجَعَلْتُمْ مِنْهُ حَرَاماً وحَلالاً قُلْ آللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى اللَّهِ

تَفْتَرُونَ،ومَا ظَنُّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّ اللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ ولَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لا يَشْكُرُونَ ﴾ يونس: ٦٠.

واته: پێیان بڵێ: هەواڵم بدەنێ، ئێوە چۆن لەخۆتانەوە ئەو ڕۆزیەی کەخوا پێی بەخشیون بەکەیفی خۆتان حەڵاڵ و حەرامی دەکەن، پێیان بڵێ: ئایا خوا خۆی مۆڵەتی داون، یان لەخۆتانەوە شت بەدەم خواوە هەڵدەبەستن؟!

باشە، ئاخۆ لەڕۆژی قیامەتدا گومان و بۆچوونی ئەو کەسانە چۆن بێت کە درۆ بەدەم خواوە هەڵدەبەستن؟ ئایا وادەزانن لێپرسینەوە نیە؟ بەڕاستی لەگەڵ لاری زۆربەی خەڵکیدا خوا هەر خاوەنی فەزڵە بەسەریانەوە، هەرچەندە زۆربەیان بێ ئەمەکن و سوپاسگوزارنین..

﴿ ومَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ ومَا تَتْلُو مِنْهُ مِنْ قُرْآنٍ ولا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُوداً إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ ومَا يَعْزُبُ عَنْ رَبِّكَ مِنْ مِثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الْأَرْضِ ولا فِي السَّمَاءِ ولا أَصْغَرَ مِنْ ذَلِكَ ولا أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ﴾ يونس: ٦١.

واته: ئەی محمد (د.خ)تۆ بە هیچ کارێك هەڵناسی، هیچ بەشێك لەقورئان ناخوێنیتەوە کەئێمە ئاگادار نەبین، ئێوەش ئەی خەڵکینە بەهیچ هەڵسوکەوتێك هەڵناسن کەئێمە شایەت نەبین بەسەریەوە لەکاتێکدا ئەنجامی دەدەن و تیایدا ڕۆدەچن، هیچ شتێك لەپەروەردگاری تۆ ون نابێت، لەمسقاڵە زەڕەیەکەوە، لەزەوی یان لەئاسمانەوە، بچوکتربێت یان گەورەتر، کە لەدۆسیەیەکی تایبەتی ئاشکرادا لای ئێمە تۆمار نەکرابێت.

لە سورەتی (سبأ)یش دا جەخت دەکاتەوە سەر ئەمەو دەفەرموێت: ﴿ وقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لا تَأْتِينَا السَّاعَةُ قُلْ بَلَى ورَبِّي لَتَأْتِيَنَّكُمْ عَالِمِ الْغَيْبِ لا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ ولا فِي الْأَرْضِ ولا أَصْغَرُ مِنْ ذَلِكَ ولا أَكْبَرُ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ﴾ سبأ:٣. واته: ئەوانەی کافرو خوانەناسن دەیانووت: قیامەت هەر نایەت و

نامانگاتیّ، ئەی پێغەمبەر (د.خ)پێیان بلێ: نەخێر وانیە، سوێند بەپەروەردگارم هەر بەختەتان دەگرێت چونکە ئەو زاتە زانایە بەنهێنی و شاراوەکان و ئەندازەی کێشی گەردیلەیەك لەئاسمانەکان و زەویدا لەخوا ون نابێت، هەروەها لەویش بچوکتر یان گەورەتر نیە لەپەڕاوێکی تایبەتی ڕوون وئاشکرادا تۆمار نەکرابێت.

لەگەڵ زانایی بێ سنووری پەروەردگاردا کەسی واهەیە: ﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَا هُمْ بِمُؤْمِنِينَ، يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّا أَنْفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴾ البقرة:٩. واتە: لەناوخەڵکیدا کەسانێك هەن کە دەڵێن: ئیمان و باوەڕمان بەخواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، ئەوانە لەڕاستیدا درۆدەکەن و بڕوادارنین، ئەوان بەخەیاڵی خۆیان وا دەزانن خواو بڕواداران دەخەڵەتێنن، کەچی جگە لەخۆیان کەسیان پێناخەڵەتێت، بەڵام هەست ناکەن و فام ناکەنەوەو بیرناکەنەوە.

پێغەمبەریش (د.خ) لەفەرموودەکانیا جەخت دەکاتە سەر فێڵ نەکردن و خۆنەخەڵەتاندن و دەفەرموێت (مابال أقوام يلعبون بحدود الله، يستهزءون بآياته) (ابن ماجه)، واتە: چییانە کەسانێك یاری بەسنووری خوا دەکەن و گاڵتە بەئایەتەکانی دەکەن.

هەروەها دەفەرموێت: (والذى نفسي بيده ليبيتن أناس من أمتي على اشر وبطر ولعب ولهو، فيصحبوا قردة وخنازير، باستحلالهم المحارم و أكلهم الربا ) (ئیمام ئەحمەد)، واتە: بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە کەسانێك لەئومەتم سەرگەرمی تاوان و زیادە ڕەوی و (لهو)و (لعب)دەبن و، خوا دەیانکات بەمەیمون و بەراز، بەهۆی حەڵاڵ کردنی حەرام و سووخواردنەوە..

لەفەرموودەیەکی تریشدا دەفەرموێت: (ليشربن ناس مِن أمتي الخمر، ويسمونها بغير اسمها، يُعزف على رؤوسهم بالمعازف و المغنيات، يخسف الله بهم الارض،

ويجعل منهم قردة وخنازير )ابن ماجه. واته: هەندێ لەئومەتم عەرەق دەخۆن و ناوی تری لێ دەنێن (وەك ئێستا كەدەڵێن مەشروباتی رۆحی؟!) ولەسەر سەریانەوە مۆسیقا و گۆرانی هەیە، خوای گەورە نغرۆی زەویان دەكات و دەیانكات بەمەیموون و بەراز.

زانای پایە بەرز (ئیبن القیم )یش لەپەڕاوی( اغاثة اللهفان )لاپەڕە (٣٤٦)دا دەڵێت: مەسخ بوون و گۆڕان بۆ مەیموون و بەراز لەم ئومەتەشدا هەردەبێ ببێت لە دوو كۆمەڵدا:

یەكەم: زانا خراپەكان كەدرۆ بەدەم خواو پێغەمبەرەوە دەكەن، ئەوانەی دینی خواو شەرعەكەی دەگۆڕن و خواش رەنگ و ڕووخساریان دەگۆڕێت.

دووەم: ئەوانەی كە بە ئاشكرا خەریكی فیسق و خراپەوحەرامن.. جاهەرچیەكیان لەدنیاش دا مەسخ نەبن لەقەبرو قیامەتدا دەبن..

لەفەرموودەشدا هاتووە: (يُحشر آكل الربا يوم القيامةفي صورة الخنازيروالكلاب، مِن أجل حيلتهم على الربا، كما مُسخ أصحاب داود، لاحتيالهم على أخذ الحيتان يوم السبت ) واتە: سووخۆرەكان لەشێوەی بەرازو سەگدا حەشر دەكرێن بەهۆی حیلە شەرعیانەوە لەسووخواردن دا، هەروەك چۆن گەلی ئیسرائیل لە زەمانی (داود)دا،بوون بەمەیموون و بەراز بەهۆی ماسی گرتنیانەوە لەڕۆژی شەممەدا..

## چەند جۆرێك لەفێڵ كردن

أ- هەندێك بۆئەوەی كە ڕزگاری بێت لەزەكات دان، پێش ئەوەی ساڵ بێتەوە بەسەر ماڵ و سامانیا، تەرتیباتێك دەكات بۆئەوەی (نصاب)ە كەی كەم

بکات و ئەمەش پێغەمبەر (د.خ)جڵەو گیری لێکردووەو فەرموویەتی: (لایُجمع بین مُتفرق، ولا یُفرق بین مجتمع خشیة الصدقة)البخاري

ب- دیارە کاتێك کەسێك سێ جار هاوسەرەکەی تەڵاق بدات، ئیتر ناتوانێت بیهێنێتەوە تاشوویەکی تر نەکات بەپیاوێکی تر چونکە دیارە بەکەڵکی یەکتری نایەن و بەیەکەوە ناژین، ئنجا هی واهەیە فێڵ دەکات لەم مەسەلەیەدا و لەگەڵ کەسێکدا رێك دەکەوێت کەژنەکەی مارەبکات و تەڵاقی بداتەوە تابۆی حەڵاڵ بێتەوە، دیارە ئەمەش فێڵەو خۆشەویست (د.خ)دەفەرموێت ( لعن الله المُحَلِلَ والمُحَلَل لَهُ )مجمع الزوائد ٤ / ٢٦٧. واتە: خوا لەعنەتی کردووە لەوەی کەژنی کەسێك مارە دەکات و تەڵاقی دەداتەوە، بەبێ ئەوەی بەڕاستی ببێتە هاوسەری، تەنها بۆ ئەوەی بۆی حەڵاڵ بێتەوە، وەهەروەها لەعنەتیشی کردووە لەوەی کە بۆی حەڵاڵ دەکرێ (واتە مێردی یەکەمی ئافرەتەکە ).

ج- هی واهەیە سوو دەخوات و ناوی کڕین و فرۆشتنی لێ دەنێ و فێڵ دەکات و خۆی دەخەڵەتێنێ کەئەمەش جڵەوگیری لێکراوە ( یأتي زمان علی الناس یستحلون الربا بالبیع ) البیهقي.

د- هەندێك ناوی تر دەنێن لەعەرەق و بڕوبیانووی بۆ دروست دەکەن و خۆیان دەخەڵەتێنن، هەروەك خۆشەویست (د.خ)هەواڵی داوینێ: ( لاتذهب الأیام واللیالي حتی تشرب طائفة من أمتي الخمر یُسمونها بغیر اسمها ) ابن ماجه. واتە: دنیا تەواو نابێت تاوەکو کۆمەڵێ پەیدا نەبێت لەئومەتم کە عەرەق دەخۆن و ناوی تری لێ دەنێن..

هەروەها هی واهەیە خۆی دەخەڵەتێنێ و دەڵێ وەك عیلاج دەیخۆمەوە، دیارە ئەمەش قەدەغەکراوە و خۆشەویست (د.خ) بیانوویانی بڕیوەو دەفەرموێت: (خوای گەورە شیفای ئومەتی نەخستۆتە ئەو شتانەوە کەحەرامی کردوون )..

هـ – دیاره بەرتیل وەرگرتن حەرامەو لەعنەت کراوە لەوەی کە وەری دەگرێت و لەوەی کە دەیدات و لەوەش کە کارەکە ڕێکدەخات و لە نێوانیاندا دەبێت، هەروەك خۆشەویست (د.خ) دەفەرموێت: (لَعَن الله الراشي والمرتشي والرائش الذی یمشي بینهما )حاکم ٤ / ١٠٣. جابۆیە هەندێك کەس بەناوی دیاری یەوە بەرتیل دەبات و ئەوی تریش بەناوی دیاری یەوە وەری دەگرێت و لەڕاستیش دا بەرتیلەو حەرامەو بەو فێڵەو بەو ناونانە حەڵاڵ نابێت.

و– پیاوێك بە سوفیانی ثوری وت: دەزانی کە وتنی هەریەکە لە (لاإله إلا الله) و (الحمد لله)و (الله اکبر) دە حەسەنات و چاکە دەست مرۆڤ دەخات، سوفیان وتی: بەڵێ دەزانم، کابرا وتی: بەلاتەوە چۆنە کەسێك سی هەزار درهەمی بەناشەرعی دەست بکەوێت و دانیشێ تەسبیحات بکات و چاکە دەست خۆی بخات، تاچاکەکانی خراپەکانی بسڕێتەوە؟! سوفیان وتی: شتی وانابێت، باپارەکە بگێڕێتەوە لەپێشدا، چونکە زیکرەکە ئەو تاوانەی لەسەر لانابات.. جابەڕاستی وایە، هی واهەیە بەهەڵە لەئایەتی (إن الحسنات یُذهِبنَ السیئات)تێگەیشتووەو بەتەمایە بەفێڵ لێی دەرچێ، دیارە خوای گەورە لەهەقی خەڵکی خۆش نابێت تابۆیان نەگێڕدرێتەوە..

ی– جوولەکە فێڵی تریان زۆر بووە، ئەوەتە خۆشەویست (د.خ)لە بارەیانەوە دەفەرموێت (لَعَن الله الیهود، حُرِمَت علیهم الشحوم، فجَمَلوها وباعوا، وأکلوا منها )ابن ماجه، واتە: خوا لەعنەتی کرد لە جوولەکە، چونکە(شحوم – بەزو پیوی ماڵاتیان)لێ حەرام کراو ئەوانیش ئەیانتوانەوە و بەو شێوەیە دەیانفرۆشت و لێیان دەخوارد (الحیل الشرعیة بین الحظر والإباحة / نشوة العلواني).

***

## خوا غافڵ نیه له کاروکردەوەیان

خوای گەورە خاوەنی ئاسمانەکان و زەوی یەو ئاگاداری هەموو وردو درشتێکە لەم بوونەوەرەدا هەروەك لە قورئان و سوننەت دا ئاماژەی پێکراوە، ئەمەش بۆ ئەوەی مرۆڤ غافڵ نەبێ و بزانێ خوای گەورە چاوی لێیەتی و هەمووکارو کردەوەیەکی لەسەر حساب دەکات ئەگەر مسقاڵە زەرەیەکیش بێت..

بۆ نموونە:

١) ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَائِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ الْخَلْقِ غَافِلِينَ ﴾ المؤمنون:١٧. واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە لە ڕاسەرتانەوە حەوت چین ئاسمانمان دروستکردووە و ئێمە هەرگیز لە دروستکراوان غافڵ و بێئاگاین و هیچ شتێکمان لێ ون نابێت و هیچیش پشت گوێ ناخەین.

٢) ﴿ وَقُلْ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ اعْمَلُوا عَلَى مَكَانَتِكُمْ إِنَّا عَامِلُونَ، وَانْتَظِرُوا إِنَّا مُنْتَظِرُونَ، وَلِلَّهِ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ الْأَمْرُ كُلُّهُ فَاعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴾ هود:١٢٣. واتە: بڵێ بەوانە کە بڕوا ناهێنن: ئێوە لەشوێنی خۆتاندا کاری خۆتان بکەن و بەڕاستی ئێمەش خەریکی کاری خۆمان دەبین، بەردەوامیش چاوەڕێی دەرئەنجامی کاری هەردولابکەن و ئێمەش بەڕاستی چاوەڕێین، ( دیارە خوای گەورە تەوفیقی کێ دەدات و هی کێش نادات ).. هەر بۆخوایە نهێنی و نادیارەکانی ئاسمانەکان و زەوی، هەمووکارو فەرمانیش هەربۆلای ئەو زاتە دەگەڕێتەوە، دەی کەوابوو هەر ئەو بپەرستەو تەنها پشت بەو ببەستە، هەرگیز خوای پەروەردگارت بێئاگانیە لەوەی ئێوە دەیکەن و ئەنجامی دەدەن..

٣) ﴿ وَلِكُلٍّ دَرَجَاتٌ مِمَّا عَمِلُوا وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴾ الأنعام:١٣٢. واتە: بۆ هەریەکێك لە بێباوەڕو موسڵمان چەندەها پلەو پایە

هەیەو هەرکەس بە جۆرێك پاداشتی خۆی لەچاك یان لەخراپ وەردەگرێت و خوای پەروەردگارت بێئاگانیە لەو کردەوانەی کە دەیکەن..

٤) ﴿ قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ مَنْ آمَنَ تَبْغُونَهَا عِوَجاً وأَنْتُمْ شُهَدَاءُ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴾ آل عمران:٩٩. واتە: بەخاوەن کتێبەکان بڵێ: ئەی خاوەنانی کتێبی ئاسمانی بۆ ڕێدەگرن لە بلاوبوونەوەی ئایینی خواو دەتانەوێت ئەوەی باوەڕی هێناوە ڕێبازی دینداری بەچەوتی بگرێت؟ لەکاتێکدا خۆتان شایەتن و چاك دەزانن (ئەوە ڕاست نیەو چەوتە )دڵنیاش بن کەخوا غافڵ و بێئاگا نیە لەو شتانەی کە دەیکەن.

٥) ﴿ وقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴾ النمل:٩٣. واتە: بڵێ: سوپاس و ستایش بۆ خوایە، لەئایندەیەکی نزیکدا، بەڵگەو نیشانەکانی خۆیتان نیشان دەدات و دەیانناسنەوە کەهەمووی دروستکراوو بەدیهێنراوی خوایە، بێگومان پەروەردگاری تۆ غافڵ وبێ ئاگانیە لەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

٦) ﴿ ومِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وإِنَّهُ لَلْحَقُّ مِنْ رَبِّكَ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴾ البقرة:١٤٩. واتە: لە هەر شوێنێکەوە دەرچوویتە دەرەوە، لە هەرکوێ بویت لە نوێژەکاندا ڕووبکەرە کەعبەی پیرۆز، بێگومان ئەو فەرمانە حەق و ڕاستیە و لەلایەن پەروەردگارتەوەیە، خوا غافڵ و بێئاگا نیە لەو کارو کردەوانەی ئەنجامی دەدەن.

٧) ﴿ وما يَعزُبُ عَن رَّبكَ مِن مِثقالِ ذَرَّةٍ في الأَرضِ وَلا في السَّماء وَلا أَصغَرَ مِن ذٰلِكَ وَلا أَكبَرَ إِلاّفي كتابٍ مُّبين ﴾ يونس: ٦١. واتە:ئەی محمد (د.خ) هیچ شتێك لە پەروەردگاری تۆ ون نابێت، لەمسقاڵە زەڕەیەکەوە، لەزەوی یان

لەئاسماندا، بچوکتربێت یان گەورە ترو، هەمووی لە دۆسیەیەکی تایبەتی ئاشکرادایە لای ئێمەو تۆمار کراوە..

پێغەمبەریش (د.خ)ئاماژە بۆ ئەم ڕاستیە دەکات ودەفەرموێت: (ولا يَغْتَرنَّ احدكم بالله فإن الله لوكان غافلاً شيئاً لأغفل البعوضة والخردلة والذرة ) (تفسيرابن كثير٦ / ١٢٩ ) واتە: لەخوا غافڵ مەبن و لەسنوور دەرمەچن، بەڕاستی خوا ئەگەر غافڵ بوایە و گوێی نەدایە بەدروستکراوەکانی، ئەوا گوێی نەئەدا بەمێشوولەو دەنکە خەرتەلەو مێروولەو...هتد..

دەی کەخوا ڕزقی هەموو ئەو دروستکراوانە بدات و، بوونیان پارێزرابێ و هەموو هاوسەنگی خۆیان ڕاگرن و ڕۆڵی خۆیان ببینن بەو جۆرەی کەخوا بۆی دیاری کردوون لەدنیادا، ئیتر چۆن مرۆڤێك کەخوا کردویەتی بە جێنشین لەم سەر زەوی یەداو هەموو ئەو شتانەی تری لەبەرئەم دروستکردووەو دنیای بۆ تەسخیر کردووە، چۆن لێی غافڵ دەبێ و چۆن لێی ناپرسێتەوە؟!

٨) ﴿ وَلا تَحسَبَنَّ اللهَ غافِلاً عَمَّا يَعمَلُ الظالمون ﴾ ابراهيم ٤٢.. وامەزانن خوا بێئاگایە لەستەمکاران، ئەگەر ماوەیەکیش مۆڵەتیان بدات حیکمەتی تیایە وکاتێ لە ناوی بردن خۆی دەزانێ چۆن لە ناویان دەبات.

## ئەوانەی غافڵن:

١ – ئەوانەی بێئاگاو غافڵن لەپلەی بەرزی ئادەمیەوە دادەبەزنە پلەی ئاژەڵێتی:

﴿ ولَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيراً مِنَ الْجِنِّ والْإِنْسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لا يَفْقَهُونَ بِهَا ولَهُمْ أَعْيُنٌ لا يُبْصِرُونَ بِهَا ولَهُمْ آذَانٌ لا يَسْمَعُونَ بِهَا أُولَئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُولَئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ ﴾ الأعراف:١٧٩. واتە: سوێند بەخوا بێگومان ئێمە زۆر لەپەری و ئادەمیزادمان بۆ دۆزەخ داناوە، ئەوانە دڵیان هەیە و کەچی هەقی پێنادۆزنەوە و،

چاویان هەیە و هەقی پێنابینن و گوێیان هەیە و هەقی پێنابیستن، ئائەوانە وەکو ئاژەڵ وان، بگرە وێڵ و سەرگەردانتریشن، ئائەوانە غافڵ و بێئاگان..

لە فەرموودەیەکیشدا خۆشەویست (د.خ)دەفەرموێت: إنَّ اللهَ يُبغِضُ كلَّ جَعْظَرِيّ جوَّاظٍ سخَّابٍ بالأسواقِ جِيفةٍ بالليلِ حِمارٍ بالنهارِ عالِمٍ بأمرِ الدُّنيا جاهلٍ بأمرِ الآخِرةِ..الراوي: أبو هريرة :| صحيح ابن حبان..

واتە: بەڕاستی خوا ڕقی لەوانەیە کە فیزداروخەڵك بەکەم زانن و مۆن و ڕقاوین ولە بازاڕدا قیرەقیرکەرو، لە شەودا لاکە تۆپیون و هەڵناستن بۆ نوێژو، لەڕۆژیشدا گوێدرێژن و، زانان بە دنیا و نەفام و جاهیلن بە ئاخیرەت. چەند وەسفێکی سەیرە، تو خوا سەد دەر سەد باسی حاڵی ئەوانە نیە کە دوورن لەبەرنامەی خواوە.

٢- ﴿ اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وهُمْ فِي غفْلَةٍ مُعْرِضُونَ، مَا يَأْتِيهِمْ مِنْ ذِكْرٍ مِنْ رَبِّهِمْ مُحْدَثٍ إِلَّا اسْتَمَعُوهُ وهُمْ يَلْعَبُونَ، لاهِيَةً قُلُوبُهُمْ وأَسَرُّوا النَّجْوَى الَّذِينَ ظَلَمُوا هَلْ هَذَا إِلَّا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ أَفَتَأْتُونَ السِّحْرَ وأَنْتُمْ تُبْصِرُونَ﴾ الانبياء: ١-٣. واتە: لێپرسینەوە وحسابی خەڵکی نزیك بۆتەوە، لە کاتێکدا زۆربەیان بێ ئاگاو غافڵن و پشتیان لە ئاینی خوا کردووە وڕوویان لێوەرگێڕاوە و، هیچ یادەوەریەکی تازەیان لەلایەن پەروەردگاریانەوە بۆ نایەت کە ئەوان گوێ بیستی نەبووبن و لەوکاتەدا یاری و گەمەنەکەن، دڵەکانیان بێئاگاو سەرگەردانە، ئەوانەش کە ستەمیان کرد، قسەکانیان شاردەوە و بەنهێنی دەیانووت، ئایا ئەمە تەنها بەشەرێك نیە وەك ئێوە ؟! ئایا ئێوە بەدەم جادووگەریەوە دەچن؟! لە کاتێکدا ئێوە چاوتان هەیەو دەبینن! (واتە: وەك خۆیان دوای هەق ناکەون، خەڵکیش سارد دەکەنەوەو هەق بەجادوو دائەنێن و گاڵتە بەوانە دەکەن کە دوای ڕێ ڕاست دەکەون ).

٣- ﴿ فَالْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ آيَةً وَإِنَّ كَثِيراً مِنَ النَّاسِ عَنْ آيَاتِنَا لَغَافِلُونَ﴾ يونس:٩٢. واته: ئەی فیرعەون، ئەمڕۆ كە نقوم بوویت، لاشەی تۆ ڕزگار دەكەین، تابیبێتە موعجیزە و پەندو ئامۆژگاری بۆ ئەوانەی دوای تۆ دێن و ( بزانن كە تۆ خوا نەبوویت و بەچاوی خۆیان لاشەی ساردو سڕو بێ گیانت ببینن و لە سەرەنجامی تاوان و ستەم تێبگەن )، بەڵام بەڕاستی زۆربەی خەڵكی لەئایەت و موعجیزەكانی ئێمە غافڵ و بێئاگان..

٤- زۆرجار غەفڵەت درێژە دەكێشێ تا دوا ساتەكانی سەرەمەرگ وگیان دەرچوون، ئەو كاتەی كە مرۆڤ قاچێكی لەدنیاو قاچێكی لەئاخیرەت دایەو مەلائیكەت لۆمەی دەكەن و پێی دەڵێن ﴿ لَقد كُنتَ فِي غَفلَةٍ مِن هذا فَكَشَفنا عَنكَ غِطاءَكَ فَبَصَرُكَ اليَومَ حَديد﴾ ق: ٢٢. واته:بە بێباوەڕ دەوترێت: سوێند بەخوا بەڕاستی تۆ لەم بەسەرهاتە غافڵ بوویت و گوێی خۆت لێ خەواند بوو، ئێستا ئێمە پەردەمان لەسەر چاوت لاداو هەموو ڕاستیەكان دەبینیت وچاوەكانت تیژە..

٥- هوشیار بوونەوە لە كاتێكدا كە كار لەكار ترازاوە و سوودی نیە؟!

﴿ حَتَّى إِذَا فُتِحَتْ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَهُمْ مِنْ كُلِّ حَدَبٍ يَنْسِلُونَ، وَاقْتَرَبَ الْوَعْدُ الْحَقُّ فَإِذَا هِيَ شَاخِصَةٌ أَبْصَارُ الَّذِينَ كَفَرُوا يَا وَيْلَنَا قَدْ كُنَّا فِي غَفْلَةٍ مِنْ هَذَا بَلْ كُنَّا ظَالِمِينَ﴾ الانبياء:٩٧.

واته: ئەو كاتەی بەربەستەكەی (ذوالقرنین)لەسەر دووتیرەی (یأجوج و مأجوج) دەكرێتەوە( كەئەمەش یەكێكە لە نیشانەكانی نزیكبوونەوەی كۆتایی دنیا)و ئەوانە ئەوكاتە لەهەموو كون و كەلێنێكەوە بە لێشاو دێن، ئەوسا ئیتر بەڵێنی ڕاستی نزیك دەبێتەوە ودەستپێدەكات، ئنجا دەبینیت چاوی ئەوانەی

بێیاوەڕن ئەبلەق دەبێت و، دەڵێن: هاوار بۆ ئێمە، چاك غافڵ بووین لەم ڕۆژە ولەم سەرەنجامە، نەك هەر ئەوە! بەڵكو ئێمە ستەمكاریش بووین.

٦- ﴿ وعْدَ اللَّهِ لا يُخْلِفُ اللَّهُ وعْدَهُ ولَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ، يَعْلَمُونَ ظَاهِراً مِنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ﴾ الروم:٧. واتە:بێگومان ئەوە بەڵێنی خوا خۆیەتی، خوا بەڵێنی خۆی دەباتە سەر، بەسەر خستنی هەق و ڕاستی و بەهێنانی قیامەت و.. هتد، هەرچەند زۆربەی خەڵكی ڕواڵەتی دنیا دەزانن و عەقڵیان لەچاویاندایە، ئەوانە بێئاگان لە ڕۆژی دوایی..

٧- خۆشەویست (د.خ) نێردراوە تاچاوی خەڵكی بكاتەوە و ڕێیان بۆ ڕۆشن بكاتەوە وبێئاگاكان بەئاگا بهێنێتەوە: ﴿ لِتُنْذِرَ قَوْماً مَا أُنْذِرَ آبَاؤُهُمْ فَهُمْ غَافِلُونَ﴾ یس:٦. واتە:تائینزاری خەڵكی بكات و وریایان بكاتەوە لەسزای خوایی، لەكاتێكدا كەباوك و باپیریان ئاگادارنەكراونەتەوەو بێئاگان.

## سكاڵاكەی خەولە:

پێغەمبەر(د.خ) لە دوعای سەفەردا دەیفەرموو (اللهم انت الصاحب في السفر و الخليفة في الاهل) خوایە هەر تۆی هاوەڵ و دۆست و یارمەتیدەرمان لە سەفەردا و هەر تۆشی كە خەلیفە و هاوكاری ماڵ و منداڵمانی لە دوای خۆمان.

المهيمن: واتە: خاوەن زانستی بێكۆتایی و بەتوانای باڵا دەستی تەواو. خوای گەورە (مهيمن) ە لەگەڵ ئەوەش دا بە سۆز و میهرەبانە. خوای گەورە (مهيمن) ە پارێزەر و ئەمینە ﴿ فَاللَّهُ خَيْرٌ حافِظاً وَهُوَ أَرحَمُ الرَّاحِمين ﴾ یوسف: ٦٤. خوای گەورە زانا و ئاگادار و بیسەرە، كاتێ خەولەی كچی سەعلەبە هاتە خزمەت خۆشەویست (د.خ) و لە بارەی مێردەكەیەوە موجادەلەی لەگەڵ كرد، كە چۆن بەپێی عورفی ئەو زەمانە لە مێردەكەی حەرام بێت كە پێی وتبوو: تۆ وەكو دایكم

وایت، خۆشەویستیش (د.خ) فەرمووی هیچم لەو بارەیەوە بۆ نەهاتووە، ژنە شەکوای بردە بەر خوا، خواش لەسەروو حەوت ئاسمانەوە هات بە هانایەوە و گوێی لێ بوو، لە کاتێکدا کە عائیشە لە ژوورەکەدا بوو ژوورەکەش ئەوپەڕی (٣ م * ٣ م) بوو دەڵێ: هەندێ قسەیان تێگەیشتم و هەندێکیان تێنەگەیشتم (تبارکَ الذي وَسِعَ سَمْعُه الأصواتَ کُلّها) خوای گەورە ئەم ئایەتەی سورەتی مجادەلەی ناردە خوارەوە بۆ چارەسەری کێشەکەی و وەڵامی سکاڵاکەی دایەوە ﴿ قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾ المجادلة:١.

هەرچەند عومەری کوڕی خەتاب بە سواری بگەیشتایە بە خەولە لە وڵاخەکەی دادەبەزی بە ڕێزەوە لە بەردەمیا دەوەستا گوێی بۆ دەگرت. یەکێ وتی: تۆ ئەمیری بڕواداران و گوێ بۆ ئەم ژنە دەگری؟ ئەویش وتی: چۆن گوێی بۆ نەگرم، لە کاتێك خوا لەسەر حەوت ئاسمانەوە گوێی بۆ گرت و هات بە هانایەوە.

خوا بە دەسەڵات و ئاگادارە، هات بە هانای ئیبراهیمەوەو فەرمووی: ﴿ قُلنا: یا نارُ کُونِي بَرداً وَ سَلاما ﴾ الانبیاء:٦٩. ئەگەر نەیفەرموایە: و سلاماً، ئەوا لە سەرمادا ئیبراهیم ڕەق دەبۆوە، ئەگەر نەیفەرموایە (علی ابراهیم) ئەوا چی ئاگری دنیا هەیە سارد دەبۆوە، ئەوەیە دەسەڵاتدارێتی تەواوی بێ پایان.

خوای گەورە دەستەڵاتی بێپایانە، بۆیە دەبێت هانا و هاوارمان تەنها بۆ لای ئەو بێت، تەنها پشت بەو ببەستین، هیچ شتێك بۆ خوا زەحمەت نیە، زەکەریا کە مەریەمی بینی خواردنێك دەخوا لەو ناوچەیەدا نیەو خوا بەفەزڵی خۆی بۆی ناردووە، ئەمیش هات بەخەیاڵیدا کە با زۆر پیر بێت و ژنەکەشی نەزۆك بێت لە خوا بپاڕێتەوە کە کوڕێکی بداتێ ﴿ هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِن

لَّدُنْكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ﴾ آل عمران:٣٨. خواش کوڕێکی دایەو بۆشی ناونا یەحیاو کردیشی بە پێغەمبەر.

با هەمیشە لە بیرمان بێت کە ئێمە هی خواین، ئەزانن یانی چی هی خواین؟؟ واتە خاوەنی راستەقینەمان خوایە، نەك هەرئەوەندە بەڵکو بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە ﴿ الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُواْ إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّـا إِلَيْهِ رَاجِعونَ ﴾ البقرة:١٥٦. تێگەیشتن لەم راستیە ژیانمان دەگۆڕێت، بۆیە دانراوە بۆکاتی بەڵاو موسیبەت کە ئەگەرکەسێك تووشی بەڵاو موسیبەتێك بوو ئەوەی وت: خوای گەورە رەحمەت و بەرەکەت دەبارێنێت بەسەریا وخواسەبووری دەدات.

## لەخواترسان

یەکێك لەو حەوت دەستەیەی کە لەژێر سێبەری عەرش دەبن کەسێکە کە ئافرەتێکی جوانی خاوەن پلەوپایە داوای خراپەی لێ بکات ئەو کەسەش بڵێ: (إني أخاف الله) من لەخوا دەترسم. (إني أخاف الله) بەچی بیگەینی، چۆن لەژیانمانا و لەهەڵسوکەوتماندا ڕەنگ بداتەوە؟!

خۆشەویست(د.خ) کەخوا لەگوناهی بەرودوای خۆشبووەو ئیمامی موتەقینە، دەفەرموێت: (إني لأعلَمُكُم بالله وأشَدُّكُم له خَشْيَة) واتە: من لەهەمووتان زیاتر خوا دەناسم و لەهەمووشتان زیاتر لێی دەترسم.. هەروەها دەپاڕایەوە کە ترسان لەخۆی پێببەخشێت لە ئاشکراو نهێنی دا: (اللهم بعِلْمِكَ الغيب وقُدْرَتِكَ على الخَلْق، وأسألُك خَشيَتَكَ في الغيبِ والشَّهادة) رواه النسائي. بەڵێ.. ئەوانەی زانا بن، زیاتر خوا بناسن، لەهەموو کەس زیاتر لەخوا دەترسن:

﴿ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ﴾ فاطر:٢٨.

ئەوانەی لەخوا دەترسن زیاتر پەند و عیبرەت وەردەگرن: ﴿ طه (١) مَا أَنْزَلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لِتَشْقَى (٢) إِلَّا تَذْكِرَةً لِمَنْ يَخْشَى (٣)﴾ طه:١-٣.

ئەوانەی لەخوادەترسن زیاتر یادەوەری وەردەگرن لەقورئان:

﴿ إِنَّ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ بِالْغَيْبِ لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ﴾ الملك:١٢.

ئەوانەی لەخوا دەترسن سەرفرازن خۆشەویست(د.خ) دەفەرمویت: (ثلاث مُنجيات، خشية الله في السر و العلانية، و العدل في الرضا و الغضب، و القصد في الفقر و الغني) (صحيح الجامع الصغير) لیخۆشبوون وپاداشتی گەورەوبەهەشتی هەتا هەتایی بۆ ئەوانەیە کە لەخوا دەترسن..

کەواتە رێی سەرفرازی، رێی رەزامەندی پەروەردگار لە خواترسانە، لەخوا ترسانیش، پێویستی بە ناسینی پەروەردگارە، بۆیە هەوڵ ئەدەین تیشك بخەینە سەر خواناسینی ڕاستەقینەو، دەسەڵاتی بێ پایانی پەروەردگارو، موعجیزاتی قورئان و فەرموودەو، ژیانی خواناسان و بۆ خوا سوڵحاوان.

هەروەها تیشك دەخەینە سەر بانگەواز و بانگخوازی کە هۆکارێکی گرنگن بۆ ساڵح بوون و (ڕەببانی) بوون﴿ وَلَكِنْ كُونُوا رَبَّانِيِّينَ بِمَا كُنْتُمْ تُعَلِّمُونَ الْكِتَابَ وَبِمَا كُنْتُمْ تَدْرُسُونَ﴾ آل عمران:٧٩. واتە: ببنە ڕەبانی و خواناس بەوەی کە فێری خەڵکی دەکەن و بانگەوازی بۆ دەکەن و، بەوەی کە بۆ خۆتان دیراسەی دەکەن و فێری دەبن.

## خوا بەندەکانی ئەبینیٚ و ئەجەلی بۆداناون:

مردن لەناکاو دێت و منالٚ و گەورەو دەوڵەمەند وهەژارو خاوەن دەست و بێدەست وەك یەك دەبات، نەسەروەت و سامان، نەداوودەرمان مردن دواناخەن:

﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ﴾ الاعراف:٣٤.

﴿ وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِمَا كَسَبُوا مَا تَرَكَ عَلَى ظَهْرِهَا مِنْ دَابَّةٍ وَلَكِنْ يُؤَخِّرُهُمْ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِ بَصِيرًا ﴾ فاطر:٤٥.

خوا حیلمی هەیەو مۆڵەت ئەدات، رۆزی هەمووان ئەدات تەنانەت ئەگەر بێبڕواش بن، چونکە دونیا بۆ تاقیکردنەوەیەو لەقیامەتدا لێپرسینەوە دەکرێت.خۆئەگەر خوا خەڵکی بەهۆی گوناهەکانیانەوە سزا بدایە لەدونیادا ئەواکەس نەئەما لەسەرزەوی، بەلاٚم مۆڵەتیان ئەدات هەتا ئەجەلیان دێت و ماوەی تاقیکردنەوەکەیان تەواو دەبێت وئاگاداری هەموانەودەیانبینێت.

﴿ لَا يُحِبُّ اللَّهُ الْجَهْرَ بِالسُّوءِ مِنَ الْقَوْلِ إِلَّا مَنْ ظُلِمَ وَكَانَ اللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا ﴾ النساء:١٤٨ . خوای گەورە هەرگیز پێی خۆش نیە بەئاشکرا باسی ستەم و خراپە بکرێت مەگەر کەسێك ستەم لێکراو بێت، تا خەڵکی سوایيان نەبێتەوە لەبیستنی شتی خراپداو هەمیشە شتی جوان وباش بەرگوێی خەڵك بکەوێت،ئەو خوایە بەردەوام بیسەری هەموو گوفتارێکە و زانایە بە نیەتی هەموو کەس.

(إِلَّا مَنْ ظُلِمَ )ئەمەش خۆپاراستنە تا بزانن کەسێك ستەمی لێکرا ئەتوانێت بۆ سەندنی هەقی خۆی دنیا لەستەمکارەکەی پڕبکات.

## چۆنیەتی نزاکردن:

﴿ ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ ﴾ الاعراف:٥٥. هەمیشە هاناو هاوار بۆ پەروەردگارتان بەرن بە کروزانەوەو لالانەوە، بە نهێنی و لە کاتی تەنهاییتاندا، دڵنیاش بن کە ئەو زاتە ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە سنورەکان دەبەزێنن.

قورئان هاوەڵان فێری ئەدەبی دوعا کردنیان دەکات کە بەسەرکزی و بەنهێنی لەخوا بپاڕێنەوەو دەنگ زۆر بەرز نەکەنەوە چونکە خوا ئەبیستێ و ئەبینێ، ئاگاداربن کە خوا بۆ هەموو شتێك ڕێوشوێنی داناوە.خۆشەویستمان دروودی خوا لەم بارەیەوە دەفەرموێت:(أَيُّها الناسُ اربَعوا على أنفسِكم، فإنكم لا تَدْعونَ أصمَّ ولا غائبًا، ولكنْ تَدْعونَ سميعًا بصيرًا ) بخاری.

## دوعای بەکوڵ ودڵ

دوعای ڕاست و تەواوئەوەیە کە بە یەقین و بەکوڵ ودڵ بکرێت نەك بەغافڵی و ساردو سڕی یەوە کە لە ژوور سەر بستێك بەرز نابێتەوە!

پرۆفیسۆر (ئەنیس الراوی )کەخەڵکی بەغدایە و پسپۆڕە لەفیزیای نەوەوی دا دەڵێت: لەساڵی (١٩٧٦)دا لە لەندەن ماوەیەکی زۆر باران نەباری و زۆر شپرزو پێویست بوون بۆ بارانێکی چاك، هەرچی هەوڵیان دا، تەنانەت بارانی دەستکردیشیان تاقی کردەوە سوودی نەبوو، داوایان لەموسڵمانان کرد کەنوێژی باران بارین بکەن و ئەمەش زۆر گرنگ بوو بۆئێمەو وەکو تەحەددایەکیش بوو، شەوو ڕۆژێك دوعامان کردو پاڕاینەوە ونوێژی باران بارینیشمان کرد، خوا کردی باران باری و (BBC) لەهەواڵەکانیدا وتی (المسلمون يمطرون السماء!) (بەرنامەی ايات وحوار / قناه اقرا).

خێزانی ڕەحمەتیم کەساڵی ٢٠٠١ چوو بۆ بۆحەج لەئێرانەوە، وتی: لە فرۆکەخانە بووین و ناوەکان خوێنرایەوەو پەساپۆرتەکان وەرگیرانەوە و کۆمەڵێکمان بەفرۆکە ڕۆیشتن، ئێمەش ماینەوە لەسەر ژنێك ناویان خوێندبۆوەو لە فارسەکان تێنەگەیشتبوو، کابراش پەساپۆرتەکەی خستبووە گیرفانیەوەو ڕۆیشتبووەوە، هەموو پەکمان کەوتبوو لەسەر ئەو ژنەو کاتیش کاتی حەجەو درەنگە و خواخوای دەقیقەیەکمانە زووتر بچین، لەم لاشەوە ژنە خۆی دابوو بەزەویداو دەگریاو دەپاڕایەوە و دەیووت: چارەم بکەن،فریام بکەون!

ڕەحمەتی دەڵێ: زۆر وەزعمان ناخۆش بوو، لە نێوان خۆم و خوادا کەوتمە دوعاکردن: خوایە گیان تۆ کارت هەیە دەڵێن، (بین المغرب والعشاء یفعل الله مایشاء) ئەمە سەعاتێ زیاتری دەوێت، ئێمە پەلەمانەو بە (کن فیکون) ەکەی خۆت فریامان کەوە با دوانەکەوین و زووبڕۆین، خوا ئاگادارە ئەوەندەی نەبرد کابرای ئێرانی پەیدا بوو ناوی پەساپۆرتەکەی خوێندەوەو دامانەوە بەژنەکە، هەرلەوێدا یەکسەر لەسەر ئەرزی فرۆکەخانەکە سوجدەم برد بۆخوا، زانیم کە تەنها خوایە ئاوا دەمودەست هات بەدەنگمانەوە و ڕزگاری کردین!



## ئەوانەی دەبەخشن خوا دەیانبینێت:

﴿ وَمَثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمُ ابْتِغَاء مَرْضَاتِ اللّهِ وَتَثْبِيتاً مِّنْ أَنفُسِهِمْ كَمَثَلِ جَنَّةٍ بِرَبْوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٌ فَآتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ البقرة: ٢٦٥.

ئەوکەسانەش کە ماڵیان دەبەخشن بۆ ڕەزامەندی خواو دڵیان بەبڕوا پتەوە، خێرەکەیان وەك باغێکە لەسەرگردێك و بارانی پەڵەی لێبدا و بەروبووی دوو ئەوەندە بێ، ئەگەر پەڵەشی لێنەدا نمە باران تێراوی کا،هەرکارێ کە ئێوە دەیکەن خوا دەیبینێ.

## پەیمانیان داوەوخواش نهێنی وچرپەیانی ئاگالێیە:

﴿ وَمِنْهُمْ مَنْ عَاهَدَ اللَّهَ لَئِنْ آتَانَا مِنْ فَضْلِهِ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ الصَّالِحِينَ (٧٥) فَلَمَّا آتَاهُمْ مِنْ فَضْلِهِ بَخِلُوا بِهِ وَتَوَلَّوْا وَهُمْ مُعْرِضُونَ (٧٦) فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِي قُلُوبِهِمْ إِلَى يَوْمِ يَلْقَوْنَهُ بِمَا أَخْلَفُوا اللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ (٧٧) أَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَاهُمْ وَأَنَّ اللَّهَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ (٧٨)﴾ التوبة:٧٥-٧٨.

واتە: وە لەنێو دووڕووواندا کەسانێك هەن کە (سوێند دەخۆن و) لەگەڵ خودا پەیمان دەبەستن (وە دەڵێن: مەرج بێ) ئەگەر لە فەزڵ و کەرەمی خۆی بماندا تێ، بێگومان ئیحسان دەکەین و سەدەقە دەدەین و لە ریزی چاکان و باشان دەبین.

جا کاتێ خودا لە فەزڵ و کەرەمی خۆیەوە پێی دان (و دەوڵەمەند و دارای کردن) بەرچاوتەنگی ورژدیان کرد و (هیچیان نەبەخشی و پەیمانیان شکاند و لە خێرو خێرات) سەرپێچیان کرد، وە ئەسڵەن ئەوان روو وەرگێڕن (و لە فەرمان

و تاعەتی خودا خۆدەبوێرن و لەسەر حەق و حەقیقەت و بەڵگە و پەیمان نامێنن). جا خودا دووڕوویی لە دڵەکانی ئەواندا هێشتەوەو نیشتەجێی کرد تا ئەو ڕۆژەی دێنە دیداری خودا، ئەوەش بە هۆی ئەوەیە، پێچەوانەی ئەو پەیمانە جووڵانەوە کە بەڵێنیان بە خودا دابوو، وە بە هۆی ئەوەیە کە زۆر درۆیان دەکرد.

مەگەر ئەوان نەیانزانیوە کە بێگومان خودا لە نهێنی و رازیان، وە لە سرتە و چپەیان ئاگادارە، وە بێگومان خودا لە هەرچی نادیارە ئاگاداری ئاگادارە.

## پشت بەوخوایە ببەستە کە ئەبینێ و ئەبیستێت

خوای گەورە فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر (د. خ) کە تەنها پشت بەو ببەستێت، ئەو خوایەی کە لە شەوی تاریکدا پەرستشەکانی ئەبینێت و، لەناو نوێژ خوێناندا دەیبینێت کە سوجدە دەبەن، بەراستی ئەو بیسەرو زانایە ﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى الْعَزِيزِ الرَّحِيمِ، الَّذِي يَرَاكَ حِينَ تَقُومُ، وَتَقَلُّبَكَ فِي السَّاجِدِينَ، إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾ الشعراء: ٢٢٠. تێگەیشتن لەوەی کە خوامان لەگەڵ دایە و بیسەرو بینەر و بە ئاگایە مەسەلەیەکی زۆر گرنگە بەتایبەت بۆ بانگخوازان، ئەوەتا خوا فەرمان ئەدا بە حەزرەتی موساو براکەی کە بچن بۆلای فیرعەون تا پەیامی خوای پێبگەیەنن، ئەوانیش دەڵێن: دەترسین زیادەڕەوی بکات بەرامبەرمان، خوای گەورەش دەفەرموێت: نەخێر مەترسن بچن بۆلای من لەگەڵتاندام ئەبیستم و ئەبینم:

﴿اذْهَبَا إِلَى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى
قَالَا رَبَّنَا إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ عَلَيْنَا أَوْ أَن يَطْغَى
قَالَ لَا تَخَافَا إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى ﴾ طه: ٤٤-٤٦.

پێغەمبەر (د. خ) باش لەم راستیە تێگەیشبوو هەمیشە هەستی دەکرد کە خوای لەگەڵدایە و هاوکار و یارمەتیدەرێتی، بۆیە ئەگەر بەوردی سەیری ژیاننامەی بکەین، بۆمان دەردەکەوێت کە بۆ تاقە ساتێکیش بێ هیوا نەبووە و هەمیشە دڵنیابووە لە سەرکەوتنی بەرنامەی خوا، ئەوەتا لە ناخۆشترین رۆژ و لە سەختترین کاتدا، کە لە تائیف ئەو هەموو ئازارەیان دا، پێش ئەوەی بچێتە ناو مەککەوە زەید لێی پرسی: چۆن دەرۆیتەوە بۆ ناو قورەیش لە کاتێکدا کە ئەوان دەریان کردویت؟ ئەویش فەرمووی: ئەی زەید، خوا دەرووی خێر دەکاتەوە و پێغەمبەر و ئایینەکەشی سەردەخات..

خوای گەورە کەباسی رزگارکردنی پێغەمبەران دەکات، دەفەرموێت هەربەو جۆرەش برواداران رزگاردەکەین (ثُمَّ نُنَجِّي رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُواْ كَذَلِكَ حَقّاً عَلَيْنَا نُنجِ الْمُؤْمِنِينَ) یونس١٠٣.

***

## خوا کردەوەکانتان ئەبینێت وڕووداوەکانتان بیر دەخاتەوە:

قورئان بۆ پەروەردەکردنی هاوەڵان کە هێشتا ئاسنەکەیان گەرم بووبە ڕووداوەکان، ئاوا باسی غەزاکانیان بۆدەکات:

## غەزای بەدر

خوای گەورە ئەبیستیّ و ئەبینیّ و زانایە ﴿ وَإِنَّ اللّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ هەرچی هەیەو ڕوو ئەدات هەمووی بۆ ئەو دەگەڕێتەوە،خوا باسی جەنگی بەدر ئەکات بۆ هاوەڵان تا پەندی لێوەرگرن.

کات و شوێنی جەنگی بەدر بە ئیرادەی خوا بوو،کە ئاوا لەو شوێنەدا لە کاتێکی دیاری کراودا بەیەکی گەیاندن،تەنانەت ئەگەر وەعدیان بەیەك بدایە و مەوعیدیان دابنایە ئاوەها بەیەك نەدەگەیشتن و خیلاف وەعد دەبوون:

- ﴿ إِذْ أَنتُم بِالْعُدْوَةِ الدُّنْيَا وَهُم بِالْعُدْوَةِ الْقُصْوَى وَالرَّكْبُ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَلَوْ تَوَاعَدتُّمْ لاَخْتَلَفْتُمْ فِي الْمِيعَادِ وَلَـكِن لِّيَقْضِيَ اللّهُ أَمْراً كَانَ مَفْعُولاً لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَن بَيِّنَةٍ وَيَحْيَى مَنْ حَيَّ عَن بَيِّنَةٍ وَإِنَّ اللّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ الأنفال:٤٢. مسوڵمانان لە(عُدْوَةِ الدُّنْيَا) دۆڵێکی نزیك مەدینە بوون،کە لمی زەویەکەی بە بارانەکە زیاتر یەکی گرت وجیّ پێی موسوڵمان خۆش بوو،بەڵام کافرەکان لە دۆڵێکی دوور لەمەدینە بوون(عدوە القصوی)شوێنەکەی وابوو بارانەکە نارەحەتی بۆ کافران دروستکرد و هاتوچۆیانی ناخۆش کرد،دیارە ئەمەش بەحیکمەتی خوا بوو.

کاروانەکەی ئەبوسوفیانیش لەلایەکی ترەوە بۆی دەرچوو،تەنها ویست و ئیرادەی خوا بوو موسڵمانان و کافرانی بەیەك گەیاند تا ئەو جەنگە ڕووبدات.

لەم وانەیەی قورئانەوە لە قەزاوقەدەرو ئیرادەی خوایی تێدەگەین..

## خوای زانای باڵادەست ئاوا ورەی بەرزکردنەوە:

ورە بەرزی کاری زۆری بۆ دەکرێ و پارەی زۆری بۆ خەرج دەکرێت،خوای گەورە بۆ موسوڵمانانی فەراهەم هێنا، هەروەك دەفەرموێت:

- ﴿ إِذْ يُرِيكَهُمُ اللَّهُ فِي مَنَامِكَ قَلِيلاً وَلَوْ أَرَاكَهُمْ كَثِيراً لَّفَشِلْتُمْ وَلَتَنَازَعْتُمْ فِي الأَمْرِ وَلَـكِنَّ اللَّهَ سَلَّمَ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ، وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذِ الْتَقَيْتُمْ فِي أَعْيُنِكُمْ قَلِيلاً وَيُقَلِّلُكُمْ فِي أَعْيُنِهِمْ لِيَقْضِيَ اللَّهُ أَمْراً كَانَ مَفْعُولاً وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الأُمُورُ ﴾الأنفال: ٤٣-٤٤.

خوای گەورە لە خەودا پیشانی خۆشەویستیدا(د.خ)کە کافران کەمن،جا کە ئەویش بۆ هاوەڵانی باسکرد دڵخۆش بوون بە خەوەکە و ورەیان بەرز بووەوە،چونکە ئەگەر لەخەوەکەدا بە زۆر بیبینیایە ئەوا موسوڵمانان شپرزە دەبوون وجیاوازیان تێدەکەوت،بەڵام خوا کە ئاگای لە دڵەکانە نەیهێشت وایان بەسەر بێت،جا کە لە ئەرزی واقعیش دا بەیەك گەیشتن هەر بەقەدەری خوا موسوڵمانان کافرەکانیان کەسێ ئەوەندەی خۆیان بوون بەکەم دەهاتنە پێش چاویان،هەروەها کافرەکانیش بەقەدەری خوا موسوڵمانان بەکەم دەهاتنە پێش چاویان، چونکە لەڕاستیدا موسڵمانان کەمبوون..

## غەزای ئوحود:

خوای پەروەردگار بە رووداوەکانی ژیانیان بەتایبەت جەنگەکان هاوەڵان وئێمەش پەروەردە ئەکات، دەستی قەدەریان پیشان ئەدات، حیکمەتی پشت رووداوەکانیان بۆ بەیان ئەکات ئەوەتا لەسورەتی ئال عیمراندا لەپاش جەنگی ئوحود بەهاوەڵان ئەفەرموێت:

- ﴿ هَا أَنْتُمْ أُولَاءِ تُحِبُّونَهُمْ وَلَا يُحِبُّونَكُمْ وَتُؤْمِنُونَ بِالْكِتَابِ كُلِّهِ وَإِذَا لَقُوكُمْ قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْا عَضُّوا عَلَيْكُمُ الْأَنَامِلَ مِنَ الْغَيْظِ قُلْ مُوتُوا بِغَيْظِكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴾ آل عمران:١١٩.

ئاگادار بن! ئێوە ئەوانتان (لەبەر خزمایەتی یا دۆستایەتی) خۆشدەوێ، وە ئەوان ئێوەیان (لەبەر ئیسلام و ئیمان و بیروباوەڕی خوداناسی) خۆشناوێ، وە ئێوە بە هەموو کتێب (و پەرتوکی ئاسمانی) ئیمان و باوەڕتان هەیە (بەڵام ئەوان ئیمان و باوەڕیان بە کتێبی ئێوە نییە). وە کاتێك دەگەنە ئێوە دەڵێن: ئیمانمان هێناوە (و لەگەڵ ئێوەین) وە کاتێك ئێوە بەجێدێڵن و لەگەڵ یەکتر کۆدەبنەوە، لە رق و بوغزی ئێوە قامکەکانیان دەگەزن. بڵێ: بە ئەو رق و بوغزەتانەوە دیق بکەن و بمرن و هەڵقەڵەشێن. بێگومان خودا ئاگادارە لە ئەو شتانەی لە (دڵو دەروونان و) سینگاندایە.

- ﴿ إِنْ تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِنْ تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحُوا بِهَا وَإِنْ تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئًا إِنَّ اللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴾ آل عمران: ١٢٠. ئەگەر چاکەیەکتان پێبگا و باشێکتان بێتەڕێ، نارەحەت و بەدحاڵیان دەکا و ئازاریان دەدا، وە ئەگەر خراپە و زیانێکتان پێبگا پێی شاد و شەنگووڵ دەبن و کەیفی پێ دەکەن. وە ئەگەر ئێوە (لە بەرابەر ئەزیەت و ئازاری ئەوان) خۆڕاگرن بن و، وە(لە دۆستایەتی لەگەڵ ئەوان) خۆبپارێزن و لە خودا بترسێن، فڕوفێڵ و گزی و فزی ئەوان هیچ زەرەر و زیانێکتان پێناگەیەنێ. بێگومان خودا لە ئەوەی دەیکەن ئاگادارە وبە سەریدا زاڵە.

- ﴿ وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّئُ الْمُؤْمِنِينَ مَقَاعِدَ لِلْقِتَالِ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ آل عمران:١٢١. (ئەی پێغەمبەر وەیادی بڕواداران بێنەوە) ئەو کاتەی کە لەنێو کەس‌وکار و ماڵو منالّی خۆت بەرەبەیان وەدەرکەوتی و بۆ بڕواداران جێگاکانی

جەنگ و شەڕت ئامادە و دیاری دەکرد (شەڕگەی تیرهاویژان و شەڕگەی سواران و پێگەی جەنگی موسڵمانانی دیکەت جیا دەکردەوە) وە خودا بیسەری (وتوویژتان، وە) ئاگاداری ئاگادارە (لە بیرورِا و فکر و ئەندێشەتان).

ئالێرەدا کەهاوەڵان بەهۆی جەنگی ئوحودەوە ئاسنەکەیان گەرم بوو ئاوا قورئان کاریان لەسەردەکات و باسی جەنگەکەیان بۆدەگێڕێتەوە، ئەوەی قورئان دەیلێ ئەوان تیاژیابوون روون بوولایان، بەڵام جەختی ئەکاتە سەر شتێك کەزۆرگرنگە بیزانن ئەویش ئەوەیە کەخوا بیسەری وتوو ویژو ئاگاداری هەڵسوکەوتیان بووە (وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ )..تاهەمیشە هەست بکەن بەبینین و بیستن و ئاگالێبوونی خوا.

- ﴿ إِذْ هَمَّتْ طَائِفَتَانِ مِنْكُمْ أَنْ تَفْشَلَا وَاللَّهُ وَلِيُّهُمَا وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ﴾ آل عمران:١٢٢. ئەو کاتەی کە دوو تاقمە لە خۆتان خەریك بوون ورەبەردەن و شل ببنەوە (واتە: بەنووسەلەمە لە خەزرەج، وە بەنووحاریسە لە ئەوس، ویستیان لە بەینی ڕێگایەدا بگەڕێنەوەو نەچن بۆ جیهاد) بەڵام خودا یار و یاوەریان بوو (و بە هانایانەوە هات و لە ئەو قەسدە گەڕاندنیەوە) جا بڕواداران دەبێ پشت هەر بە خودا ببەستن.

- ﴿ وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ اللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنْتُمْ أَذِلَّةٌ فَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ آل عمران:١٢٣. وە لە شەڕی بەدر خودا یاریدەی دان و زاڵی کردن لە حاڵێکدا ئێوە (کەم و بێهێز) و ناتەوان بوون. جا کەوایە لە خودا بترسێن و پارێزگاری بکەن بەڵکو سوپاسگوزاری (لوتف و نیعمەتی ئەو) بەجێبێنن.

- ﴿ إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَنْ يَكْفِيَكُمْ أَنْ يُمِدَّكُمْ رَبُّكُمْ بِثَلَاثَةِ آلَافٍ مِنَ الْمَلَائِكَةِ مُنْزَلِينَ﴾ آل عمران:١٢٤. ئەو کاتە کە تۆ بە بڕوادارانت دەووت و رادەگەیاند:

ئایا بەستان نییە کە پەروەردگارتان ئێوە بە سێ هەزار فریشتە کۆمەك بکا، ئەو فریشتانەی لەلای خوداوە دەنێردرێن؟

- ﴿ بَلَى إِنْ تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا وَيَأْتُوكُمْ مِنْ فَوْرِهِمْ هَذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُمْ بِخَمْسَةِ آلَافٍ مِنَ الْمَلَائِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴾ آل عمران:١٢٥. بەڵێ (کە بەسە. بەڵام پتر لە ئەوە) ئەگەر خۆڕاگرن و پایەداری بکەن، وە پارێزگار و خوداترس بن، وە (دوژمنانی موشریك) هەر ئێستاکە بۆ لاتان بێن و پەلامار بێنن، پەروەردگارتان کۆمەکتان دەکا و یاریدەتان دەدا بە پێنج هەزار فریشتەی پەلاماردەر و دروشمدانەر.

- ﴿ وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلَّا بُشْرَى لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُمْ بِهِ وَمَا النَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ﴾ آل عمران:١٢٦. وە خودا ئەو (کۆمەکەی فریشتەکانی) نەکردۆتە شتێك مەگەر مزگێنیەك بێ بۆ ئێوەو بۆ ئەوەی دڵەکانتان ئارام بگرن (و دڵنیا بن خودا سەرکەوتووتان دەکا، وە وەسیلە و ئەمرازی زاهیری و ڕواڵەتی وەکو لەشکری فریشتان بەهانە و بیانووە و بۆ ئۆقرەگرتنتانە) وە پیرۆزی و سەرکەوتن و کۆمەك و تەنها لە لای خودای خاوەن دەسەڵاتی کاربەجێیە.

- ﴿ لِيَقْطَعَ طَرَفًا مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَوْ يَكْبِتَهُمْ فَيَنْقَلِبُوا خَائِبِينَ ﴾ آل عمران:١٢٧. هەدەف لە یاریدەدانتان بە دەستی فریشتان ئەوەیە تاکو خودا دەستەیەك لە (گەورە گەورەکانی) کافران لەناو ببا، یان سەرکوت و دەمکوتیان کا، جا بە نائومێدی و سەرشۆڕی بگەڕێنەوە.

- ﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ﴾ آل عمران:١٢٨. هیچ کارێك بە دەستی تۆ نییە (کاری تۆ تەنیا بەڕێوەبردنی فەرمانی خودایە، جگە لە ئەوە شتێکت لەدەست نایە. خودایە) یا تۆبەیان لێ قەبووڵ دەکا، یان (بە تێکشکاندن و زەبوون کردنیان لە دونیادا، وە بە جەزرەبەدان لە ئاخیرەتدا) عەزابیان دەدا، چوون ئەوان زاڵم و ستەمگەرن.

- ﴿ وَلِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ يَغْفِرُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ آل عمران:١٢٩. وه ئەوەی لە ئاسمانەکان و ئەوەی لە زەویدایە هی خودایە. هەرکەس خودا حەز بکا دەیبەخشێ، وە هەرکەس خودا حەز بکا عەزابی دەدا. وە خودا زۆر بەخشەر و فرە میهرەبانە (خۆی دەزانێ کێ دەبەخشێ و بەزەیی بە کێدا دێ).

ئنجا قورئان باسێکی سووخواردن دەکات کە حەرامەو دواتر لەنزیکەی ٤١ ئایەتی تردا باسی جەنگی ئوحود ئەکات کەلەسەرەتادا بەفەرمانی خوا سەرکەوتن ودواتر کەفەرمانی پێغەمبەریان شکاندو تیرهاوێژەکان بۆ غەنیمە کۆکردنەوە سەرشاخەکەیان بەجێهێشت موسڵمانان شکان و نزیکەی حەفتایان لێ شەهیدبوو.ئەمەش هەمووی بەڵگەی بینین و بیستن و ئاگالێبوونی خوایە کە هاوەڵانی لەسەر پەروەردە ئەکات.

***

## غەزای خەندەق:

خوای پەروەردگار کەئاگادارو زانایە بەهەموو بوونەوەرو بەدیهێنراوەکانی ئاوا ڕووداوەکانی جەنگی خەندەق بیری موسڵمانان دەخاتەوە و بەوشە تابلۆکانی غەزاکە دەنەخشێنیّ:

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَاءتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحاً وَجُنُوداً لَّمْ تَرَوْهَا وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيراً﴾ الأحزاب:٩.

ئەی گەلی خاوەن باوەڕان، چاکەیەك خودا لەگەڵ ئێوە کردی لەبیری مەکەن، لەشکر گەلێکتان هاتەسەر، ئێمە ڕەشەبامان وێڕای چەن لەشکر بۆناردن، کە ئێوە نەتاندەبینین، هەرچی ئێوە دەیکەن خوا باش دەیبینیّ.

﴿ إِذْ جَاؤُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتْ الْأَبْصَارُ وَبَلَغَتِ الْقُلُوبُ الْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِاللَّهِ الظُّنُونَا ﴾ الأحزاب:١٠.

لەو دەمەدا کە لەسەرو خوارەوە بۆتان هاتن، چاوتان ڕەشکەوپێشکەی دەکرد، دڵتان وەتەپە تەپ کەوت و گەیشتە قورقوڕاگەتان،زۆر خەیاڵی جۆراوجۆرتان لەخودا بەدڵدا دەهات.

﴿ هُنَالِكَ ابْتُلِيَ الْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا زِلْزَالاً شَدِيداً ﴾ الأحزاب:١١.

لەوشوێنەدا ئەزموونی خاوەن باوەڕان هاتە گۆڕیّ وبەلەرزینێکی زۆر بەهێز دڵی هەمووان کەوتە لەرزە.

﴿ وَإِذْ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ إِلَّا غُرُوراً ﴾ الأحزاب:١٢.

لەو کاتەشدا ئەو کەسانەی دووڕووبوون و ئەوانەش کە دەغەزێکیان لەدڵدا بوو، هەر دەیانووت:ئەو بەڵێنەی خوداو پێغەمبەر دەیاندا هەر بۆ فریوی ئێمە بوو.

﴿وإذْ قالت طَّائفةٌ مِّنْهُمْ يا أهْلَ يثْرب لا مُقام لكُمْ فارْجعُوا ويسْتأْذِنُ فريقٌ مِّنْهُمُ النَّبيَّ يقُولُون إنَّ بُيُوتنا عوْرةٌ وما هِي بعوْرةٍ إن يُرِيدُون إلَّا فِرارا ﴾ الأحزاب:١٣.

هێندێك لەوان دەیووت: ئەی دانیشتوانی یەسریب! ئێرە جێگای ئێوەنییە، دەی وەگەڕێن.هێندێکیشیان دەهاتن ئیزنیان لە پێغەمبەر دەخواست: کەسمان لەسەر ماڵەکانمان دانەناوە ئاگای لێ بێ.ماڵیان بێ پارێزگار نەبوو، هەر نیازی راکردنیان بوو.

﴿ ولَوْ دُخِلَتْ عَلَيْهِم مِّنْ أقْطَارِهَا ثُمَّ سُئِلُوا الْفِتْنَةَ لَآتَوْهَا ومَا تَلَبَّثُوا بِهَا إلَّا يَسِيراً ﴾ الأحزاب:١٤.

ئەگەر دەوری ماڵەکانیان لێ گیرابا وبیانگوتایە: لەدین پەشیمان ببنەوە، هێندە زۆری نەدەخایاند،لەدین پاشگەزدەبوونەوە.

﴿ وَلَقَدْ كَانُوا عَاهَدُوا اللَّهَ مِن قَبْلُ لَا يُوَلُّونَ الْأَدْبَارَ وكَانَ عَهْدُ اللَّهِ مَسْؤُولاً ﴾ الأحزاب:١٥.

ئەوان پێشتر پەیمانیان دابوو بەخودا، کەلەبەر دوژمن نابەزن، دیارە پەیمان بەخودادان لێپرسینەوەشی هەیە.

﴿ قُل لَّن يَنفَعَكُمُ الْفِرَارُ إن فَرَرْتُم مِّنَ الْمَوْتِ أَوِ الْقَتْلِ وَإِذاً لَّا تُمَتَّعُونَ إلَّا قَلِيلاً ﴾ الأحزاب:١٦.

بێژە: راکردن لەمردن یان لەکوشتن، هیچ دادێکی ئێوەنادا، ئەوساکەش هەر کەمێکی تر رادەبوێرن لە دنیادا.

﴿ قُلْ مَن ذَا الَّذِي يَعْصِمُكُم مِّنَ اللَّهِ إنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوءاً أَوْ أَرَادَ بِكُمْ رَحْمَةً وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ اللَّهِ وَلِيّاً وَلَانَصِيراً ﴾ الأحزاب:١٧.

بێژە: گەر خودا بخوازێ بەلایەکتان بەسەر بێنێ، یان بۆتان چاکەیە بێنێ،کێ دەستی وەبەردێنێ و دەوپارێزێ؟؟غەیری خودا نە سەروەریان دەس دەکەوێ و نەکەسیش یارمەتیان دەدا.

﴿ قَدْ يَعْلَمُ اللَّهُ الْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ وَالْقَائِلِينَ لِإِخْوَانِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا وَلَا يَأْتُونَ الْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلاً ﴾ الأحزاب:١٨.

دیارە خودا خۆی دەزانێ چ کەسانێ لەئێوە دەبوونە لەمپەرو کێش بوون دەنگی براکانی خۆیان دەدا: وەرنە لامان، کەمتریشیان لەم شەڕەدا بەشداردەبوون.

﴿ أَشِحَّةً عَلَيْكُمْ فَإِذَا جَاء الْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ كَالَّذِي يُغْشَى عَلَيْهِ مِنَ الْمَوْتِ فَإِذَا ذَهَبَ الْخَوْفُ سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى الْخَيْرِ أُوْلَئِكَ لَمْ يُؤْمِنُوا فَأَحْبَطَ اللَّهُ أَعْمَالَهُمْ وَكَانَ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيراً ﴾ الأحزاب:١٩.

لە حاست ئێوە چاوچنۆکن، هەرگا ترسێ دێتەپێشێ، دەیانبینی هەر زەق لەتۆ دەڕوانن وچاویان سپی هەڵدەگەڕێ، وەك یەکێ لەترسی مردن بێ هۆش بووبێ،وەختێ ترسیش بەسەردەچێ، گەزارەتان لێ دەکێشن، دەست بەزمان شڕی دەکەن، تەماحکاری تالانەکەن،ئەوانە هەرگیز باوەڕیان نەهێناوە،هەموو کاریان لای خودا بەفیڕۆ چووە و ئەمەش لای خودا ئاسانە.

﴿ يَحْسَبُونَ الْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُوا وَإِن يَأْتِ الْأَحْزَابُ يَوَدُّوا لَوْ أَنَّهُم بَادُونَ فِي الْأَعْرَابِ يَسْأَلُونَ عَنْ أَنبَائِكُمْ وَلَوْ كَانُوا فِيكُم مَّا قَاتَلُوا إِلَّا قَلِيلاً ﴾ الأحزاب:٢٠.

وادەزانن کە دوژمنە هاودەسەکان نەڕۆیشتوون، خۆ ئەگەریش ئەو هاودەسانە بێنەوە، ئەمانە ئاوات دەخوازن لەگەڵ عەرەبە چۆڵ نشینەکاندا بوونایەو هەر

دەنگوباسی ئێوەیان لەدوورەوە بپرسیبا،ئەگەر لەناوتانیش مابان - کەمیان نەبێ- لەشەڕدا بەشدار نەدەبوون.

﴿ أَفَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَانَهُ عَلَى تَقْوَى مِنَ اللّهِ وَرِضْوَانٍ خَيْرٌ أَم مَّنْ أَسَّسَ بُنْيَانَهُ عَلَىَ شَفَا جُرُفٍ هَارٍ فَانْهَارَ بِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴾ التوبة: ١٠٩.

ئاخۆ کەسێ کە بنچینەی مزگەوتەکەی لەسەر خواپەرستی و ڕەزای خوا دارشتبێ هێژاترە، یان ئەو کەسەی کە بناغەی مزگەوتەکەی لەسەر لێواری کەندالێ فشەڵەو رووخەك داناوەو لەگەڵ ئەودا دەکەوێتە ناو ئاگری دۆزەخ، خوا دەستەی ستەمکاران شارەزای راستە رێ ناکا.

ئەم وێنەیە بەخەیاڵ بێنە بەرچاو، ئەمانە مزگەوتی (ضرار)یان بۆ نیفاق و سیخوڕی دروستکردووەو بنچینەکەی وا لەسەر لێواری کەندالێ فشەڵە و لە جووڵەیەکی کەمداو لە چەند چرکەیەکدا خۆیان و بیناکەیان هەرەسیان هێناو رووخان!! بەلام رووخانە کوێوە؟ رووخانە ناو دۆزەخەوە!

﴿ لاَ يَزَالُ بُنْيَانُهُمُ الَّذِي بَنَوْاْ رِيبَةً فِي قُلُوبِهِمْ إِلاَّ أَن تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمْ وَاللّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ التوبة: ١١٠. ئەو بینایەی سازیان داوە، هەر مایەی دڵخورتیانە،جا مەگەر ئەو دڵانەیان کوت کوت بێ،خوداش زانای لەکارزانە.

***

## خوای زانا و ئاگادار پێی وتووم

پێغەمبەرﷺ لای زەینەبی خێزانی شەربەتی هەنگوینی دەخواردەوە، خاتوو عائیشە و حەفصە کەهەوێی بوون پێیان ناخۆش بوو، بڕیاریاندا کە پێغەمبەرﷺ چوو بۆلای هەرکامیان پێی بڵێن تۆ (مەغافیر) ت خواردووە، (مەغافیر) یش خواردنێکی شیرینی بۆن ناخۆشە، جا کەپێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆلای خاتوو حەفصە پێی وت: بۆنی مەغافیرت لێ دێ و مەغافیرت خواردووە، خۆشەویستیشﷺ فەرمووی: نەخێر مەغافیرم نەخواردووە، بەڵکو لای زەینەب شەربەتی هەنگوینم خواردۆتەوە، جامادەم ئەو بۆنەم لێ دێ ئیتر ئەو شەربەتە ناخۆمەوە، بەڵام ئەم قسەیە بەکەس مەڵێ.

خاتوو حەفصە کە هاو تەگبیر بوو لەگەڵ عائیشە، ئەم قسەیەی بۆ گێڕایەوە. خوای گەورەش پێغەمبەری ئاگادارکردەوە، بۆیە پێغەمبەرﷺ لۆمەی حەفصەی کرد و فەرمووی: ئەم قسەیەت بۆ عائیشە گێڕایەوە؟ حەفصەش وتی: کێ لەمە ئاگاداری کردیت؟ خۆشەویستﷺ فەرمووی: خوا ئاگاداری کردم.

ئەم قسەو باسە گەیشتەوە خێزانەکانی تری پێغەمبەرﷺ، حەزرەتﷺ توورەبوو سوێندی خوارد تامانگێك نەچێ بەلایانا، تەنانەت خەریك بوو تەڵاقیشیان بدات، ئیتر ئەم ئایەتانە هاتنەخوارەوە و چارەسەری کێشەکەی کرد. کە بەڕاستی ئەم ئایەتانەش بەڵگەی روون و ئاشکران کە قورئان دانراوی محمدﷺ نیە، چونکە کەس نیە بێت رووداوێکی خۆی و خێزانەکانی ئاوا تۆماربکات،هەروەها ئەو غەیب نازانێ، مەگەر شتانێك کە خوا بەوەحی ئاگاداری بکات، خوای گەورە لەسەرو حەوت ئاسمانەوە بەچەند ئایەتێك ئەو کێشەیەی چارەسەرکردو لەقورئاندا تۆماری کرد کەهەردەم پەندو ئامۆژگاری بێت و بۆ موسڵمانان. هەروەك دەفەرموێت:

﴿ يا أيها النبيُّ لم تُحرّمْ ما أحلّ اللّهُ لك تبْتغي مرضاة أزْواجك واللّهُ غفورٌ رحيمٌ﴾ التحريم:١. ئەی پێغەمبەر بۆ شتێك كەخوا بۆی حەلاڵ كردویت تۆ لە خۆتی قەدەغە دەكەیت، ئەتەوێ ژنەكانت لێت رازی بن، خوا لێخۆشبووی میهرەبانە.

﴿ قدْ فرض اللّهُ لكُمْ تحلّة أيمانكُمْ واللّهُ موْلاكُمْ وهُو الْعليمُ الْحكيمُ ﴾ التحريم: ٢. بێگومان خوا دایناوە بۆتان كردنەوەی سوێندەكانتان (ئەو رێ یەی كەبە سوێند لەخۆتانی دەگرن دەتوانن بە فیدیە بیكەنەوە) خوا دۆستی ئێوەیە و دانای كاردروستە.

﴿ وإذْ أسرَّ النَّبِيُّ إلى بعْض أزْواجه حديثًا فلمَّا نبَّأتْ به وأظْهرهُ اللّهُ عليْه عرَّف بعْضهُ وأعْرض عنْ بعْض فلمَّا نبَّأها به قالتْ منْ أنْبأك هذا قال نبَّأني الْعليمُ الْخبيرُ﴾ التحريم:٣. كاتێ كە پێغەمبەرﷺ بە نهێنی قسەیەكی دركاند لای هەندێ لە ژنەكانی ئنجا كە ئەو ژنە قسەكەی ئاشكرا كرد و خواش پێغەمبەریﷺ ئاگاداركرد، پێغەمبەر هەندێك لەقسەكانی باسكرد و هەندێكی باس نەكرد، ئنجا كە پێی وت، ژنەكەی وتی: كێ ئەمەی پێ وتیت؟

فەرمووی: خوای دانا و ئاگادار پێی وتووم. ﴿ إنْ تتُوبا إلى اللّه فقدْ صغتْ قُلُوبُكُما وإنْ تظاهرا عليْه فإنَّ اللّه هُو موْلاهُ وجبْريلُ وصالحُ الْمُؤْمنين والْملائكةُ بعْد ذلك ظهيرٌ﴾ التحريم:٤.

ئەی (حەفصەو عائیشە) ئەگەر هەردوكتان پەشیمان ببنەوە و بابدەنەوە بەلای خواو پێغەمبەرا جێی خۆیەتی، چونكە بەڕاستی دڵتان لەڕێی راست لایدا، وەئەگەر پشتی یەكتر بگرن لەسەر بەربەرەكانێی پێغەمبەر هیچتان بۆ ناكرێت چونكە بێگومان خواوجبریل و موسڵمانانی باش پشتیوانی ئەون، وە هەرچی فریشتەی تریش هەیە هەمووی هاوپشت و یارمەتیدەری ئەون. ئنجا ئەیان ترسێنی بەتەلاق دان:

﴿ عَسَى رَبُّهُ إِنْ طَلَّقَكُنَّ أَنْ يُبْدِلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِنْكُنَّ مُسْلِمَاتٍ مُؤْمِنَاتٍ قَانِتَاتٍ تَائِبَاتٍ عَابِدَاتٍ سَائِحَاتٍ ثَيِّبَاتٍ وَأَبْكَارًا﴾ التحريم:٥. هیوا وایه ئەگەر ئێوه تەلاق بدات، خوای ئەو لە جیاتی ئێوە ژنانێکی چاکتر لەئێوەی بداتێ، کە هەمووشیان موسڵمان و بڕوادر و نزاکار و تەوبەکار و خواپەرست و کۆچکەربن لەڕێی خوادا، لەبێوەژن ولە کچ.

بەم سەرەتای سوورەتە کە هاتە خوارەوە، وە بەم ئامۆژگاری یە بۆ پێغەمبەرو خێزانەکانی، کێشەکە چارەسەر بوو، هەموو شت چووەوە جێی خۆی و پێغەمبەرﷺ هیچ لەدڵیا نەماو، پێغەمبەرو ماڵ و خێزانی ژیانیان وەك سەعات کەوتەوە گەڕو دەستی کردەوە بەبڵاوکردنەوەی پەیامی خوا و، کەوتە دانانی بناغەی ئاینێکی جیهانی و، دروستکردنی گەلێکی نموونەیی و، رێکخستنی دەوڵەتێکی ئیسلامی، لەسەر شێوەیەکی تازەی خوایی کەتائێستا نموونەی نەبینرابێ.

بەڕاستی ئەم پێغەمبەرە گەورەیەو ئەم خێزانە پیرۆزە، ئەوە ئەهێنێ کە خوای گەورەی مەزن بەم جۆرە بەتەنگی یەوە بێت، چونکە خۆی پێغەمبەرەکەی هەڵبژاردووە بۆ ئەوەی بیکا بەدواترینی پێغەمبەران، وە بەسەرمەشقی هەموو ئادەمیان، وە خێزانەکانیشی بکا بە نموونە بۆ هەموو خێزانێکی موسڵمان. (تەفسیری خاڵ جزئی بیست وهەشتەم - سورەتی تەحریم).

***

## دوژمنی خوا مەگرن بەدۆست:

کاتێك پێغەمبەر ﷺ ویستی فەتحی مەککە بکات، نهێنی بەکەس نەوت و دوعای کرد کە خوا ئەم دەنگوباسە بشارێتەوە و نەگات بە قورەیش،تا شەڕ روونەدات و خوێن نەڕژێت، حاتەبی کوڕی ئەبی بەلتەعە کە لە بەدردا بەشداری کردبوو، نامەیەکی بەدزیەوە بە ژنێکدا نارد بۆ قورەیش لەو بارەیەوە، کە خوا کەشفی کرد و چوون ژنەکەیان گرت و نامەکەیان هێنایەوە بۆ خۆشەویست ﷺ وموحاسەبەی حاتەبی کرد، عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ حاتەب خیانەتی کردووە رێمبدە بابیکوژم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: وازبێنە عومەر ئەو یەکێکە لەوانەی غەزای بەدری دیوە، لەوانەیە خوا لوتفی زۆری لەگەڵ خەڵکی بەدردا کردبێت و فەرموبێتی: چی دەکەن بیکەن من لێتان خۆش بووم.

عومەر فرمێسك بە چاویا هاتە خوارەوەو وتی: خواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن..ئنجا ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە:

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا بِمَا جَاءَكُمْ مِنَ الْحَقِّ يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَنْ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ إِنْ كُنْتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَادًا فِي سَبِيلِي وَابْتِغَاءَ مَرْضَاتِي تُسِرُّونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ وَأَنَا أَعْلَمُ بِمَا أَخْفَيْتُمْ وَمَا أَعْلَنْتُمْ وَمَنْ يَفْعَلْهُ مِنْكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ﴾ الممتحنة:١.

ئەی ئیمانداران! دوژمنانی من و دوژمنانی خۆتان مەگرن بە دۆست. ئێوە ئەوانتان خۆش دەوێ و میهرەبانیان لەگەڵ دەکەن، لە حالێکدا ئەوان بە ئەوی لە حەق و حەقیقەت بۆتان هاتووە ئیمان و باوەڕیان نییە. پێغەمبەر و ئێوەیان (لە شار وجێ ورێی خۆتان) دەرکردووە لەبەر ئەوە ئیمانتان بە خودای پەروەردگارتان هێناوە. (ئەوان بە دۆست مەگرن و خۆشەویستیان لەگەڵ مەکەن) ئەگەر بۆ

جیهاد و تێکۆشان لە ڕێگای من و بۆ وەدەستهێنانی ڕەزامەندی من (کۆچتان کردووە و لە زێد و نیشتمانی خۆتان) هاتوونە دەرێ. بەنهێنی خۆشەویستی و دۆستایەتی لەگەڵ دەکەن، لە حاڵێکدا من (لە هەموو کەس) ئاگادارتر لە ئەوەم کە دەی شارنەوە و لە ئەوەی ئاشکرای دەکەن. هەرکەس لە ئێوە ئەو کارە بکا ڕێگای ڕاستی (بەختەوەری) ون کردووە.

﴿ إِنْ يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُوا لَكُمْ أَعْدَاءً وَيَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُمْ بِالسُّوءِ وَوَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ ﴾ الممتحنة:٢. ئەگەر بەسەرتاندا زاڵ بن و وەدەستتان بخەن، دەبنە دوژمنتان، وە دەست درێژیتان لێ دەکەن و زبانیان بە خراپەتان دەگێڕن. وە ئارەزوو دەکەن بریا و خۆزگا کافر دەبوون (و دینی ئیسلامتان وەلا دەنا).

﴿ لَنْ تَنْفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ الممتحنة:٣.

هەرگیز خزمانتان و منداڵانتان (لە قیامەتێ) قازانجتان پێ ناگەیەنن و کەڵکیان بۆتان نییە. لە ڕۆژی قیامەت دا خودا داوەری و قەزاوەت لە بەینتان دەکا. وە خودا دەبینێ هەر کار و بارێك کە دەیکەن.

## خوا لێت خۆش بێت

کاتێك پێغەمبەرﷺ ویستی بچێ بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ڕۆمەکان لە تەبوك، بە ئاشکرا نیەتی خۆی بە هاوەڵانی فەرموو، کە نیازی جەنگی ڕۆمان هەیە و بە چاکی خۆتان ئامادە بکەن، ڕێگاکە دووربوو، هاوین و گەرم بوو، کاتی هەڵگرتنەوەی بەرووبووم بوو، جەنگەکە ئەوەندە قورس بوو ناونرا (غزوة العسرة).

بڕواداران کەوتنە خۆ ئامادەکردن، بەلام دووڕووەکان کەوتنە بڕوبیانوو هێنانەوە، هەرکەسەو بەجۆرێك دەهاتە خزمەت پێغەمبەرﷺو داوای مۆڵەتی دەکرد، ئەویش سەیری روکەشی دەکرد و عوزرەکەی لێوەردەگرت. قورئان دابەزیە خوارەوە و دووڕووەکانی ئاشکراکردو پیلان و مەرامەکانیانی خستەڕوو بەمەش سوورەتی تەوبە ناونرا سوورەتی (الفاضحة) کە فەزحی دووڕووەکانی کرد.

ئەوانـەی کە نەچـوون بـۆ جەنـگی تەبـوك

١ - علی کوڕی ئەبی تالیب کە حەزرەتﷺ فەرمانی پێدا لە مەدینە بمێنێتەوە، علی حەزی دەکرد بچوایە بۆ جیهادو فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ لەگەلّ ژنان و منداڵاندا بم؟ ئەویش فەرمووی: حەزناکەی بۆ من وەك هارون بی بۆ موسا، بەس ئەوەندە هەیە کە پێغەمبەر نیە لەدوای من.

٢ - ئەوانەی کە بێ توانا و بێ دەسەلات بوون نەیانبوو تفاقی جەنگی ئامادەبکەن، ئەمانەش بیانوی تەواویان هەبوو، هیچیان نەهاتە سەر.

٣ - ئەوانەی دواکەوتبوون و بڕواداربوون و توانایان هەبوو، بەهەرحالێك بێت دوای سوپاکە کەوتن و لەرێ پێیان گەیشتنەوە وەك (أبی خیثمة).

٤ - ئەوانەی کە بڕواداربوون و بەبێ بیانوو نەچووبوون بۆ غەزاو کە خۆشەویستﷺ هاتەوە دانیان بە هەلّەکەی خۆیاندا ناو بەڕاستی قسەیان کرد وەك (کعب کوڕی مالك، هیلال کوڕی ئومەیە، مەرارە کوڕی رەبیع) کەئەمانەش خوا بەئایەت دوای پەنجا رۆژ تەوبەکەیانی قبولّ کرد.

٥ - ئەو دووڕوانەی بەبێ عوزر نەچوون بۆ غەزاکە ئەمانەش بە ڕووکەش هاتنە خزمەت خۆشەویستﷺو داوایان کرد کەڕێیان بدات لەمەدینە بمێننەوە، بەدرۆ دەیان ویست خۆیان بپەڕێننەوە.

بەڕاستی ئەم ئایەتانەی سورەتی تەوبە کەدووڕووەکان ئاشکرا دەکات و بە خۆشەویستﷺ دەفەرموێت: نەدەبوایە مۆڵەتت پێ بدانایە تا بەتەواوی دەرکەوتنایە بۆ موسڵمانان، ئەو ئایەتانە ئەگەر لێیان وردبینەوە بەڵگەی ئاشکران لەسەر ئەوەی کەخۆشەویستﷺ لەئاسمانەوە ڕێنمایی دەکرێت و ئەم قورئانە لەخواوە نێردراوە.

سەیرکەن چۆن قورئان ڕێنمایی پێغەمبەرﷺ دەکات و دەفەرموێت: ﴿ لَوْ كَانَ عَرَضًا قَرِيبًا وَسَفَرًا قَاصِدًا لَاتَّبَعُوكَ وَلَكِنْ بَعُدَتْ عَلَيْهِمُ الشُّقَّةُ وَسَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَوِ اسْتَطَعْنَا لَخَرَجْنَا مَعَكُمْ يُهْلِكُونَ أَنْفُسَهُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ التوبە: ٤٢.

واتە: ئەی پێغەمبەرﷺ ئەگەر لەجیاتی بەشداری لەغەزای تەبوك دا، داوای کارێکی نزیکت لێ بکردنایە کەسوودو قازانجێکی دونیایی تیابوایە، یان سەفەرێکی کورت بوایە، ئەوانەی کە سستن دەکەونە شوێنت، بەڵام چونکە ڕێگەکەیان لەلا دوورەو ماندوبوون و زەحمەتی تیادایە، نەهاتن و بەجێمان، جا کەلەغەزاکە گەڕایتەوە دێنە لات و مەعزەرەتت بۆ دێننەوەو سوێند بەخوا دەخۆن و دەڵێن: ئەگەر بمانتوانیایەو خاوەن ماڵ وتوانا بوینایە لەگەڵتا دەهاتین و بەجێ نەدەماین، جابەسوێند خواردنی درۆو بەهۆی خۆدزینەوەیان لەغەزاکە، خۆیان دەفەوتێنن و ڕێگای چوونە دۆزەخ بۆ خۆیان خۆش دەکەن، خودا دەزانێت ئەوەی کەدەیلێن، درۆ دەکەن ودرۆزنن.

سەیری وشەی (سيحلفون الله) بکە کەهەواڵێکی غەیبیەو خوای گەورە دەفەرموێت ئاوا دەڵێن کەگەڕانەوە، ئەگەر خوانەبێ کێ دەزانێ کەپێغەمبەرﷺ گەڕایەوە دێنەلای و سوێند دەخۆن، باشە خۆ ئایەتەکان بەئاشکرا کەپێش وەخت هاتنەخوارەوە دەخوێنرایەوەو هەموو کەس دەیزانی بامونافیقەکان نەهاتنایەو

سوێندیان نەخواردایەو خۆیان ئاشکرا نەکردایە، کەچی (سبحان الله) هەروەك خوا چۆن هەواڵی دابوونێ هاتن و سوێندیان خواردو درۆکانیان ئاشکرا بور، کەئەمش بەڵگەی زانست و عیلمی بێ پایانی خوایە، کەئەم قورئانەش فەرمایشتی پیرۆزی ئەوە، ئنجا قورئان بەنەرمی و بەناسکی گلەیی لەخۆشەویستﷺ دەکات و دەفەرموێت: ﴿ عَفَا اللَّهُ عَنْكَ لِمَ أَذِنْتَ لَهُمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَتَعْلَمَ الْكَاذِبِينَ ﴾ التوبە:٤٣. خوا لێت خۆش بێت، بۆچی مۆڵەتت دان و ئیزنی ئەوانەت دا کەنەیەن بۆ غەزاو بەجێ بهێنن؟ دەبور مۆڵەتت پێ نەدانایە تا بۆت دەربکەوێت کێ راستگۆیەو کێ درۆزنە، چونکە وەنەبێت گەر ئیزنت نەدانایە بهاتنایە لەگەڵتاندا، جانەوکاتە درۆکانیانت بۆ ئاشکرا دەبوو.

ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خۆشەویستﷺ بەئەمینی هەموو قورئانی گەیاندووە، تەنانەت ئەم ئایەتە کەبۆ راست کردنەوەو گلەیشی تیایە بۆی.

جابەڕاستی چەند لەقورئان وردبینەوە هێشتا هەرکەمە کەموعجیزەی گەورەی پێغەمبەرەو هەتا قیامەتیش بەموعجیزەیی دەمێنێتەوە.

ئنجا دەفەرموێت ﴿ لَا يَسْتَأْذِنُكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَنْ يُجَاهِدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالْمُتَّقِينَ ﴾ التوبە:٤٤. ئەوانەی کە باوەڕیان بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە، داوای ئیزنت لێناکەن بۆئەوەی بەماڵ وگیانیان بەشداری جیهاد نەکەن، بەڵکو ئامادەی بەجێهێنانی هەموو فەرمانێکن و خواش زۆر زاناو ئاگادارە بەو کەسانەی کەباوەڕی تەواویان هەیەو بەجوانی خوا دەپەرستن و،خۆیان لەنافەرمانی و بەجێمان لە ڕاپەڕاندنی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەر دەپارێزن.

﴿ إِنَّمَا يَسْتَأْذِنُكَ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَارْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ فَهُمْ فِي رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ ﴾ التوبە:٤٥. بەڕاستی تەنها ئەوانە مۆڵەتت

لێدەخوازن کە باوەڕیان بەخواو بەڕۆژی دوایی نیەو، دڵیان لەڕوناکی ئیمان خاڵیەو، هەمیشە گومانیان لەدڵدایەو لەناو دڵەڕاوکێی خۆیاندا سەرلێشێواو گومڕان. پاش ئەوەی قورئان هەڵس وکەوت و کاروکردەوەی دووڕووەکان زیاتر ئاشکرا دەکات کەخوێنەری بەڕێز خۆی دەتوانێت لەپەڕاوێکی تەفسیردا سەیری بکات، ئنجا دەفەرموێت: ﴿ **سَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ إِذَا انْقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُوا عَنْهُمْ فَأَعْرِضُوا عَنْهُمْ إِنَّهُمْ رِجْسٌ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ** (٩٥) **يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْا عَنْهُمْ فَإِنْ تَرْضَوْا عَنْهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَرْضَى عَنِ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ** ﴾ التوبه:٩٦.

کاتێك ئێوە دەگەڕێنەوە لەغەزاکەتان، ئەو دووڕووانە سوێندتان بۆ دەخۆن بەخوا کەتوانایان نەبوو بەشداری بکەن لەگەڵتاندا، جا ئەو سوێندەیان بەدرۆ دەخۆن بۆ ئەوەی وازیان لێبێنن و لۆمەیان نەکەن، ئەوانە بەدخو وپیس وچەپەڵن، ئێوەش پشتیان تێبکەن و گوێیان مەدەنێ، جێگەی ئەوانە ئاگری دۆزەخ بەهۆی ئەو کردەوە خراپانەیانەوە کەدەیانکرد، هەروەها بەهۆی دووڕوویانەوە. سوێندتان بۆ دەخۆن بەخوا کەئەوان راستگۆن بۆئەوەی لێیان رازی بن، جائەگەر ئێوە لێیان رازی بن و بڕوایان پێبکەن، ئەوە بێگومان خوا لێیان رازی نابێت کەئەوان لەڕێی راست لایان داوەو فاسقن.

سەیری وشەی (سیحلفون) بکەرەوە کەباس لەوە دەکات کەئەمان گەڕانەوە لەغەزاکە ئەوان دێن سوێند دەخۆن و هەوڵی خۆپەڕاندنەوە دەدەن، کەدیارە ئەمەش تەنها لەعیلمی خوادا بووە کەعالیمی غەیبەو ئەزانێ لەداهاتوودا چی دەبێت. جا کەگەڕانەوە لەغەزاکە هەروەك چۆن قورئان هەواڵی دابوو پێش وەخت، دووڕووەکان هاتن و کەوتنە سوێندخواردن و درۆکردن بۆ خۆقوتارکردن لەوحاڵە ناحاڵەی کەتێی کەوتبوون.

هەروەها لەئایەتی ٩٤دا دەفەرموێت: ﴿ يَعْتَذِرُونَ إِلَيْكُمْ إِذَا رَجَعْتُمْ إِلَيْهِمْ قُلْ لَا تَعْتَذِرُوا لَنْ نُؤْمِنَ لَكُمْ قَدْ نَبَّأَنَا اللَّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ وَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ التوبة:٩٤. کە لەغەزاکە گەڕانەوە دێن مەعزەرەتتان بۆ دێننەوە، پێیان بڵێ: مەعزەرەت مەهێننەوە، بڕواتان پێناکەین، چونکە خوا بەوەحی لەگشت هەواڵێکتان ئاگاداری کردوین، جا خوای گەورە کردەوەکانتان دەبینێت، پێغەمبەرەکەشی هەڵس وکەوتتان دەبینێت، خۆتان چاك بکەن چونکە سەرەنجام دەمرن و دەگەڕێنەوە بۆ لای خوای زانای ئاگادار بەگشت شتێکی ئاشکراو شاراوە، جا ئەوکاتە هەرچیتان کردووە دەیخاتەوە پێش چاوتان و جەزای خۆتان وەردەگرن.

## مزگەوتی ضرار

ئەبو عامری راهیب لە ناو هۆزی خەزرەجدا کە سایەتیەکی ناودار بوو، دژایەتی ئیسلامی دەکرد و موسڵمان نەبوو، لەم لاشەوە گەورەی ئەوسەکان (عبداللە کوڕی ئوبەی کوڕی ئەبی سەلول) کە زەعامەتی لە دەست چوو بەهاتنی خۆشەویستﷺ بۆ مەدینە، بە سەرزارەکی موسڵمان بوو، لە ژێریشەوە خەریکی پیلان گێڕی و دووڕوویی بوو.. ئەم دووانە رێکەوتن لەسەر دژایەتی ئیسلام، کە عبداللە لەناو مەدینەدا بمێنێتەوە و ئەبو عامریش بچێتە دەرەوەو، لە مەککە خەڵکی هان بدات دژی محمد و یارەکانی. بۆ پتەوکردنی پەیوەندیشیان عبداللە جەمیلەی کچی دا بە حەنزەڵەی کوڕی ئەبو عامری راهیب، کەچی بەویستی خوا حەنزەڵە ئەو بڕوادارەی لێ دەرچوو کە لەجەنگی ئوحودا شەهیدکرا و مەلائیکەت شتیان.

له كاتی شەڕی تەبوك دا دوورڕووەكان وەك پیلانێكی نێودەوڵەتی بۆ ئینقلابێكی عەسكەری لە مەدینەدا، مزگەوتی (ضراريان) دروست كرد لە نزیك مزگەوتی (قوبا) تایبێتە مولگە و بنكەی دوورڕووەكان و، لەوێدا كۆبوونەوە بكەن تائەوكاتەی كە ئەبو عامری فاسق لە دەرەوە سوپای رۆمەكان دەهێنێتە سەر مەدینە و بەهاوكاری دەرەوە و ناوەوەی دوورڕووەكان دەوڵەتی ئیسلامی بڕوخێنن.

هاتنە لای پێغەمبەرﷺ بۆ ئەوەی نوێژێكی تیا بكات تا مزگەوتەكەیان شەرعیەت پەیدا بكات، ئەویش بەقەدەری خوا فەرمووی جاریٚ لەسەر سەفەری تەبوكین كە گەڕاینەوە نوێژی تیا دەكەین، كاتیٚ گەڕایەوە لە ڕێگا سورەتی تەوبە هاتە خوارەوەو پیلانەكەیانی بۆ پێغەمبەرو موسڵمانەكان ئاشكرا كرد و ئەویش چەند كەسێكی ناردو مزگەوتەكەیان رووخاند، جا بەڕاستی ئەم چەند ئایەتە بەڵگەی روون وئاشكران كەحەزرەتﷺ غەیب نازانیٚ و خوای گەورە لەنهێنیەكان ئاگاداری دەكات، لەڕێی ئەو قورئانەی كەبۆی ناردۆتە خوارەوە هەروەك دەفەرمویێت:

﴿ **وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًا بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِمَنْ حَارَبَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ مِنْ قَبْلُ وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَا إِلَّا الْحُسْنَى وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ** ﴾ **التوبة:١٠٧**.واتە: ئەو دوورڕووانەی كە مزگەوتێكیان دروست كرد بۆ زەرەردان و بلاوكردنەوەی بێباوەڕی و نانەوەی دووبەرەكی لەنێوان بڕواداران داو، كردیان بەجێگەی پیلان گێڕان و، ئەوكەسانەی تیا كۆدەبوویەوە كەپێشتر دوژمنایەتی خواو پێغەمبەریان دەكرد و، بەگەرمی سوێندیان دەخوارد كەئێمە تەنها مەبەستمان چاكە بووە، خوا شایەتی ئەدات كەئەوان درۆ دەكەن.

﴿ **لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا لَمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَنْ تَقُومَ فِيهِ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَنْ يَتَطَهَّرُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ** ﴾ **التوبة:١٠٨**.
هەرگیز لەو مزگەوتەدا مەوەستەو نوێژمەكە، ئەو مزگەوتە شایستەیە كەتۆی

تیابوەستی کەمەر لەیەکەم رۆژەوە لەسەر بنچینەی تەقواو خواناسی دروست کراوە، ئەو مزگەوتە کەسانێکی تیایە کەزۆر حەز دەکەن خاوێن بن لەدەروون و روالەتدا، خواش پاکانی خۆش دەوێت. ﴿ لَا يَزَالُ بُنْيَانُهُمُ الَّذِي بَنَوْا رِيبَةً فِي قُلُوبِهِمْ إِلَّا أَنْ تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ التوبة:١١٠. ئەو بینایەی دروستیان کردووە گومانە لەدلّیانا مەگەر دلّیان بپچڕێت،وەخوا زانای کاردروستە..

## پاک وبێگەردی خاتوو عائیشە

لە غەزای بەنو موستەلّەق دا خاتوو عائیشە لەگەلّ پێغەمبەردا بووﷺ، کاتێك لە غەزاکە گەڕانەوە لە شوێنێك لایان دا،خاتوو عائیشە بۆ کارێکی پێویستی خۆی دوورکەوتەوە، ملوانکەی خوشکەکەی ون کرد، گەڕایەوە بیدۆزێتەوە، تا هاتەوە سوپاکە رۆشتبوو ئەوانەی کە کەژاوەکەیان بەرزکردبووەوە بۆسەر حوشترەکەی هەستیان نەکرد بوو کە تیایدا نیە، ئەمیش کە گەڕایەوە کەسی لیّ نەبوو دانیشت دەیزانی دەگەڕێنەوە بۆ لای خەوی لێکەوت، لە دەنگی (صفوان کوڕی معطل) خەبەری بووەوە کە ئەویش دواکەوتبوو کەئەمی بینی (انا لله وانا الیە راجعون) ی دەوت، ئنجا چۆکی بە حوشترەکەی دادا تاعائیشە سەربکەوێت، پاشان لغاوی حوشترەکەی گرت و هاتنەوە بۆ لای سوپاکە، دووڕووەکان کە ئەمەیان بینی کەوتنە بوختان کردن بۆیان، ئەمە یەك مانگی خایاند، زۆر قورس و گران بوو لەسەر پێغەمبەر و یاران.

پێغەمبەرﷺ کە وەحی دواکەوت، پرسی بە ئیمامی عەلی کرد، ئەویش بە ئاماژە وتی دەتوانی تەلاّقی بدەیت، بەلاّم کە پرسی بە ئوسامە و چەند کەسێکی تر کرد وتیان تەلاّقی مەدە و گویّ مەدە بە قسەی دوژمنان.

عائیشه له ماڵی باوکی شیوەنی دنیای کرد و چاوەڕێی ئەوەی دەکرد که خوا خەوێك شتێك پیشانی پێغەمبەر بدات و بێ تاوانی ئەم دەربکەوێت، که چی خوای گەورە ئایەتی ناردە خوارەوە و پاك وبێگەردی خاتوو عائیشەی بەیان کرد کەبەڕاستی بەڵگەی روون وئاشکرایە کە ئەم قورئانە لەخواوەیەو کاری مرۆڤ نیە.

هەروەك دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَكُمْ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَكُمْ لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ مَا اكْتَسَبَ مِنَ الْإِثْمِ وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ النور:١١. واته: بێگومان ئەوانەی بوختانەکەیان هەڵبەست دەستەیەك بوون لە ئێوە، وامەزانن کە ئەو بوختانە شەڕ وخراپ بوو بۆتان، بەڵکو خێربوو بۆتان تا ئیماندار و دووڕوو جیابێتەوە، بێگومان تاوانی هەرکەس لەو بوختانچیانە لە گەردنی خۆیەتی، ئەو کەسەش سەرۆکایەتی ئەو کارەی کرد سزایەکی سەخت و گەورەی بۆ ئامادەیە.

﴿ لَوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ الْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بِأَنْفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُوا هَذَا إِفْكٌ مُبِينٌ ﴾ النور:١٢. دەبوایە کە هەرئەو بوختانەتان بیست ئیماندارانی پیاو و ئافرەت گومانی چاکیان بە خۆیان ببردایە و دڵنیابوونایە لەپاکی خۆیان و بیانوتایە ئەمە بوختانێکی ئاشکرایە و کاری وا لەدایکی موسڵمانان ناوەشێتەوە.

﴿ لَوْلَا جَاءُوا عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا بِالشُّهَدَاءِ فَأُولَئِكَ عِنْدَ اللَّهِ هُمُ الْكَاذِبُونَ ﴾ النور:١٣. (ئەمە تەرازووی ئاسمانە، بوختان کردن هەروا گاڵتە نیە) دەبوایە بوختانچیەکان چوارشایەتیان بۆ سەلماندنی بوختانەکەیان بهێنایە، کاتێك چوار شایەتیان نەهێنا، ئەوە ئیتر دیارە ئەوانە لای خواش لە ڕیزی درۆزنەکانن.

﴿ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ لَمَسَّكُمْ فِي مَا أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ النور:١٤. خۆ ئەگەر فەزڵ و بەزەیی خوا و بەخشندەییەکەی نەبوایە لەسەرتان لە دونیا و قیامەت دا، بەهۆی ئەو تاوانەتانەوە

سزایەکی زۆر گەورەو سەختتان توش دەبو، بەهۆی رۆچونتان لەودەنگ و باسەدا.

﴿ إِذْ تَلَقَّوْنَهُ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُمْ مَا لَيْسَ لَكُمْ بِهِ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُ هَيِّنًا وَهُوَ عِنْدَ اللَّهِ عَظِيمٌ ﴾ النور:١٥. ئەوە بۆ دەماو دەم قسە وەردەگرن و شتێك دێ بەدەمتانا کە زانیاریتان نیە پێی و بەشتێکی سادە و ئاسانی دەزانن لە کاتێکدا لای خوا زۆر گەورە و نابەجێ یە.

﴿ وَلَوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُمْ مَا يَكُونُ لَنَا أَنْ نَتَكَلَّمَ بِهَذَا سُبْحَانَكَ هَذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ ﴾ النور:١٦. دەبوایە کاتێك گوێتان لەوە بوو، بتانوتایە: ئێمە بۆمان نیە قسەی وا بکەین، پاکی و بێگەردی بۆ خوا، ئاخر ئەمە بوختانێکی زۆر گەورەو ناقۆلایە.

﴿ يَعِظُكُمُ اللَّهُ أَنْ تَعُودُوا لِمِثْلِهِ أَبَدًا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ ﴾ النور:١٧. خوا ئامۆژگاریتان دەکات کە نەکەن هەرگیز شتی وا دووبارە بکەنەوە ئەگەر ئێوە بڕوادارن، خوا ئایەت و ڕێنماییەکانی روون دەکاتەوە بۆتان، بێگومان خوا زانا و دانایە.

کاتێ کە وەحی دابەزی یە سەر پێغەمبەرﷺو بەرائەتی عائیشەی راگەیاند خۆشەویستﷺ دڵی خۆش بوو پێدەکەنی، یەکەم وشە لە دەمی پیرۆزی دەرچوو فەرمووی: عائیشە خوای گەورە بێگوناهی تۆی راگەیاند.

دایکی عائیشە بە عائیشەی وت: هەستە سوپاسی پێغەمبەر بکە ﷺ.

عائیشەش بەنازی بێ گوناهی و پاش ئەو هەموو زوخاوەی کە مانگێك چوو بەسکیا، وتی: وەڵاهی ناچم، جگە لە خوا سوپاسی کەس ناکەم.

پاش یەك مانگ گومانەکان رەوینەوە، عبداللە ی کوڕی ئوبەی سوك و ڕیسوا بوو، ئیتر خزمەکانی خۆی لۆمەیان دەکرد و ڕێگریان لێ دەکرد. یەك مانگی

رەبەق خوای گەورە کۆمەڵگەی موسڵمانانی سەرقاڵ کرد و ڕاحاوی دانەوە، پەندێکی دادان کە تاقیامەت بەسیان بێت.

ئەگەر قورئان بە دەست پێغەمبەرﷺ بوایە هەر زوو فریای خۆی و خێزانی و موسڵمانان دەکەوت و بەرائەتی عائیشەی دەسەلماند، بەلام نەخێر قورئان بە ویستی خوا لە کاتی پێویستدا کە خوا دەیزانێ دادەبەزێت.

## مشتە خاکێ لە شەوی هیجرەتدا:

ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ هەمووی نیعمەتی خوان و پێویستە هەردەم سوپاسی خوای لەسەر بکەین، بۆ نموونە جومگەکان و جووڵەیان، کە هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویێت: (يصبح على كل سُلامى من أحدكم صدقة، فكل تسبيحة صدقة، وكل تحميدة صدقة، وكل تهليلة صدقة، وكل تكبيرة صدقة،وأمر بالمعروف صدقة ونهي عن المنكر صدقة، ويجزيء من ذلك ركعتان يركعهما من الضحى) ـ موسلیم گێڕاویەتیەوە، واتە: بۆ جوڵانی هەموو جومگەیەك لە لەشدا هەق وایە مرۆڤ خێرو چاکەیەك بکات، جا هەموو(سبحان الله، الحمد لله، لاإله إلا الله، الله أكبر) یەك خێرو چاکەن، فەرمان دان بە چاکەو جڵەو گیری لە خراپەش چاکەن،وە کردنی دوو ڕکاتی نوێژی چێشتەنگاو جێی ئەوانەش دەگرێتەوە.

چاو کە نیعمەتێکی زۆر گەورەیە، مرۆڤ بەهۆیەوە دنیای روون دەبینێ، ئەگەر خوای پەروەردگار لێی سەندەوەو ئارامی لەسەر گرت، پاداشتەکەی بەهەشتی بەرینی هەتا هەتایی یە، هەروەك پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموویێت (إن الله عز وجل قال: إذا ابتليت عبدي بحبيبتيه فصبر عوضته منهما الجنة) بوخاری گێڕاویەتی یەوە، واتە:(خوای پەروەردگار دەفەرموویێت: هەر بەندەیەکم تاقیکردەوەو دوو

خۆشەویستەکەیم لێ سەندەوە (کە چاوە) و ئارامی گرت، لەجیاتی چاوەکانی بەبەهەشت پاداشتی دەدەمەوە).

لە نیعمەتی چاوەوە ئەوە تێدەگەین، کە خوایەك بتوانێ، بەنیعمەیەکی لە خوێن و گۆشت دروست بوو، دوو چاو ببەخشێ کە دنیای پێ ببینین، باشە دەبێت خۆی کە خاوەنی ئاسمانەکان و زەوی یە و تواناو دەسەلاتی بێپایان و بێ سنوورە، چەندە ئاگاداربێت و چۆن هەموو شتەکان ببینێ و تەنانەت مسقالە زەڕەیەکیشی لێ ون نەبێت... قورئان مرۆڤ بەمە هوشیار دەکاتەوە (یقول أهلکت مالا لبدا، أیحسب أن لم یره أحد، ألم نجعل له عینین) البلد/٨، واتە:(مرۆڤی وا هەیە دەڵێت : ماڵ و سامانێکی زۆرم بەخت کردووە، باشە وا دەزانێ کەس چاوی لێ نیەو کەس ئاگادار نیە پێی؟

چۆن دەبێ ئاوا بیر بکاتەوە؟ئایا ئێمە دوو چاومان نەداوەتێ؟

باشە ئێمە بتوانین دوو چاو بدەین بەو، ئایا خۆمان نابینایین و ئەو نابینین کە چی بەخت کردووەو چی نەکردووە!!)...

بەڵێ...خوا چاوی داوەو کە مەبەستی بوو لەکاری دەخات، ئنجا کاتی بێت یان بە یەکجاری...بۆ نموونە رۆژێك ئەبوبەکروپێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) دانیشتبوون و ژنی ئەبولەهەب هات بەتوڕەیی و چنگێ بەردی پێ بوو، وتی: کوا (محمد) ئێستا بەردە بارانی دەکەم؟ چۆن باسی ئێمەی کردووە؟(مەبەستی سورەتی ـ تبت یدا أبی لهب)بوو... ئەبوبەکر (رەزای خوای لێبێت) خەمی لێهات، پێغەمبەری خوا(ﷺ)بە چرپە پێی فەرموو:خەمت نەبێ ـ إنشاء الله ـ نامبینێ... بەڵێ هاتە ژوورەوەو پێغەمبەری خوای نەبینی (ﷺ).

مامۆستا (محمد قطب) یش بۆمان دەگێڕێتەوە( لە زنجیرە وتارەکانی پەروەردەی ئیسلامیدا ) دەڵێت:

لە ساڵانی پەنجاکاندا، لەگەڵ برایاندا بەند کرابووین، هەواڵیان دایێ کە ئەمڕۆ دەتانگوێزینەوە بۆ بەندیخانەیەکی دیکە، بەڵام وریا بن شتی قەدەغەکراوتان پێ نەبێ.جا ئەوەش کە یاساغ و قەدەغەبوو(پارەو، مقەست و، چەقۆ) بوو...منیش ڕۆژێ لەوەو پێش برایەك کە لای ئێمە گواستیانەوە، بڕی (٢٥) جونەیهی لا دانابووم بە ئەمانەت، ناچار ڕاوێژم لەگەڵ برادەرانی ناو ژوورەکەم دا کرد و وتم: ئەگەر ئەو پارەیە هی خۆم بوایە بێ سێ و دوولێکردن فڕێم دەدا، بەڵام ئەمانەتە نازانم چی لێبکەم دەترسم داوای بکاتەوەو ڕوو زەرد بم لای!

ئەوانیش تەگبیریان بۆ کردم، ئەو بڕە پارەیە بخەمە سەر پینەیەك کە بە ڕۆبەکەمەوە بوو،پاشان جەندرمەکان هاتن و کەوتنە پشکنینمان، برادەرێکیان پێش من پشکنی، تاقە جونەیهێکی پێبوو ئەوەندەیان لێدا هەموو سەرووچاویان کرد بە خوێن.

کە ئەوەم بینی سەرم بەرزکردەوەو وتم: خوایە تۆنەبی کەس نیە لەم دنیایەدا لەدەست ئەم ستەمکارە خوێنمژانە ڕزگارم بکات! ئنجا سەرە هاتە سەر من و کەوتە پشکنینی کەلو پەلەکانم و، خاولیەکەمی پشکنی چۆن پشکنینێك، سەرەتا دەیتەکاند، ئینجا سانتیمەتر بە سانتیمەتر، بگرە ملیمەتر ملیمەتر دەستی پێدا دەگێڕاو سەیری دەکرد، ئنجا هاتە سەر ڕۆبەکە خوا ئاگادارە تەکاندی ئینجا دەستی پیێدا گێڕاو چووە سەر پینەکە و زەق زەق سەیری دەکرد بەفەزڵی خوا نەیبینی و ڕزگارم بوو!.

یان پێغەمبەری خوا (ﷺ)لەشەوی هیجرەتدا، مستێ خۆڵی هەڵدا بەڕووی کافراندا کە چواردەوری ماڵەکەیان تەنی بوو، بۆ ئەوەی بیکوژن... فەرمووی(شاهت الوجوه )بەفەزڵی خوا نەیانبینی و بە سەلامەتی دەرچوو... هەروەك مەحوی دەڵێ:

شەوی هیجرەت کە ئەعدا زۆری هێنا مشتە خاکێ بوو

پیا چەندن، دەبەنگ و کوێرو کەڕ مان ئەو لەعینانە

لەناو ئەوگورگ و ورچ و سەگ گەلە دەرچوو (بإذن الله)

بە یاری غارەوە پێی نایە ئەو چۆڵ و بیابانە

ئەم جۆرە رووداوانە کە موعجیزەی پێغەمبەرن (ﷺ)هەندێکیان بۆ بڕواداران وەك کەرامەتێك دووبارە دەبنەوە، تا زیاتر بڕواداران دڵخۆش و دڵ قایم بن و زیاتر لە قودرەت و توانای پەروەردگاریان تێ بگەن.

لەسەرەتای بەرگی پێنجەمی (کاك ئەحمەدی شێخ لە روانگەی مەکتووباتەکانیەوە) چەند کەراماتێکی کاك ئەحمەدی شێخم باس کردووە، وا لێرەشدا نموونەیەکی دیکەی خواناسێکی بانگخواز تۆمار دەکەم، بەڕێز (دکتۆر عەلی ئیحسان) (کەخەڵکی لای چەمچەماڵەو چەند ساڵە مامۆستایە لەجەددە) بۆی گێڕامەوە کە لە ساڵی (١٩٥٨) دا کە کۆمۆنیستەکان باڵا دەست بوون لە شاری بەغدادا، کۆمەڵێکیان دەچنە سەر قوتابخانەکەی (مامۆستا ئەنوەر)کە یەکێ بوو لە برایانی بەغداو دەڵێن نارۆین تا نەیکوژین، چونکە خەریکی بانگەوازی ئیسلامی یە!.

جەنابی بەڕێوەبەروگشت مامۆستاو زۆرێك لە قوتابیان دەچنە لایان و تکایان لێ دەکەن و لێیان دەپاڕێنەوە کە واز لە (مامۆستا ئەنوەر) بهێنن بێ سوود دەبێت!

هیچ چارێك نامێنێت مامۆستا ئەنوەر مشتێ خۆڵی حەوشەی قوتابخانەکە هەڵدەگرێ و بە بەرەکەتی دوعاکەی پێغەمبەر(ﷺ)هەڵی دەدات و دەڵێت (شاهت الوجوه)... ئینجا مامۆستا دەڵێت نازانم ئەو مشتە خۆڵە چی پێکردن، هەریەکەو نەمزانی بە چ لایەکدا رۆیشتن و خوا رزگاری کردم.

شایانی باسە ئەم (مامۆستا ئەنوەر)ە ژن برای (دکتۆر عادل الشویخ)ی رەحمەتی یە کە لە نەوەدەکاندا هاتە کوردوستان و لە رێی سوسێ وەرگەڕاو لە گردی شێخ ئەحمەدی هیندی نێژرا.

## نەزرەکەی هاوسەری عیمران و زانست وبیستنی خوا:

﴿ إِذْ قَالَتِ امْرَأَةُ عِمْرَانَ رَبِّ إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّي إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾ آل عمران:٣٥. کاتێك ژنی عیمران وتی: ئەی پەروەردگاری خۆم، من ئەوەی لە سکمدایە بۆ تۆ نەزرم کرد (بۆ ئەوەی خزمەتی ماڵی تۆ بکا کە بەیتولموقەدیسە)، جا لێم قەبووڵ کە. بێگومان تۆ بیسەر و ئاگاداری.

﴿ فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنْثَى وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالْأُنْثَى وَإِنِّي سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وَإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴾ آل عمران:٣٦.

جا کاتێك منداڵەکەی بوو، وتی: ئەی پەروەردگاری من، من مێینەم بووە —وە خودا چاکتر دەزانێ چی بووە— و نێروەکوو مێ نییە ،وە ئەمن نێوم نا مەریەم، وە ئەمن ئەو و نەوەی ئەو لە دەستی شەیتانی دەرکراو (لە دەرگای رەحمەتت) دەخەمە پەنای تۆ.

﴿ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنْبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِنْدَهَا رِزْقًا قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّى لَكِ هَذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَرْزُقُ مَنْ يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾ آل عمران:٣٧.

پەروەردگاری مەریەم، مەریەمی بە جوانی وەرگرت، وە (نەمامی وجوودی ئەوی) بە جوانی رواند و گەورەی کرد. وە زەکەرییای (کە مێردی پووری مەریەم بوو) کردە سەرپەرشتی ئەو. هەرکاتێ زەکەرییا دەچووە پەریستشگای ئەو خواردەمەنی (باش و خاسی) لەلای دەدیت (جارێکی) وتی: ئەوەت لە کوێ بوو و لە کوێت بۆ دێ؟ وتی: ئەوە لەلای خوداوە دێ، بێگومان بە هەرکەس کە خودا خۆی بیەوێ رزق و رۆزی زۆر و زەوەند و بێ ئەژمار دەدا.

## پاڕانەوەی زەکەریاو وەڵامدانەوەی خوا:

﴿ هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِنْ لَدُنْكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ ﴾ آل عمران:٣٨.

لە ئەوێ بوو کە زەکەریا هاواری لە پەروەردگاری خۆی کرد و پاڕاوەو وتی: ئەی پەروەردگاری من، لەلای خۆتەوە منداڵانێکی چاك و پاکم بدەیە. بێگومان تۆ بیسەری هاوار و پاڕانەوەی.

﴿ فَنَادَتْهُ الْمَلَائِكَةُ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي فِي الْمِحْرَابِ أَنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَى مُصَدِّقًا بِكَلِمَةٍ مِنَ اللَّهِ وَسَيِّدًا وَحَصُورًا وَنَبِيًّا مِنَ الصَّالِحِينَ ﴾ آل عمران:٣٩.

جا (دوعای زەکەریای قەبوڵ کرد و) لە حاڵێکدا کە لەپەرستگا راوەستابوو نوێژی دەکرد، فریشتان بانگیان کرد و وتیان: خودا موژدەت بە یەحیا پێدەدا. (یەحیا لە کاتی خۆیدا) بڕواهێنەری وتەی خودا (عیسا) وە پێشەوا و سەرۆك، وە بەرکەنار لە هەوا و هەوەسە، وە پێغەمبەرێکە لە (رەگەز و نەژادی) چاکان و باشان.

﴿ قَالَ رَبِّ أَنَّى يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَقَدْ بَلَغَنِيَ الْكِبَرُ وَامْرَأَتِي عَاقِرٌ قَالَ كَذَلِكَ اللَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ ﴾ آل عمران:٤٠. زەکەریا وتی: ئەی پەروەردگاری من چۆن کوڕم دەبێ، لە حاڵێکدا پیری یەخەی گرتووم و ژنەکەم نەزۆکە؟ (خودا بە وەسیلەی فریشتان پێی راگەیاند و) وتی: خودا ئەئاوا ئەوەی بیەوێ دەیکا.

﴿ قَالَ رَبِّ اجْعَلْ لِي آيَةً قَالَ آيَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزًا وَاذْكُرْ رَبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ ﴾ آل عمران:٤١.

(زەکەریا) وتی: ئەی پەروەردگارم نیشانەیەکم بۆ دابنێ (نیشانەیەك کە سکپڕی ژنەکەم بگەیەنێ. خودا پێی راگەیاند و) فەرمووی: نیشانەکەت ئەوەیە کە

ناتوانی تا سێ ڕۆژ لەگەڵ خەڵك قسە بکەی مەگەر بە ئاماژە. وە (لە ئەو سێ ڕۆژەدا بە شوکرانەی نیعمەت) زۆر زکر و یادی پەروەردگارت بکە، وە ئێواران و بەیانیان تەسبیحات بکە.

﴿ وَإِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاكِ وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ عَلَى نِسَاءِ الْعَالَمِينَ ﴾ آل عمران:٤٢. وە (یاد کە) ئەو کاتەی کە فریشتان وتیان: ئەی مەریەم خودا تۆی هەڵبژاردووە و پاك و پاکیزەی (لە گوناهان) کردووی، وە لە سەروەوەی هەموو ژنانی دونیای داناوی.

﴿ يَا مَرْيَمُ اقْنُتِي لِرَبِّكِ وَاسْجُدِي وَارْكَعِي مَعَ الرَّاكِعِينَ ﴾ آل عمران:٤٣. ئەی مەریەم لە بەرابەری پەروەردگاری خۆت کڕنووش بەرە و هەمیشە پەرستیش بکە. وە سوجدە بەرە و بچۆ ڕوکوع لەگەڵ ئەوانەی سوجدە و ڕکوع دەبەن (و نوێژێ دەکەن).

﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنْبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ وَمَا كُنْتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَامَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنْتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ﴾ آل عمران:٤٤.

ئەوە (ی وترا) لە دەنگ و باسەکانی نهێنی وغەیبە بۆتۆی ئەنێرین. وە تۆ لەلای ئەوان نەبووی ئەو کاتە کە قەڵەمەکانی خۆیان (بۆ قورعەکێشان لەنێو ئاو یا کیسە) داویشت تا (ڕوون بێتەوە) کێ لە ئەوان سەرپەرشتی مەریەم دەکا. وە تۆ لەلایان نەبووی ئەو کاتە کە (دەربارەی بەخێوکردن و چاوەدێری لە مەریەم) لەنێو خۆیاندا دەمەقاڵە و کێشەیان دەکرد (هەمووی ئەوانە غەیبە و بە تۆ وەحیی و سرووش دەکرێ).

***

## خوا لەسولتان مەحمود گەورەترە!!

لەقورئاندا جەخت کراوەتە سەرئەوەی کە خوا لەپەرێزدایە بۆ ستەمکاران، مۆڵەتێکیان ئەدات و کە گرتنی مەگەر خۆی بزانێت بەچ دەردێکیان دەبات: ﴿ وَلاَ تَحْسَبَنَّ اللّهَ غَافِلاً عَمَّا يَعْمَلُ الظَّالِمُونَ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ الأَبْصَارُ ﴾ إبراهيم:٤٢. ﴿ إِنَّ رَبَّكَ لَبِالْمِرْصَادِ ﴾ الفجر:١٤.

دکتۆر یوسف کەئێستا لەڕانیە دائەنیشێ، چەند ساڵێك لەمەوبەر لە کەرکوك دەبێت، زەویەك بەرامبەریان دەبێت چی پرسیاردەکات هی کەس نیەو حکومەتیش ڕێگرنیە بکرێت بەمزگەوت، ئەمیش بەیارمەتی خێرخوازان کرێکارو وەستای ئەخاتە سەر، ڕۆژێك پیاوکوژێك لە لاندکرۆزێك دائەبەزێت وئەڵێت: ئەمە زەوی منە هەرچی کاری تیابکات ئەیکوژم!وەستاوکرێکار لەترسا کارەکە بەجێدەهێڵن، بۆ بەیانی دکتۆر یوسف دەچێتە سەر کارەکەو بەتەنها خۆی خەریك دەکات و کابرا دیارنابێت، بۆ ڕۆژی دواتر بەهەرحاڵێك بێت وەستاوکرێکار دەخاتەوە سەری.

دوای دووهەفتە، کابرایەك دێت و پێنج دەفتەر دۆلار دەهێنێت و دەڵێت ئەوە خوێنی براکەمانە وەرمان گرتووەو دایکم ناردوویەتی بۆ ئەم مزگەوتە!!تومەز کابرای پیاوکوژ لەکوڕی ئەوماڵە ئالآوەو کوشتویەتی و گیراوەو لە سوڵحدا ئەو پارەیەی داوە تانەیکوژنەوە و وا ئەو پارەیەش هات بۆ مزگەوت..

سبحانك ربی، خوا تۆڵەی لەوستەمکارە سەند نەك نەیتوانی مزگەوت رابگرێ بەڵکو خوا بەدەردێکی برد کە پێنج دەفتەریش بدا لەسوڵحاو پارەکەش بێتەوە بۆ ئەو مزگەوتەی کە نەیدەهێشت بکرێ.

## مردن وهیدایەت:

ئەبێ بزانین کە مردن بەئیزنی خوایە، هەروەها هیدایەتیش هەر بە ئیزنی خوایە و قسەی خێریش بەئیزنی خوا بەرووبوومی دەبێت:

﴿ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَنْ تَمُوتَ إِلاَّ بِإِذْنِ الله كِتَاباً مُّؤَجَّلاً وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ الآخِرَةِ نُؤْتِهِ مِنْهَا وَسَنَجْزِي الشَّاكِرِينَ ﴾ آل عمران:١٤٥.

﴿ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تُؤْمِنَ إِلاَّ بِإِذْنِ اللّهِ وَيَجْعَلُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لاَ يَعْقِلُونَ﴾ يونس:١٠٠.

﴿ تُؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ بِإِذْنِ رَبِّهَا وَيَضْرِبُ اللّهُ الأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ إبراهيم:٢٥. هاوکاری و یارمەتی پەروەردگار بۆ بانگخوازان و تێکۆشەران بەردەوامە تا قیامەت بە مەرجێك بە چاکی بۆ خوا سوڵحابن، لە پەڕاوەکانمدا باسی تەوفیقاتی خوام کردووە و چاك وایە هەمیشە خۆمان بدەینە دەست خوا و هەر پشت بەو ببەستین و، چی لە تواناشماندایە بۆ چاکسازی جێبەجێ ی بکەین، وەبزانین بازنەی کاری ئێمە ئەوەیە چی بکەین و چۆن بکەین کە بەپێی شەرعی خوابێت، ئنجا چی دەبێت و سەرەنجام بەرەو کوێ دەچین ئەوە لای خوایە. ﴿ إِنْ أُرِيدُ إِلاَّ الإِصْلاَحَ مَا اسْتَطَعْتُ وَمَا تَوْفِيقِي إِلاَّ بِاللّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴾ هود:٨٨.

پیلانیان دانا،پیلانیان لای خوایەو ئاگادارەپێیان، هەرچەند پیلانیان شاخ لەبن دینێ،وامەزانە خوا پەیمانی خۆی ناباتەسەر بۆ نێرراوەکانی،خوا عەزیزو تۆڵەسێنە ﴿ وَقَدْ مَكَرُوا مَكْرَهُمْ وَعِنْدَ اللَّهِ مَكْرُهُمْ وَإِنْ كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ الْجِبَالُ (٤٦) فَلَا تَحْسَبَنَّ اللَّهَ مُخْلِفَ وَعْدِهِ رُسُلَهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ ذُو انْتِقَامٍ ﴾ إبراهيم:٤٧.

## ئیمانهێنان بەزۆر نیەوخوا ئەبیستێ وزانایە

خوای گەورە مرۆڤی سەرپشك كردووە، حەز دەكات مرۆڤ بەئازادی تەواوەوە بەرنامەی ژیانی هەڵبژێرێ. پیاوێكی ئەنصار لە (بەنی سالم كوڕی عەوف) كەناوی (الحصنی) بوو، خۆی موسڵمان بوو بوو، دوو كوڕیشی هەبو هێشتا هەرگاوربوون، حەزی كردووە فشار بخاتە سەریان بۆ موسڵمان بوونیان، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی لەسەری ناردە خوارەوە:

﴿ لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى لَا انْفِصَامَ لَهَا وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ البقرة:٢٥٦.

واتە: ناچاركردن لە دیندا نییە (و دین بە زۆری بەسەر خەڵكدا داناسەپێ، چونكە) بێگومان ڕێنوێنی و ڕاستەڕێی لە گومڕاهی و لاڕێی جودا بۆتەوە. جا هەر كەس لە تاغووت نافەرمانی بكا و بە خودا ئیمان بێنێ، بێگومان دەستی بە دەستەگیرەیەكی زۆر قاییم و مەحكەم گرتووە، دەستەگیرەیەكی وا كە هەرگیز پسان و پچڕانی نییە. خودا زۆر بیسەر و زۆر زانایە.

(عتاب كوری شمیر) دەڵێ: وتم بەپێغەمبەری خوا (د.خ): ئەی نێرراوی خوا باوكێكی پیر و برام هەیە بابیانهێنم بەڵكو لەسەر دەستا موسڵمان بن، ئەویش فەرمووی: ئەگەر موسڵمان بن چاكترە بۆیان، خۆ ئەگەر لەسەر ئایینی خۆشیان بمێننەوە و موسڵمان نەبن، ئەوا ئیسلام پان وپۆڕ و فراوانە واتە: وازیان لێبهێنە بابە ئارەزووی خۆیان بڕیار بدەن و ئیسلام سنگی فراوانە!

## دامەزراوبن خوا ئەتانبینێت:

خوای گەورە بەپێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت: ﴿فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَمَنْ تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْا إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (١١٢) وَلَا تَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ وَمَا لَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ مِنْ أَوْلِيَاءَ ثُمَّ لَا تُنْصَرُونَ (١١٣) وَأَقِمِ الصَّلَاةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ ذَلِكَ ذِكْرَى لِلذَّاكِرِينَ (١١٤) وَاصْبِرْ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ (١١٥)﴾ هود:١١٢-١١٥.

واتە: وەكو چۆن فەرمانت پێدراوە (ئەی محمد) (د.خ) هەروا بەڕاست و بەڕێكی فەرمانەكان بەجێبهێنە، هەروەها ئەوكەسانەش لەگەڵ تۆدان و گەڕاونەتەوە بۆ لای خواو تەوبەیان كردووە، نەكەن لەسنووری فەرمانی خوا دەربچن، چونكە بەڕاستی بینایە بەو كردەوانەی دەیكەن.

نەكەن لادەن و مەیلتان ببێت لەگەڵ ئەوانەدا كەستەمیان كردووە و لەخوا یاخی بوون، چونكە ئەوكاتە ئاگر دەتانسوتێنێت و، جگە لەخواش كەس پشتیوانتان نابێت، لەوەودواش یارمەتی نادرێن.

نوێژیش بەچاكی ئەنجام بدە لەهەردوو سەری ڕۆژەوە كە نیوەڕۆ و عەسرە و لە سێ كاتەكەی شەویشدا كە مەغریب و عیشاو بەیانیە، نزیكن لەئەمسەر و ئەوسەری ڕۆژەوە، بە ڕاستی كردەوە چاكەكان كردەوە خراپەكان لادەبەن و گوناهەكان دەشۆرنەوە،ئەوە ئامۆژگاری و بیرخەرەوەیە بۆ ئەوانەی یادی خوا دەكەن.خۆت بگرە و بەئارامبە، چونكە بێگومان خوای گەورە پاداشتی چاكەخوازان بەزایە نادات.

هاوەڵێك داوای لەخۆشەویست كرد (د.خ) كە شتێكی پێبڵێ لەئیسلامدا، كە پێویست نەكات پرسیار لەكەسی تر بكات ئەویش فەرموی: (قل آمنت بالله ثم استقم) مسلم.

## خوا فەرمانتان پێدەدات ئەمانەت بدەنەوە بەخاوەنی:

کاتێك پێغەمبەر (د.خ) فەتحی مەککەی کرد، کلیلی دەرگای کەعبەی لە (عوسمانی کوڕی تەڵحە) وەرگرت کەلەلای ئەو بوو، لەوکاتەدا کە (عوسمان) دەستی هێنا کلیلەکانی بداتێ، عەبباسی کوری عەبدول موتەلیب وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، دایك و باوکم بەفیدات بێت، بەڵکو کلیلەکان دوایی بدەیت بەمن و لەگەڵ ئەوەدا کە (سقایە) م لایە، واتە: (ئاودان بەحاجیان) ئەمەش لای من بێت.

(عوسمان) کە ئەمەی بیست خەریك بوو دەست بگێڕێتەوە، خۆشەویست (د.خ) فەرمووی: (عوسمان) کلیلەکانم بدەرێ، ئەویش دایە و وتی: دەبگرە ئەوە ئەمانەتەکەی خوا.

پاشان خۆشەویست (د.خ) چووە ناو کەعبەوە و پاکی کردەوە و، ئنجا کەهاتە دەرەوە تەوافی کرد و کلیلەکانی دایەوە دەست (عوسمان) و فەرمووی: ﴿ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُمْ بِهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا ﴾ النساء:٥٨. تا ئێستاش ئەو کلیلەی کەعبە هەر لای ئەو بنەماڵەیەیە (بەنی شەیبە) و کەس لێیان ناسەنێت.

## بەدیهێنەر چۆن ئاگای لەبەندەکانی نیە:

﴿ وَأَسِرُّوا قَوْلَكُمْ أَوِ اجْهَرُوا بِهِ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ (١٣) أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ ﴾ الملك:١٤.

ئەگەر (مَن) (فاعل) بێت ماناکەی وای لێدێت: الا يعلم الخالق وهو اللطيف الخبير.

واتە: ئێوە بەچرپە قسەبکەن، یان وەدەنگی بەرزی بێژن، ئەوا خوا لە ڕازی بە دڵاندا دەبووریٚ ئاگادارە.ئاخۆ کەسیٚ بەدیهێنەرە، چۆن نازانیٚ؟ وردیلە بێن و ئاگادار هەرخۆیەتی.

بەڵام ئەگەر (مفعول) بێت ماناکەی دەبێت بە: **الا يعلم مخلوقاته و هو اللطيف الخبير.**

واتە: ئێوە بەچرپە قسەبکەن، یان وەدەنگی بەرزی بێژن، ئەوا خوا لە ڕازی بە دڵاندا دەبووریٚ ئاگادارە.ئاخۆ کەسیٚ بەدیهێنەرە، چۆن نازانیٚ دروستکراوەکانی چی دەکەن و چۆن دەکەن؟وردیلە بێن و ئاگادار هەرخۆیەتی.

**﴿ وَمِنَ الْأَعْرَابِ مَنْ يَتَّخِذُ ما يُنْفِقُ مغْرمًا ويَتربَّصُ بِكُمُ الدَّوائِرَ عَلَيْهِمْ دائِرَةُ السَّوْءِ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ التوبة:٩٨.**

**عَلَيْهِمْ دائِرَةُ السَّوْءِ:** یان هەواڵە یان دوعا لێکردنە. واتە:هەندێك لەو عەرەبە دەشتەکییانە، هەرچی بیدەن وادەزانن باج و سەرانەیە، چاوەنوارن بەڵایەکتان بەسەربیٚ. بەڵا هەربەسەر خۆیان بیٚ،خودا بیسەرو زانایە.

**﴿ لا تُقَدِّمُوا بَينَ يَدَيِ اللهِ وَرَسُولِهِ وَاتَّقُوا اللهَ إنَّ اللهَ سَمِيعٌ عَلِيم ﴾ الحجرات:١.**

واتە: بیروبۆچوون و هەواو ئارەزووتان مەخەنە پێش فەرمانی خوا و پێغەمبەرەوەو لەخوا بترسن و پارێزکار بن بەڕاستی خوا بیسەری زانایە، خۆشەویستیش (د.خ) دەفەرموێت: ﴿ لايؤمن احدكم حتى يكون هواه تبعاً لما جئتُ به ﴾ واتە: کەسیٚ لەئێوە بڕوادار نیە، تاوەکو هەواو ئارەزووی شوێنکەوتووی ئەو بەرنامەیە نەبێت کەهێناومەو پێم ڕاگەیاندوون.

***

## هیدایەت هیدایەتی خوای زانایە

﴿ قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ قُلِ اللّهُ يَهْدِي لِلْحَقِّ أَفَمَن يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ أَحَقُّ أَن يُتَّبَعَ أَمَّن لاَّ يَهِدِّي إِلاَّ أَن يُهْدَى فَمَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ، وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلاَّ ظَنّاً إَنَّ الظَّنَّ لاَ يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئاً إِنَّ اللّهَ عَلَيمٌ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴾ یونس:٣٦. پێیان بڵێ: ئایا ئەوانەی دەیکەن بەهاوەڵی خوا دەتوانن خەڵکی ڕێنمایی بکەن بۆ هەق و ڕاستی، بەڕاستی ئەوەی ڕێنمایی دەکات بۆ هەق، هەق وایەو ڕەوایە شوێنی بکەون، لەکاتێکدا زۆربەیان دوای گومانێك کەوتوون کە هیچ سوودێکی نیە و سەرگەردانیە.

بەڕاستی ئەگەر سەیری زۆر لە فەیلەسوف و بیریارو بیرمەندەکانی دونیا بکەین لەکۆن و نوێداو قسەو هەڵوێستەکانیان هەڵسەنگێنین ئەوسا لە ڕاستێتی ئەم ئایەتە تێدەگەین، بۆ نموونە:ئوجست کۆنت کە خاوەنی بەهێزترین فەلسەفەی کۆمەڵایەتیەو لە ئەوروپا زۆر بڵاوە، بۆچوونەکانی ڕەنگدانەوەو کاردانەوەی دەوروبەرێتی، ئەم فەیلەسوفە نامەیەك دەنێرێت بۆ قوتابیەکی و دەڵێت: ئافرەت خێری تیانیەو جێی هیوانیە، ئەمەش لەبەرئەوەی کە حەز لەئافرەتێك دەکات و دەیەوێت بیهێنێ و ئافرەتەکەش دەیخەڵەتێنێ و شووی پێناکات و ئەمەش وا لە ناوبراودەکات هەوڵی خۆکوشتن بدات وماوەیەکیش بچێتە خەستەخانەی دەروونی.

ئنجا پاش ماوەیەك لەنوسراوێکی تریدا بەناوی (رسالة فلسفية في التذكار الاجتماعي ) کەبۆ خۆشەویستەکەی کلۆتیلە دی فۆ دەینێرێت دەڵێت: ئافرەت بنەمای چاکسازی کۆمەڵگەیە. ئەمەش لەبەرئەوەی ئەمیان خۆشەویستیەکەی ڕاستەقینە بوو هەرچەند بەیەکیش نەگەیشتن.

هەروەها فەیلەسوفی بەناوبانگی ئەڵمانی هیگڵ سەرسام و سەرمەست لایەنگری عەسکارتاریەتی هیتلەر بوو، دواتر کە ناپلیۆن سەرکەوت بەسەر ئەڵمانیادا لەساڵی ١٨٠٧ دا رای خۆی گۆڕی و ئنجا بەناپلیۆن سەرسام بوو!باشە ئەم فەیلەسوفە لەکام مەوقیفیدا لەسەر هەقە؟!

جازۆر هەڵوێست و قسەو بۆچوونی ئەو فەیلەسوفانەی دونیا ئاوا رەنگدانەوەو کاریگەری دەورروبەرە لەسەریان و هەمووی شوێنکەوتنی ئەو (ظن) ەیە کە وەك سەرابە و تینوێتی ناشکێنێت.

ئەمە لەکاتێکدا پەیامی خوایی هەموو باس و خواسەکانی هەقن و بۆهەموو کات و شوێنێك دەست ئەدەن و هیدایەتن و کاریگەری هەواو ئارەزوویان لەسەر نیە، چونکە ئەگەر هەق شوێنی هەواو ئارەزوو بکەوێت دونیا کاول دەبێت بەسەر یەکدا ﴿ وَلَوِ اتَّبَعَ الْحَقُّ أَهْوَاءَهُمْ لَفَسَدَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ بَلْ أَتَيْنَاهُمْ بِذِكْرِهِمْ فَهُمْ عَنْ ذِكْرِهِمْ مُعْرِضُونَ ﴾ المؤمنون:٧١.

## خوا زیندووەو راگرو سەرپەشتیاری دروستکراوەکانێتی:

﴿ اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مَنْ ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِنْ عِلْمِهِ إِلَّا بِمَا شَاءَ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَا يَئُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ ﴾ البقرة:٢٥٥.

خوای گەورە زاتێکە جگە لەو هیچ خوایەکی تر نیە کە بەحەق شایستەی پەرستن بێت، ئەو زاتە هەمیشە و بەردەوام زیندوە و راگرِ و سەرپەشتیارو چاودێری سەرجەم دروستکراوەکانێتی.

ئەو زاتە هیچ کات وەنەوز نایگرێ و خەو نایباتەوە، هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لەزەویدا هەیە، هەر ئەوزاتە خاوەنیانە، کەس جورئەتی تکاکردن و پاڕانەوەی نیە بۆ هیچ کەسێك مەگەر بەفەرمان و ڕەزامەندی ئەو.

(لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ) جەختکردنە و تەواوکردنی مانای (الْحَيُّ الْقَيُّومُ) ی خوای پەروەردگارە، ئەمەش خۆپاراستنە تا زیندوویی و قەیومی خوامان تێبگەیەنێت کە وەك هی هیچ زیندوویەکی تر نیە ونەخەو و نەخەوەنۆچکە نایباتەوە.

(مَنْ ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ) کەس جورئەتی تکاکردن و پاڕانەوەی نیە بۆ هیچ کەسێك مەگەر بەفەرمان و ڕەزامەندی ئەو.

( إِلَّا بِإِذْنِهِ )ئەمەش ئیستیسنایە،تا بزانرێت کە کەس ناتوانێت تکا بۆ کەس بکات مەگەر بە ئیزنی خوا، ئەمەش خۆپاراستنی تیایە تا کافرەکان بەتەمای شەفاعەتی پەرستراوەکانیان نەبن، شەفاعەت بە ڕێیەکی تردا نەبەن.

﴿ بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَنَّى يَكُونُ لَهُ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُنْ لَهُ صَاحِبَةٌ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ ﴾ الانعام:١٠١. بێگومان ئەو زاتە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی یە بە جوانترین و ڕێکوپێکترین شێوە، چۆن منداڵی هەیە؟! چۆن ئەو گاورانە جورئەت دەکەن و بوختانی ناقۆڵای ئاوا دەدەنە پاڵ ئەو زاتە، خۆ ئەو هاوسەری نیە، هاوتای نیە، تاك و تەنهایە، هەموو شتێك هەر ئەو زاتە بەدی هێناوە، بەهەموو شتێك بە تەواوی زانایە و زانستی بێ سنورە.

(وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ ) کە دەفەرموێت: ئاسمانەکان و زەوی بەدی هێناوە بۆ ئەوەی تێمان بگەیەنێت کە چی تریش هەیە بێجگە لەوان هەرخوا دروستی کردوون، جاکەسێك ئەوەندە بەتوانا بێت هەموو شتێکی بەدیهێنابێ پێویستی بەکوڕو هاوسەر چیە؟؟

ئنجا بۆ ئەوەی وانەزانرێت لەبەر زۆری دروستکراوەکانی ئاگای لێیان نیە دەفەرموێت: (وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ) خواوەند ئاگای لەهەموو دروستکراوەکانێتی و مسقاڵە زەرەی لێوون نابێت.

﴿ لَا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الْأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ ﴾ الانعام:١٠٣. دەزگاکانی بینایی و بۆچونی ئادەمیزاد لە تێگەیشتنی ئەو زاتە کول وکۆڵە، لە هەمان کاتدا زانست و زانیاری ئەو زاتە هەموو شتێکی گرتۆتەوە و ئاگادارە لە تەماشاکردنی هەموو چاوەکان و لە نیەت و مەبەستی تەماشاچیان و، ئەو خوایە کارناسك و ئاگادارە.

( وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ) ئەمەش بۆ ئەوەی وانەزانرێت کە خوا بوونی نیە بۆیە نابینرێت، نەخێر خوا هەیەو دروستکراوەکانیشی دەبینێت و ئاگای لێیانەو میهرەبان و کارناسك و ئاگادارە.

( سنوری بینینی ئادەمیزاد سنوردارە و زۆرشتی مادی نابینێ، ئاشکرایە کە نەبینینی هەر شتێك نابێتە بە ڵگە لەسەر نەبونی، ئەم هەموو بونەوەرە بەڵگەن لەسەر دەسەڵاتی بێ سنوری زاتێکی تەواو زانا و توانا، بەشێك لە سۆز و میهری ئەوەیە کە زاتی خۆی لەدنیادا پەنهانە، ئەگینا ئازادی بۆ کەس نەدەما و کەس نەیدەوێرا هەڵەیەك بکات، گەورەترین نیعمەتیش لە قیامەتدا شاد بوونی ئیماندارانە بە دیتنی زاتی شکۆمەند و خاوەنی هەموو سیفاتە جوان و پیرۆزەکان).

## کەس ناتوانێ دەستوەرداتە پەیامی خواوە:

﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ الانعام:١١٥. چونکە فەرمان و فەرمودەکانی پەروەردگارت ( ئەی محمد ﷺ ) لەوپەڕی ڕاستی و دادپەروەریدا بە ئەنجام گەیشتووە، هیچ هێز و پیلان و

نەخشەیەکی ناحەزان ناتوانێت، بیگۆڕێت و دەستکاری بکات ( وەکو تەورات و ئینجیل )بێگومان ئەو خوایە تەواو بیسەرە و تەواویش زانایە بە هەموو نەخشە و پیلانەکانیان، بەسەرجەم نهێنی و ئاشکراکانیان.

﴿ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾ الانعام:١١٥. قورئان کە فەرموودەی راستی خوایەو شەرعێکی دادپەروەرە بەپایان گەیشتووە، کەس ناتوانێت دەستکاری بکات وخوا ئەبیستیێ و زانایە.

## خوا ئەبیستیێ وزانایە ونیعمەتەکانی دەگرێتەوە!

قورئان دەفەرموێت: ﴿ ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَى قَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ وَأَنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ الانفال:٥٣.

واتە: خوا ناز و نیعمەتێك کەبیدات بەگەلێك لای نابات تاوەکو ئەوان دڵ و دەروونیان نەگۆڕن.وەبەڕاستی خوا بیسەرو زاناوئاگادارە..

کەواتە گۆڕانی باری ژیان پەیوەندی بە بیروباوەڕەوە هەیە، خوا کاتێك بارو گوزەرانی خەڵکی چاکدەکات کەپەیڕەوی بەرنامە و یاساکەی بکەن.

## پەنابگرە بەخوای بیسەری زانا:

قورئان بەخۆشەویست (د.خ) و بەموسڵمانان دەفەرموێت:﴿ خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ، وَإِمَّا يَنْزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ الاعراف: ٢٠٠.

واتە: کاری ئاسان لەخەڵکی داوابکە و چاوپۆشی لەهەڵە و کەمو کوڕیەکانیان بکە و خەڵکی عەفو بکە بۆ ئەوەی خوا عەفوت بکات، کە تۆ یەکێکت عەفو

کرد، وەك ئەوەیە کە عەفووی خوات وەرگرتبیّ بۆیە هەردوو مەبەستەکە کورت دەکاتەوە وباسی (فاعف) ناکات و یەکسەر دەفەرمویّ: (خذ العفو) (ئەمە بۆچوونی شێخ متولی شەعراویە). هەروەها فەرمان بدە بەچاکە و کردەوەیەك کەپەسەندی شەرعە، رووش وەرگێرە لەنەفام و تێنەگەیشتوان. جا ئەگەر شەیتان تووشی وەسوەسەی کردیت و ویستی بیّ بەلاتا پەنا بگرە بەخوا، چونکە بە راستی ئەو زاتە بیسەر و زانایە.

بە راستی ئەوانەی کەپارێزکارن، کاتێك خەیالاتێك لەلایەن شەیتانەوە بەدڵیانابێت، ئەوا خێرا بێدار ئەبنەوە و خوای خۆیان بیردەکەوێتەوە، ئنجا دەسبەجیّ بەرچاویان روون دەبێت و رێی راستیان لێناشێوێت.

## وەیل بۆ ئەوانەی درۆ دەکەن بەدەم خواوە!

تەورات و ئینجیل بۆ کاتێکی دیاری کراو هاتن و رۆڵی خۆیان بینی و پاشان دەستکاری کران، لەلایەن ئەو کەسانەی کە دەیان نوسینەوە و لەلایەن زاناکانیانەوە، قورئان لەبارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿ **فَوَيْلٌ لِلَّذِينَ يَكْتُبُونَ الْكِتَابَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَذَا مِنْ عِنْدِ اللهِ لِيَشْتَرُوا بِهِ ثَمَنًا قَلِيلا فَوَيْلٌ لَهُمْ مِمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَهُمْ مِمَّا يَكْسِبُونَ** ﴾ البقرة: ٧٩. واتە: وەیل بۆ ئەوکەسانەی کە پەڕاو دەنوسن بە دەستی خۆیان و پاشان دەڵێن: ئائەمە لەلایەن خواوەیە، تا کەمێك لە ماڵی دنیا بەدەست بهێنن، جا وەیل بۆ ئەو دەست و قەڵەمانەی کەشتی وا دەنووسن و وەیل بۆ ئەوکەسانەی کە کەسابەتی ئاوا دەکەن..

قورئانی پیرۆز کە لەلایەن خواوە نێردراوەتە خوارەوە، ئەوەی پێویست بیّ لەو شتانەی کە ئەهلی کیتاب شاردبوویانەوە ئاشکرای کردو هەڵەکانیانی راست

کردەوە، دیارە ئەو شتانە هەمووی (غەیبن) و خوای گەورە بەزانینی بێ کۆتایی خۆی کە ئاگاداری هەموو شتێکە، لە قورئاندا بەراست و دروستی تۆماریکردن، هەروەك دەفەرموێت: ﴿یَاأَهْلَ الْكِتَابِ قَدْ جَاءَكُمْ رَسُولُنَا یُبَیِّنُ لَكُمْ كَثِیرًا مِمَّا كُنْتُمْ تُخْفُونَ مِنَ الْكِتَابِ وَیَعْفُو عَنْ كَثِیرٍ قَدْ جَاءَكُمْ مِنَ اللهِ نُورٌ وَكِتَابٌ مُبِینٌ﴾ المائدة: ١٥.

واتە: ئەی ئەهلی کیتاب: دڵنیا بن کە پێغەمبەری ئێمە بۆ ئێوەش هاتووە تا زۆربەی ئەوشتانەی کەلای ئێوە روون و ئاشکرا نین و دەیشارنەوە لە کتێبی تەورات و ئینجیلدا بۆتان روون بکاتەوە و ئاشکرای بکات، هەروەها لە زۆرێك لەوشتانەی کە شاردوتانەوە چاوپۆشی دەکات (دیارە پێویست نین لەم زەمانەدا)، بەراستی لەلایەن خواوە رووناکیەکی ئاشکراتان بۆ هاتووە (کە محمدی پێغەمبەرمانە) هاورێ لەگەڵ کتێبێکی روونکەرەوەدا کە قورئانە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَأَنزَلْنَا إِلَیْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِمَا بَیْنَ یَدَیْهِ مِنْ الْكِتَابِ وَمُهَیْمِنًا عَلَیْهِ فَاحْكُمْ بَیْنَهُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ وَلا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ عَمَّا جَاءَكَ مِنْ الْحَقِّ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنْكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ﴾ المائدة: ٤٨.

واتە: ئێمە قورئانمان هاورێ لەگەڵ هەموو حەقیقەت و راستیەکدا بۆ تۆ دابەزاندووە، راستی و دروستی کتێبەکانی پێش خۆشی دیاری دەکات و چاودێرە بەسەر هەموویاندا، کاتێك ئەهلی کیتاب لە گاورو جوولەکە کێشەیان دەهێنن بۆ لای تۆ، بەو بەرنامەیەی خوا ناردوویەتی دادوەری بکە لە نێوانیاندا و شوێن ئارەزووەکانی ئەوان مەکەوە و لەو حەقە لامەدە کە بۆت رەوانە کراوە، بۆ هەر لایەکتان (موسڵمانانو ئەهلی کیتاب) بەرنامە و پرۆگرامی تایبەتمان بڕیار داوە.

بەڵێ.. قورئان چاودێرە (مهیمن)ەو ئەهلی کیتاب بانگ دەکات بۆ بڕواهێنان بەدوا پێغەمبەری مرۆڤایەتی، چونکە تەنها ئەوە بەرنامەی راست و دروست و پارێزراو، کە کەس ناتوانێ دەستکاری بکات، هەروەك دەفەرموێت:

﴿ فَإِنْ آمَنُوا بِمِثْلِ مَا آمَنتُمْ بِهِ فَقَدْ اهْتَدَوا وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ فَسَيَكْفِيكَهُمْ اللَّهُ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ * صِبْغَةَ اللهِ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنْ اللهِ صِبْغَةً وَنَحْنُ لَهُ عَابِدُونَ * قُلْ أَتُحَاجُّونَنَا فِي اللهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ وَلَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُخْلِصُونَ * أَمْ تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطَ كَانُوا هُودًا أَوْ نَصَارَى قُلْ أَأَنْتُمْ أَعْلَمُ أَمْ اللهُ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ كَتَمَ شَهَادَةً عِنْدَهُ مِنْ اللهِ وَمَا اللهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ البقرة: ١٤٠.

واتە: ئەگەر ئەوان (ئەهلی کیتاب) باوەڕیان هێنا، وەك ئەوەی ئێوە باوەڕتان پێهێناوە، ئەوە بەراستی مانای وایە ڕێبازی هیدایەتیان دۆزیوەتەوە، بەڵام ئەگەر پشتیان تێکرد، ئەوە بێگومان دەکەونە دژایەتی و دووبەرەکیەوە، بەڵام دڵنیابە ئەی محمد (د.خ)، ئەی بڕوادار، خوا دەتانپارێزێت لە پیلان و تەڵەکەیان، چونکە خوا بیسەر و زانایە..ئەم ئاین و بەرنامەیە ئەو ڕەنگ و نەخشەیەیە کە خوا دایڕشتووە، کێ هەیە لە خوا چاکتر ڕەنگ و نەخشەی جوان بکێشێت و دایڕێژێت، لە هەموو بارودۆخێکدا ئێمەی ئیماندار هەرئەو دەپەرستین.

پێیان بڵێ: ئایا ڕەوایە ئێوە دەربارەی ئاینی خوا قڕەو گاڵەو کێشەمان لەگەڵ دەکەن و (دەتانەوێت پێغەمبەرایەتی هەر لەناو ئێوەدا بێت!).

خۆ خۆتان چاك دەزانن کە ئەو خوایە پەروەردگاری ئێمە و ئێوەشە، کاروکردەوەی خۆمان بۆ خۆمان و کارو کردەوەی ئێوەش بۆ خۆتانە، ئێمە تەنها دڵسۆز و ملکەچی ئەو پەروەردگارەین.

چۆن دەڵێن کە ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و کوڕەکانی، جولەکە یان گاور بوون؟! پێیان بڵێ: باشە ئایا ئێوە دەزانن یان خوا؟ جاکێ لەوە ستەمکاترە کە شایەتیەکی خوایی لەلابێت و شاردبێتیەوە، بێگومان خوا بێ ئاگا نیە لەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

دیاره خوا باشو ئاگاداری ڕووداوەکانی ڕابردووەو، دەزانێ ڕاست و دروستیەکانی چۆنە و، هەر ئەو دەزانێ چی دەستکاری کراوە و گۆڕدراوە!

بە ڕاستی زمان لاڵە ومرۆڤ شەرمەزارە لە ڕەحمی زۆری خوا، خوایەك کە هیچ شتێك وەکو ئەو نیە (ليس كمثله شيء وهو السميع العليم) و، دەسەڵات و توانای بێ سنوورەو، دەوڵەمەندە و ئاتاجی بەکەس نیە، کەچی لە گەورەیی و سۆز و میهرەبانی خۆیەوە دەفەرموێ: بەنی ئادەم ئەگەر تۆ بستێك بێی بەلای مندا من دوو بست دێم بۆ لای تۆ، ئەگەر باڵێك بێیت، من دوو باڵ دێم، ئەگەر بە پێ بێی بۆ لام من بە ڕاکردن دێم بۆ لات!

پیاوچاکێك دەڵێ: (سەیر لەوەدا نیە بەندەیەك خۆی خۆشەویست بکات لای گەورەکەی، بەڵکو سەیر لەوەدایە کە گەورە و (سەید) ێك خۆی لای بەندەکەی خۆشەویست بکات).

## خوای گەورە زانایەو ئاگادارەو بەکەس ناخەڵەتێ

دووڕووەکان بەسەر زارەکی مسوڵمان بووبوون و لافی ئیمانداریان لێئەدا لەبەرچاوی مسوڵمانان، وایان دەزانی خواو موسڵمانان دەخەڵەتێنن، بەڵام دیارە خوای گەورە بەکەس ناخەڵەتێ، هەروەك دەفەرموێ:

﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَا هُمْ بِمُؤْمِنِينَ (٨) يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّا أَنْفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ (٩) فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضًا وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ (١٠)﴾ البقرة:١٠.

واتە/ لەناو خەڵکیدا کەسانێك هەن کە دەڵێن: باوەڕمان بە خواو بە ڕۆژی قیامەت هێناوە، لە ڕاستیدا ئەوانە درۆ دەکەن و ئەوانە باوەڕدارنین..

ئەوانە بە خەیاڵی خۆیان وادەزانن خواو ئەو کەسانە دەخەڵەتێنن کە باوەڕداری ڕاستەقینەن! کەچی جگە لە خۆیان کەسیان پێناخەڵەتێت، بەڵام هەستناکەن و فام ناکەنەوە و بیرناکەنەوە.

ئەوانە لە دڵ و دەروونیاندا نەخۆشی بێباوەڕی و حەسوودی و کینە هەیە، خواش بەسەرخستنی هەق و ئیمانداران ئەوەندەی تر دەردیان گران دەکات و سزایەکی سەختیش لەدنیا و قیامەتدا چاوەڕێیانە بەهۆی درۆکردن و دژایەتیان بۆ ئیسلام.

## هیچ لەخوا ناشاردرێتەوە!

جولەکەکان لەناو خۆیاندا پیلانیان دائەناو بە یەکتریان دەووت: با هەر خۆمان بیزانین و با مسوڵمانەکان ئەم مەسەلانە نەزانن و ئاگادار نەبن کە لەسەر هەقن، بۆ ئەوەی لە قیامەتدا نەبن بەحوجەت بەسەرمانەوە، کە بەڕاستی ئەمەش لوتکەی خۆ خەڵەتاندنە؟! ئەگینا ئەمان ئەگەر ئاشکرای نەکەن، خوا ئاگای لە چرپەو نهێنییان نیە؟! دەیانەوێ لە خوای بشارنەوە؟ دیارە ناشاردرێتەوە بۆیان و خوا بە کەس ناخەڵەتێ! قورئان لە بارەی ئاگا لێبوونی خواوە دەفەرموێ: ﴿ يَسْتَخْفُونَ مِنَ النَّاسِ وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ اللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرْضَىٰ مِنَ الْقَوْلِ وَكَانَ اللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا ﴾ النساء:١٠٨.

ئەوانەی دەیانەوێ خیانەت و تاوانەکانیان لە خەڵکی بشارنەوە، لە کاتێکدا ناتوانن لە خوای بشارنەوە لەگەڵیاندایە و چاودێریانە، بە نهێنی و بە شەودا قسەی وا هەڵدەبەستن کە خوا پێی ڕازی نیە و خوا بەردەوام گەمارۆی ئەو کاروکردەوانە ئەدات کە ئەنجامی دەدەن.

هەروەها لە ئایەتێکی تردا لە بارەی دووڕووەکانەوە دەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُونَ طَاعَةٌ فَإِذَا بَرَزُوا مِنْ عِنْدِكَ بَيَّتَ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ غَيْرَ الَّذِي تَقُولُ وَاللَّهُ يَكْتُبُ مَا يُبَيِّتُونَ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ وَكَفَى بِاللَّهِ وَكِيلًا ﴾ النساء:٨١.

واتە: دووڕووەکان کاتێك لەلای تۆ دەڵێن: ملکەچ و فەرمانبەردارین، بەڵام کاتێك لای تۆ هەستان و دوورکەوتنەوە، دەستەیەکیان قسەکانی تۆ بە نهێنی و لەشەودا دەگۆڕن و ئەوە ناڵێن کە تۆ وتوتە، جا ئەوەی شەو هەڵی دەبەستن بەنهێنی و پیلانی بۆ دائەنێن، خوا تۆماری دەکات، کەواتە گوێ بەوانە مەدەو پشت بە خوا ببەستە، تەنها خوات بەسە کە یارویاوەرت بێت.

بەڵێ خوای گەورە ئاگاداری نیەت و دڵی دوژمنانە بۆیە ئەی (محمد) مەترسە، ئەگەر بیانەوێ بتخەڵێتێنن تۆ خوات بەسە کە ئاگاداری هەموو شتێکە:

﴿ وَإِنْ جَنَحُوا لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ، وَإِنْ يُرِيدُوا أَنْ يَخْدَعُوكَ فَإِنَّ حَسْبَكَ اللَّهُ هُوَ الَّذِي أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِ وَبِالْمُؤْمِنِينَ﴾ الانفال:٦٢.

واتە: ئەگەر دوژمنان بەلای ئاشتیدا دایانشکاند و حەزیان پێکرد، تۆش ئەی (محمد) ئامادەیی خۆت دەربڕە و پشت بە خوا ببەستە چونکە بە ڕاستی ئەو زاتە بیسەر و زانایە بە پیلان و نەخشەی دوژمنان..

خۆ ئەگەر خوانەناسان بە داخوازی ڕێکەوتن و ئاشتی ویستیان بتخەڵەتێنن، ئەوە دڵنیابە کە پشتیوانی خوا بەستە کە نەیەڵێ بکەویتە ناو پیلان و نەخشەیانەوە چونکە هەر ئەو زاتە کاتی خۆی پشتیوانی لێکردیت و سەری خستیت و ئیماندارانیشی کردە هۆیەك بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن.

## خوای زانا پیلانی جوولەکەی ئاشکراکرد:

قورئانی پیرۆز پیلانێکی ترسناکی جوولەکە ئاشکرا دەکات و دەفەرموێت: ﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَلْبِسُونَ الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ (٧١) وَقَالَتْ طَائِفَةٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ آمِنُوا بِالَّذِي أُنْزِلَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَجْهَ النَّهَارِ وَاكْفُرُوا آخِرَهُ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ (٧٢) وَلَا تُؤْمِنُوا إِلَّا لِمَنْ تَبِعَ دِينَكُمْ قُلْ إِنَّ الْهُدَى هُدَى اللَّهِ أَنْ يُؤْتَى أَحَدٌ مِثْلَ مَا أُوتِيتُمْ أَوْ يُحَاجُّوكُمْ عِنْدَ رَبِّكُمْ قُلْ إِنَّ الْفَضْلَ بِيَدِ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ (٧٣) يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ﴾ آل عمران: ٧١-٧٤.

واتە: ئەی خاوەن پەڕاوەکان بۆچی بەرگی ناهەقی دەکەن بەبەری هەقداو ڕاستی دەشارنەوە، لە کاتێکدا خۆتان چاك دەزانن کە هەق و ڕاستی کامەیە..

دەستەیەك لە خاوەن پەڕاوەکان ( لە جووەکان ) وتیان بە تاقمێکیان: ئێوە لە سەرەتای ڕۆژدا بە درۆوە ئیمان بهێنن بەو قورئانەی بۆ بڕواداران ڕەوانەکراوە، بەڵام لە کۆتایی ڕۆژدا و دەمەو ئێوارە پەشیمان ببنەوە تا دوودڵی و گومان لای مسوڵمانان دروست ببێت و پەشیمان ببنەوە.

کابرای جوولەکە بەیانی مسوڵمان دەبوو خۆشی دەکەوتە ناو مسوڵمانانەوە، کە دیارە ئەو ئەهلی کیتابە هەق دەزانێ و ڕاستی بۆ دەرکەوتووە بۆیە مسوڵمان بووە، ئێوارانیش کەپاشگەز دەبووەوە نۆمسوڵمان توشی دوودڵی و گومان دەبوو، وای لێك دەدایەوە ئەو جوولەکەیە ناهەقییەکی دیوە لە ئیسلامدا بۆیە پەشیمان بۆتەوە، دیارە ئەمەش پیلانێکی سامناك بوو، خوای گەورە بە فەزڵی خۆی پەردەی لەسەر هەڵماڵی.

هەروەها دەڵێن: بڕوا مەکەن و متمانە مەکەن بە کەس جگە لەو کەسانەی کەشوێنی ئاینی ئێوە کەوتوون و جوولەکەن! ئەی (محمد) پێیان بڵێ: بە ڕاستی

هەرهیدایەتی خوایی هیدایەت و ڕێنمووییە.. کەچی جووەکان بە یەکتری دەڵێن: دان بەوەدا مەنێن کە کەس وەکو ئێوەی پێبەخشراوە، باسی تەورات و دواهەمین پێغەمبەر مەکەن، تا لای پەروەردگارتان سبەی لەقیامەتدا زاڵ نەبن بەسەرتانا!! ئەی (محمد) تۆش بڵێ: بە ڕاستی هەرچی ڕێز و بەخشش و فەزڵ هەیە بەدەست خوایەو دەیبەخشێت بەو کەسانەی کەدەیەوێت و شایستەن و خوا فراوانگیر و زانایە..

ئەو خوایە ڕەحمەت و میهرەبانی خۆی تایبەت دەکات بۆ هەر کەسێك بیەوێت و شایستە بێت و خوا خاوەنی ڕێز و بەخشش و فەزڵی زۆر گەورە و بێ ئەندازەیە.

سەرنج بدە ئەمە جۆرێکە لە خۆ خەڵەتاندن و گێلی جولەکەکان، ئەگەر ئەوان دان نەنێن بە ڕاستی داو باسی دواهەمین پێغەمبەر نەکەن لە تەوراتدا، قابیلە خوا نەزانێ، قابیلە لە قیامەتدا قسەی مسوڵمانان و هەق و ڕاستی زاڵ نەبێت؟!

## گێلی کابرای لەمەڕخۆمان:

دەڵێن خێڵێك کەلوپەلیان دەپێچنەوەو لەوەدا دەبن باربکەن و گەرمیان و کوێستان بکەن،دەبێتە باران و لێزمە، ڕیش چەرمۆکەیان دەچێتە سەربەرزاییەك و دەستێکی بەرز دەکاتەوە و ڕووەو ئاسمان دەڵێ: بیگرەوە! بیگرەوە! نارۆین نارۆین! (هەروەك لەبەر ڕۆیشتنی ئەوان باران و لێزمە بێت) بەدەستەکەی تریشی بەخەڵکەکە دەڵێ: وەچەما! وەچەما! (واتە لە چەمەکەوە بڕۆن! هەروەك لە بەرزایی یەوە خوا پێیان نەزانێ!، خۆ ڕەنگە ئەمە هەر پەندێك بێت! بەڵام چاو بگێڕە زۆر لەو عەقڵیەتە سەیرانە دەبینی کە بە وتار و کرداریان وادەزانن خوایان بۆ دەخەڵەتێ و وا دەزانن دەتوانن فێڵ لەخوا بکەن)...

## خوا ئاگادارو بینایه بەبەندەكانی:

خوای گەورە لەبارەی ئەو چاكەكارانەی كە دەبنە میراتگری پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت: ﴿ وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ هُوَ الْحَقُّ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ إِنَّ اللَّهَ بِعِبَادِهِ لَخَبِيرٌ بَصِيرٌ، ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ وَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ بِإِذْنِ اللَّهِ ذَلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ،﴾ فاطر:٣١-٣٢.

واتە: ئەی پێغەمبەر (د.خ) ئەوەی كە بەسرووش بۆمان رەوانەكردیت لەم قورئانە، ئەوە حەق و راستیەو بەڕاست دانەری كتێبە پێشووەكانە، بەراستی خوا ئاگادارو بینایە بەبەندەكانی، پاشان كەسانێكمان كردە خاوەن و راگەیەنری ئەم قورئانە كە هەڵمانبژاردوون لەبەندەكانمان، جا هەیانە ستەمی لەخۆی كردووە و چاكەی كەمەو گوناهی زۆرە، هەشیانە مامناوەندیە، هەشیانە زۆر گەرم و گوڕە لە چاكەكاریدا بەویست و یارمەتی خوا، ئائەو هەڵبژاردنەو ئەو گەرم و گوڕیە لە چاكەكاریدا، رێزو خەڵاتێكی زۆر گەورەیە..

## ئەوانەی دژایەتی ئەم قورئانە دەكەن خوا ئەیانبینێ

ئەوانەی دژایەتی ئەم قورئانە دەكەن لەدەست خوا دەرناچن، قورئان دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي آيَاتِنَا لَا يَخْفَوْنَ عَلَيْنَا أَفَمَنْ يُلْقَى فِي النَّارِ خَيْرٌ أَمْ مَنْ يَأْتِي آمِنًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ فصلت:٤٠.

واتە: بەڕاستی ئەوانەی سەرسەخت و بێبڕوان و دژایەتی ئایەت و فەرمانەكانی ئێمە دەكەن و لێی لائەدەن، خۆیان ناشارنەوە لە ئێمە، باشە ئەو كەسەی فڕێ بدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە چاكترە یان ئەو كەسەی بەدڵنیایی و ئارامی و

هێمنیەوە دێت لە ڕۆژی قیامەتدا و بەرەو بەهەشت وبە ڕێزەوە بە ڕێ دەکرێت؟!
ئەی بێبڕوایان هەرچیتان لەدەست دێت بیکەن، چونکە لەدەست خوا دەرناچن، دڵنیاش بن خوا بینایە بەو کردەوانەی کە دەیکەن.

پاشان دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِالذِّكْرِ لَمَّا جَاءَهُمْ وَإِنَّهُ لَكِتَابٌ عَزِيزٌ (٤١) لَا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ تَنْزِيلٌ مِنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴾ **فصلت**:٤١-٤٢.

واتە: بەڕاستی ئەوانەی بڕوایان نەبووە بەو قورئانە لە کاتێکدا بۆیان هات، بێگومان ئەو قورئانەش کتێبێکی زۆر بە نرخ و ناوازە و سەرکەوتووە، هیچ ناهەقی و نادروستیو ناتەواویەك ڕووی تێناکات لە هیچ کاتێکدا و لە هیچ لایەکەوە، ڕەوانەکراو و نێردراوی زاتێکە کە خاوەنی حیکمەت و داناییە و شایانی سوپاس و ستایشە.

هەروەها دڵنەوایی خۆشەویست (د.خ) دەکات و دەفەرموێت: ﴿ مَا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِنْ قَبْلِكَ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٍ﴾ **فصلت**:٤٣.

واتە: ئەی پێغەمبەر (د.خ) شتێك بەتۆ ناوترێت، کە بە پێغەمبەرانی پێش تۆ نەوترابێت، بە ڕاستی پەروەردگاری تۆ خاوەنی لێبوردن و لێخۆشبوونە بۆ باوەڕداران و تۆڵەسێنەری بە ئازار و بە ئێشە لە بێباوەڕان.

## هەق بێژ بن خوا ئەتانبینێ:

تەنها ئیسلام و پەروەردەکەیەتی کە بتوانێت وا لەمرۆڤ بکات کەدادوەر و هەق بێژ بێت بەرامبەر بەهەموو کەس و، لەبەر خواو لەترسی خوا بەسەر دەروونی خۆیدا زاڵ بێت و بەرژەوەندییەکانی بخاتە لاوە.ئەوە بەڕاستی شتێکی گرانە

لەسەر دڵ و دەروون، بەتایبەت کاتێك ڕاستی لەکەس وکار یان لەخۆت بڵێیت، یان بەهۆی هەق وتنەوە خۆت یان کەسوکارت تووشی نارەحەتی و زیانێك ببن. قورئان دەفەرموێت:

١- ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَى أَنْفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ إِنْ يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَاللَّهُ أَوْلَى بِهِمَا فَلَا تَتَّبِعُوا الْهَوَى أَنْ تَعْدِلُوا وَإِنْ تَلْوُوا أَوْ تُعْرِضُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴾ النساء:١٣٥.

واتە: ئەی کەسانێك کە بڕواتان هێناوە هەمیشە و بەردەوام پایەداربن لەسەر دادپەروەری و شایەت بن بۆ خوا لەسەر هەق، هەرچەند ئەوشایەتیدانە زیانی خۆتان یان دایك و باوکتان، یان خزمتانی تیابێت، جا ئەوکەسەی شایەتیەکەی لەسەر دەدرێت دەوڵەمەندبێت یان هەژار، ئێوە لەسەر هەق و ڕاستی لامەدەن بۆ کەسیان، چونکە پەروەردگار لەپێشترە و نزیکترە بۆ چاوەدێری ئەوانە لەئێوە، واتە:مەڵێن ئەوکەسە هەژارە با ئێمە لایەنی ئەوبگرین، چونکە جاری وا هەیە هەقی دەوڵەمەندەکەیە، یان مەڵێن ئەوکەسە دەوڵەمەندە با ئێمە لایەنی بگرین، چونکە جاری وا هەیە هەقی هەژارەکەیە.

کەواتە هیچ شتێکی دنیایی نابێت کارتان تێبکات و لەراستبێژی و شایەتیدانی هەق لاتان بدات و، مەکەونە شوێن هەواو ئارەزووتان و، ئەگەر زمانتان بگۆڕن و هەق نەڵێن، یان لادەن و ڕوو وەرگێڕن لەهەق، ئەوە خوا ئاگادارە بەوەی کەدەیکەن و، هەموو کەس ڕووبەڕووی پاداشتی کردەوەکانی خۆی دەبێتەوە.

٢ ـ ﴿ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ أَنْ صَدُّوكُمْ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ أَنْ تَعْتَدُوا وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴾ المائدة:٢. واتە: باکینە و ڕق و دوژمنایەتیتان بۆ کۆمەڵێك کەرێی (مسجد الحرام) یان لێگرتن، واتان لێنەکات زیادەڕەوی بکەن

لەتۆڵە سەندنەوەدا و، یارمەتی یەکتر بدەن لەسەر چاکە و پارێزکاری و یارمەتی یەکتر مەدەن لەسەر گوناهو تاوان، لەخوا بترسن و پارێزکاربن بە راستی خوا سزاکەی سەختە.

٣ ـ ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ لِلَّهِ شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلَّا تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾ المائدة:٨. واتە: ئەی کەسانێك کەبڕواتان هێناوە، راوەستاوبن لەسەر هەق و شایەتی راستی بدەن و، با دوژمنایەتیتان بۆ گەلێك واتان لێنەکات کەدادپەروەرنەبن لەگەڵیاندا، چونکە ئەوە نزیکە لە پارێزکارییەوە، لەخوا بترسن و پارێزکاربن، خوا ئاگادارە بەکارەکانتان.

٤ـ ﴿ وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى﴾ الانعام: ١٥٢ واتە: هەق وراستی بڵێن و دادپەروەربن، تەنانەت ئەگەر ئەو هەق وتنە لەسەر خزم و کەس و کاریشتان بکەوێت.

- پەروەردگار مرۆڤی دروستکردووە و هەر ئەو دەزانێت چی باشە بۆی لەدنیا و قیامەتدا ﴿ أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ، وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ ﴾ الملك: ١٤ ﴿ أَأَنْتُمْ أَعْلَمُ أَمِ اللَّهُ﴾ البقرة: ١٤٠ واتە: پێیان بڵێ: ئێوە زاناترن یان خودا؟. یان دەفەرموێت: ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللهِ حُكْماً لِقَوْمٍ يُوقِنُون ﴾ المائدة: ٥٠. واتە: کێ هەیە حوکم و یاساکەی لەخوا چاکتر بێت بۆ بڕواداران.

***

## بەڕێزترین کەس لای خوای زانا پارێزکارترینتانە:

قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴾ الحجرات:١٣. واتە: خەڵکینە ئێمە ئێوەمان لەنێر و مێیەك دروستکردووە و، کردوومانن بەچەندەها گەل و تیرە و هۆزی جۆر بەجۆر، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆشبێت بەیەکەوە. بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا ئەو کەسانەیە، کە زۆر تر پارێزکارن، بێگومان خوا زاناو ئاگادارە بەهەمووان.

دیارە هەرکەس خوا بەڕێزی بکات ئەوە ڕێزدارە و هەرکەسیش خوا ریسوای بکات ئەوە ریسوای راستەقینەیە و کەس ناتوانێت فریای بکەوێت، قورئان دەفەرموێت: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَسْجُدُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ وَالنُّجُومُ وَالْجِبَالُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ وَكَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ الْعَذَابُ وَمَنْ يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ مُكْرِمٍ إِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ ﴾ الحج:١٨.

واتە: ئایا نەتبینیوە و نەتبیستووە کە بەراستی هەرکەس و هەرچی هەیە لە ئاسمانەکان و زەویدا سوجدە بۆ خوا دەبەن، هەروەها خۆر و مانگ و ئەستێرە و چیاکان و درەخت و مالآت و زۆرێك لەخەڵکی، زۆرێکیش خۆی شایستەی سزاو تۆڵەکردووە، ئەوەی خوا قەدر و ڕێزی بشکێنێت و ریسوای بکات، ئەوە هیچ ڕێزلێنەرێکی نیە، بە راستی خوا ئەوەی بیەوێ دەیکات.

***

## خوا ئاگاداری کارەکانتانە ئاشکرای بکەن یان نا:

قورئانی پیرۆز باسی کار و کردەوەی چاك دەکات کە لە نهێنیدا و دوور لە چاوی خەڵك ئەنجام دەدرێن و دەفەرموێت:

﴿ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ سِرًّا وَعَلانِيَةً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ وَلا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ البقرة:٢٧٤.

واتە: ئەوانەی ماڵیان دەبەخشن بە شەوو بەرۆژ، بەنهێنی و بە ئاشکرا، پاداشتیان بۆ هەیە لای پەروەردگاریان و ترسیان لەسەر نیە و خەم ناخۆن..

﴿ إِنْ تُبْدُوا الصَّدَقَاتِ فَنِعِمَّا هِيَ وَإِنْ تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا الْفُقَرَاءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَيُكَفِّرُ عَنْكُمْ مِنْ سَيِّئَاتِكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾ البقرة:٢٧١.

واتە: ئەگەر خێر و چاکەکانتان ئاشکرا بکەن چاکە و ئەگەر بیشارنەوە و بەنهێنی بیدەن بەهەژاران هەر چاکە و، لێخۆش بوون دەبێ بۆ گوناهەکانتان و خواش ئاگاداری کارەکانتانە.

لە بنەڕەتدا شاردنەوەی کارو کردەوەی چاك و خێر و سەدەقات باشترە، مەگەر لەبەر بەرژەوەندیەکی ئایینی و بۆ هاندانی کەسانی تر ئاشکرا بکرێن..

## پیلانەکانیان لای خوا ئاشکرایە

﴿ قُلْ مَنْ يَكْلَؤُكُمْ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ مِنَ الرَّحْمَنِ بَلْ هُمْ عَنْ ذِكْرِ رَبِّهِمْ مُعْرِضُونَ (٤٢) أَمْ لَهُمْ آلِهَةٌ تَمْنَعُهُمْ مِنْ دُونِنَا لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَ أَنْفُسِهِمْ وَلَا هُمْ مِنَّا يُصْحَبُونَ (٤٣) بَلْ مَتَّعْنَا هَؤُلَاءِ وَآبَاءَهُمْ حَتَّى طَالَ عَلَيْهِمُ الْعُمُرُ أَفَلَا يَرَوْنَ أَنَّا نَأْتِي الْأَرْضَ نَنْقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا أَفَهُمُ الْغَالِبُونَ (٤٤)﴾ الانبياء:٤٢-٤٤.

واته: پێیان بڵێ: کێ دەتوانێت ئێوە بپارێزێت لە شەوو ڕۆژدا لە سزاو تۆڵەی خوای میهرەبان، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانە هەمیشە ڕوو وەردەگێڕن لە یادی پەروەردگاریان.. یان ئەو بێبڕوایانە چەند خوایەکیان هەیە کە دەتوانن لە سزامان ڕزگاریان بکەن جگە لە ئێمە؟! ئەوانە نە دەتوانن خۆیان ڕزگار بکەن و خۆیان سەربخەن، نەپەنا دەدرێن لەلایەن ئێمەوە و نەکۆمەکیان دەکرێت..

ئێمە (بەپەلە تۆڵە ناسێنین) بەڵکو ئەوانە خۆیان و باوباپیرانیانمان لە ناز و نیعمەتی دنیا بەهرەوەر کردووە، هەتا تەمەنیان درێژ بۆوە، جا ئەوانە نایبینن و نازانن کە بە ڕاستی ئێمە وردە وردە زەوی لەملاو ئەولایەوە بچووك دەکەینەوە، جا ئێمە بتوانین زەوی بچووك بکەینەوە دیارە دەتوانین دەسەڵات و خاکی ژێر دەستی ئەوانیش نەهێڵین و بچووکی بکەینەوەو لە ژێر دەستیان دەریبهێنین... جا ئایا ئەو بێبڕوایانە هەمیشە سەرکەوتوو زاڵن؟! هەروەها هەمان مەبەست لە سورەتی (الرعد) دا دووبارە دەکاتەوە ودەفەرموێت:﴿ وَإِنْ مَا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِي نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَاغُ وَعَلَيْنَا الْحِسَابُ (٤٠) أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَأْتِي الْأَرْضَ نَنْقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا وَاللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ وَهُوَ سَرِيعُ الْحِسَابِ (٤١) وَقَدْ مَكَرَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ فَلِلَّهِ الْمَكْرُ جَمِيعًا يَعْلَمُ مَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ وَسَيَعْلَمُ الْكُفَّارُ لِمَنْ عُقْبَى الدَّارِ (٤٢)﴾ الرعد:٤٠-٤٢.

واتە: ئەگەر هەندێ لە هەڕەشەکانی خۆمانیان بۆ پێش بهێنین و نیشانت بدەین، یاخود بتمرێنین و سەرئەنجامی ئەوان نەبینیت، خەفەت مەخۆ چونکە بە ڕاستی تۆ تەنها گەیاندنی پەیامەکەت لەسەرە، لێپرسینەوەش لەسەر ئێمە..

ئایا خوانەناسان نەیانبینیوە، ئێمە چۆن ئەم لاو ئەو لای زەوی کەم ئەکەینەوەو، خوا خۆی دادوەری دەکات و گۆڕانکاریەکان تاووتوێ دەکات، کەس ناتوانێ موحاسەبەی بکات و کۆسپ و تەگەرە بهێنێتە ڕێی و ئەو زاتە زۆر بە خێرایی هەموو شتێك تاوو توێ دەکات و لە هەمووان دەپرسێتەوە. بێگومان خوانەناسانی

پێش ئەمانیش پیلانیان گێڕا، بەمەرجێك پیلانەکانیان هەر هەمووی لای خوا ڕوون و ئاشکران، دەزانێ هەر کەس چی دەکات و چی دەستپێشخەری دەکات، خوا نەناسانیش لە ئایندەدا دەزانن کە سەرەنجام ئەم جیهانەو ئەو جیهانیش بۆ کێ دەبێت.

## خوای زانا بەرگری لەمافی جولەکەیەک ئەکات:

ئەم چەند ئایەتە بەڵگەیەکی روون و ئاشکران کە ئەم قورئانە لەخواوەیە و حەزرەتﷺ غەیب نازانێ مەگەر شتێك خوا بۆی ئاشکرا بکات.

ریفاعە هاوەڵێکی حەزرەت بووﷺ زرێکەی دزرا، قەتادەی برازای چووە خزمەت پێغەمبەرﷺو وتی: گومانی زۆرمان کەوتۆتە سەر (توعمەی کوڕی ئوبەیریق) (کە پیاوێکی مونافیق و خراپ بوو)، توعمەش کە بەمەی زانی بەدزی یەوە زرێکەی فرێدایە ماڵی کابرایەکی جولەکە کە ناوی زەیدی کوڕی سەمین بوو، ئنجا چەند کەسێکی نارده لای پێغەمبەری خوداﷺ تا پێی بڵێن: قەتادە و مامی بە بێ بەڵگە لەناو خەڵکیدا توعمەیان بەدز داناوە، توعمە گوایە پیاوێکی موسڵمانە و زەیدی جولەکە دزی کردووە.

کە ماڵی زەید گەڕان و زرێکە دۆزرایەوە، حەزرەتﷺ کەزاهیر بینە لۆمەی قەتادەی کرد کەچۆن بە بێ بەڵگە توعمەی تۆمەتبار کردووە! بەڵام دیارە ئەم دونیایە بێ خاوەن نیە، ستەملێکراو ئەگەر کافریش بێت لە نێوان ئەو و خوادا پەردە نیە، بۆیە خوا لەسەر و حەوت ئاسمانەوە ئایەتی نارده خوارەوە و نهێنیەکانی ئاشکرا کرد کە توعمە تاوانبارە و ئەو جولەکەیە بێ تاوانە، کەبەڕاستی ئەمەش گەورەترین بەڵگەیە لە سەر پەیوەندی حەزرەتﷺ بە ئاسمانەوە، هەروەك دەفەرموێت: ﴿ إِنَّا أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ

اللَّهُ وَلَا تَكُنْ لِلْخَائِنِينَ خَصِيمًا (١٠٥) وَاسْتَغْفِرِ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَحِيمًا (١٠٦)﴾ النساء.

واته: ئەی پێغەمبەرﷺ ئێمە قورئانمان بە هەق بۆ تۆ ناردۆتە خوارەوە، تا بەو پێیەی کە خودا بۆی روونکردویتەوە لە ناو خەڵکیدا حوکم بکەیت بێ لایەنگری بۆ هیچ کەسێك، تۆ بەرگری و دیفاع لەو کەسانە مەکە کەخیانەت دەکەن و گوناهی خۆیان دەخەنە سەر کەسێکی تر، وەکو ئەوەی توعمەو خزمەکانی کردیان، داوای لێخۆش بوون لەخوا بکە، بێگومان خوا زۆر لێخۆش بوو میهرەبانە.

﴿ وَلَا تُجَادِلْ عَنِ الَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنْفُسَهُمْ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ مَنْ كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا (١٠٧) يَسْتَخْفُونَ مِنَ النَّاسِ وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ اللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرْضَى مِنَ الْقَوْلِ وَكَانَ اللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا (١٠٨) ﴾ النساء.

ئەی پێغەمبەر(د.خ)تۆ پاکانە بۆ ئەو کەسانە مەکە، کەبەخیانەت کردن لەگەڵ خەڵك و بوهتان بۆکردنیان، خیانەت و خراپە لەگەڵ خۆیان دەکەن، بێگومان هەرگیز خوا ئەو کەسانەی خۆش ناوێت و رووی رەحمەتی ناکاتە هەرکەسێك کە لە سەر خیانەت و گوناهکاری بەردەوام بێت.

ئەوانەی کە لە سەر خراپەکاری و گوناه بەردەوام و سوورن و شەرم لە خەڵکی دەکەن و بە دزی خەڵکەوە گوناه دەکەن، ئەی چۆن شەرم لە خوا ناکەن؟ لە حاڵێکدا خوا ئاگادارە بە گشت ئەو قسانەی بە شەو هەڵی دەبەستن و بڕیاری لەسەر دەدەن، خوا رێگای نەداوە بەو جۆرە قسانە و هەرگیز پێی رازی نیە، خوا دەوری هەموو شتێکی داوە و هیچی لێ ون نابێت.

﴿ هَا أَنْتُمْ هَؤُلَاءِ جَادَلْتُمْ عَنْهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فَمَنْ يُجَادِلُ اللَّهَ عَنْهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَمْ مَنْ يَكُونُ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا (١٠٩)﴾ النساء، بەخزمەکانی توعمە

دەفەرموێ: ئەوەتا ئێوە ئێستە دەمە دەمێ دەکەن لە دنیادا بۆ رزگارکردنیان، ئەی لە رۆژی دواییدا کێ لای خوا پاکانەیان بۆ دەکات؟ کە خوا ئاگاداری هەموو قسە و کردارێکە، یاخود کێ دەبێتە پشتیوانیان و بە هانایانەوە دێت و فریایان دەکەوێت؟!

﴿ ومنْ يَعْمَلْ سُوءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ اللَّهَ يَجِدِ اللَّهَ غَفُورًا رَحِيمًا (١١٠) وَمَنْ يَكْسِبْ إِثْمًا فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُ عَلَى نَفْسِهِ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا (١١١) وَمَنْ يَكْسِبْ خَطِيئَةً أَوْ إِثْمًا ثُمَّ يَرْمِ بِهِ بَرِيئًا فَقَدِ احْتَمَلَ بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُبِينًا (١١٢)﴾ النساء، واتە: هەرکەسێك خراپەیەك لەگەڵ یەکێك بکات، یان بەگوناه وتاوان ستەم لە نەفسی خۆی بکات و دوایی پەشیمان ببێتەوە و داوای لێخۆش بوون لە خوا بکات، دەبینێت کە خوا زۆر لێخۆش بوو میهرەبانە، هەرکەسێك گوناهو تاوانێك بکات زەرەر و زیانەکەی بۆخۆی دەگەڕێتەوە، خوا زانا و ئاگادارەو کاربەجێ یە.

هەرکەسێکیش خراپەیەك بکات و بیەوێت بیدا بەسەر کەسێکی بێ تاوان دا، ئەوا ئەو کەسە گوناهێکی گەورە و ئاشکراو بوهتانێکی ترسناك دەدا بە کۆڵی خۆیدا و لە دوارۆژدا گیرۆدەی سزاکەی دەبێت.

﴿ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُ لَهَمَّتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ أَنْ يُضِلُّوكَ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّا أَنْفُسَهُمْ وَمَا يَضُرُّونَكَ مِنْ شَيْءٍ وَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلَيْكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُنْ تَعْلَمُ وَكَانَ فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا (١١٣)﴾ النساء.

واتە: ئەی پێغەمبەر ئەگەر یارمەتی و رەحمەتی خودات لەگەڵ نەبوایە، کۆمەڵێ لە کەسوکاری توعمە ویستیان وێڵت بکەن و جولەکەکە تاوانبار بکەیت، بەڵام ئەوانە هەر خۆیان وێڵ دەکەن و سەر لەخۆیان دەشێوێنن، وەگەرنا ناتوانن هیچ زیانێك بەتۆ بگەیەنن، خوا قورئانی بۆ ناردویتەتە خوارەوەو مەبەستەکانی بۆ

ئاشکرا کردویت و ئەوەی کەپێشتر نەتدەزانی بۆی روونکردویتەوەو فێری کردویت، کەرەم و بەخششی خودا بەسەر تۆوە گەلێك زۆر و گەورەو بەردەوامە.

پیاوێکی سویدی کە ناوی خۆی کردووە بە (محمود جونار ) موسڵمان بوو وتی: بە ڕاستی لە ئیسلام دا خوای پەروەردگار تەنها خوای موسڵمانان نیە، هەروەك چۆن جولەکەکان خوا تەنها بە هی خۆیان دەزانن!! بەڵکو (رب العالمین)ە، و هەر لە سەرەتاوە ئەمە رادەگەیەنێ (الحمد لله رب العالمین)، کە بەڕاستیش ئەوەتا لەم رووداوەدا رەنگ دەداتەوە، خوای پەروەردگار لەبەرئەوەی پەروەردگاری جیهانیانە بە ئینس و جینەوە، بە هەموو دروستکراوەکانی بوونەوەرەوە، ئەوەتا قایل نابێت جولەکەیەکی بێ تاوان، تەنانەت ئەگەر دوژمنی ئیسلامیش بێت، ستەمی لێبکرێت، بەڕاستی ئەم دیفاعەی قورئان لەو جولەکەیە دەیسەلمێنێ کەئەم قورئانە لەخواوەیەو بۆ ئەوە هاتووە دادپەروەری لەناو بەنی ئادەم دا بچەسپێنێ و بەگشت ئادەمیزادەکان دەفەرموێ: بترسن لەو رۆژە کە خوا هەقی بزنی بێ شاخ بەسەر شاخدارەوە ناهێڵێ!

پێغەمبەر(د.خ) (معصوم) ەو خوای گەورە بەوەحی رێنمایی دەکات، هەر بۆیە جڵەوگیری دەکات لە موسڵمانان کە نەهێڵن هەقی کەس بێت بە لایاندا، تەنانەت ئەگەر پێغەمبەریش(دروودی خوای لەسەر)لەوەی کە زاهیر بینە بڕیاریان بۆ بدات، هەروەك دەفەرموێت: (انكم تختصمون الي، وانما أنا بشر، ولعل بعضكم أن يكون ألحن بحجته من بعض، فأقضي له على نحو مما أسمع منه، فمن قطعت له من حق أخيه شيئا، فلا يأخذه، فانما أقطع له به قطعة من النار! فليحملهاأو يذرها) بخاری.

ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی کە خۆشەویستمان درودی خوای لەسەر غەیب نازانێ و بەزاهیری شتەکان حوکم دەدات، مەگەر وەحی تەدەخول

بکات بۆ راستکردنەوە لە کاتی پێویست دا، ئەوەتا دەفەرموێت: ئێوە دێنە لای من بۆ ئەوەی حوکمتان بۆ بدەم، منیش ئادەمیزادێکم، غەیب زان نیم مەگەر ئەوەی خوا فێرم بکات، جا ڕەنگە هەندێکتان لێزانتر بێت و هەرچەند لە سەر هەقیش نەبێ وابکات هەق بدەم بەو، بەوەی کە لێی دەبیستم، هەرکەس من هەقی برایەکیم پێدا با وەری نەگرێت، چونکە بەوحوکمەی من بۆی حەلاڵ نابێت، وە ئەوە ئاگرە با وەری نەگرێت.

## زانستی خوا فراوانە!!

ئەگەر بانگخوازێك بیەوێ دڵخۆش بکات، بادڵ بەو بازرگانیە بێ وێنەیە خۆش بکات کە پڕ خێر و بەرەکەت و ڕوون و ئاشکرا و بێ پێچ و پەنایە.

بازرگانی بانگخوازان لەگەڵ خوادا، وەکو بازرگانی خەڵکانی تر نیە، هیچ ترسی دابەزینی نرخی دۆلار و کێشەی ناردن و تەحویلی پارە و کێشەی بۆرصەکانی تیا نیە.

نرخی سەهمەکان دیاریيە و چەند زیاتر ماندووبێت زیاتر خوالێی رازی دەبێت و پاداشتی دەداتەوە و قازانج دەکات. قازانجێك لە دە قاتەوە هەتا حەوت سەد قات بگرە زۆر لەوە زیاتریش: ﴿ **وَاللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ البقرة**:٢٦١. بۆیە هەر بڕوادارێك لەم بازرگانیە تێبگات، شەوو رۆژ دەداتە دەم یەك و پیاوانە قۆڵی لێ هەڵدەماڵێت و کات بەفیڕۆ نادات.

ئای چ خۆشیەکە، گەیشتن بەپێغەمبەران و پیاوچاکان و شەهیدان و راستگۆیان و هاوەڵی کردنیان بۆ هەتا هەتایی، سەرباقی هەموو ئەوانەش نیعمەتی بینینی خوای گەورە کە لەهەموو نیعمەتێك گەورەترە.ئاشکرایە بەهەشتیش پلەپلەیە، هەر

پلەیەك بتەویٚ بیگەیتیٚ، نرخی خۆی هەیە و، هەوڵی تایبەتی خۆی دەویٚت، کەدەستیشت کەوت یەکجاری و موڵکایەتیە و حسابی کرێچیت بۆ ناکریٚ!

بەهەشت بەزەحمەت و ناڕەحەتی تەنراوە و ژیانیش ئەو هەوڵ و زەحمەت و رەنجەیە کە ئەدرێت بۆ گەیشتنە بەهەشت ﴿ يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَى رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَاقِيهِ ﴾ الانشقاق:٦. واتە: ئەی ئادەمیزاد تۆ خۆت ماندووەدەکەیت و رەنجدەریت بەرە و لای پەروەردگارت، کە سەرەنجام لای ئەو پاداشتەکەی وەردەگریت.

جا ئەگەر ژیان بۆ خۆی بەگشتی زەحمەت و ماندوبوون بیٚ بۆ خەڵکی، بۆ بانگخوازان زەحمەتترە بەتایبەتی، چونکە ئەو هەقەی لای ئەمە بەزۆر کەس ناخوات و دژایەتی دەکریٚت ﴿ وَأَكْثَرُهُمْ لِلْحَقِّ كَارِهُونَ ﴾ المؤمنون: ٧٠

حەسەنی بەسری دەڵیٚت: (ئەم هەقە قورس و گرانە، خەڵکی هەوڵیان داوە وئەم هەقە بۆتە ریٚگر و بەربەست لەنیٚوان خۆیان و زۆر لەهەواو ئارەزووەکانیاندا، سا بەوخوایە کەسیٚ لەسەر ئەم هەقە دانامەزریٚ مەگەر لەفەزڵەکەی تیٚ گەیشتبیٚ و چاوەڕوانی عاقیبەت و پاداشتەکەی بیٚت).

بەتیٚگەیشتن لەم راستیانە، هەوڵدان دەبیٚتە خولیای سەری بانگخواز و هەموو شەویٚ بیٚ خەم سەرنانیٚتە سەر سەرین و هەموو رۆژیٚکیش خەمیٚکی تازەی لەبەرە بۆ کاریٚکی تازە و بۆ داهیٚنانیٚك کە خزمەت بەئاین و بەخەڵکی بکات. ئنجا ئەگەر لەم ریٚگایەشدا خۆڵاوی ببیٚت و تۆز و گەردی لیٚ بنیشیٚت، ئەو تۆز و خۆڵ و گەردەی بۆدەبیٚت بەپاریٚزەر لەئاگری دۆزەخ، هەروەك خۆشەویست (د.خ) دەفەرمویٚت: (من أغبرت قدماه في سبيل الله، حرمه الله على النار). جا ئەگەر کەسانیٚك خەو بە دۆلارو دینارەوە دەبینن، ئەم دڵخۆشی و دڵشادییەکەی بەو تۆز و خۆڵەیە کە لەبانقی قیامەتدا پاشەکەوتی کردووە!

پادشای دادپەروەری ئەندەلس (المنصور أبو عامر محمد بن ابی عامر) یەکێکە لەو خواناسە تێکۆشەرانەی کەچاك لەم مەسەلەیە تێگەیشتبوو، بۆیە لەسەردەمی دەسەلاتیدا بەردەوام خەریکی جەنگی ڕۆم بوو، ئەوەندە شەوقی هەبوو بۆ جیهاد، جاری وا هەبوو دوای نوێژی جەژن بەرێ دەکەوت بەرەو گۆڕەپانی جیهاد و ڕوو بەڕووبوونەوە، سوپاکەشی بەدوایدا دەچوون و بەم جۆرە جەژنیان لەناو تۆز و غوباری گۆڕەپانی جەنگدا دەکرد!

لەماوەی فەرمانڕەوایەتیەکەیدا زیاتر لەپەنجا جار جەنگا لەگەڵ ڕۆمەکاندا و سەرکەوتنی باشی بەدەستهێنا کە ئەوانەی پێش خۆی بەدەستیان نەهێنابوو. کە ئەوانەش (ابومروان بن حیان) لەپەڕاوی (مآثر العامریة) دا باسی کردوون. بەڵێ، لەش سووك بوو بۆ جیهاد، ساڵی واهەبوو دووجار دەچوو بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوەی دوژمنان و، هەرکاتێکیش لەجەنگ بگەڕایەتەوە فەرمانی دەدا جلەکانی بتەکێنن و ئەو تۆز و خۆڵەی کەپێیانەوەبوو کۆبکرێتەوە و هەڵبگیرێت.

جا کاتێکیش لەسەرەمەرگدا بوو، فەرمانیدا: ئەگەر مرد ئەو تۆز و خۆڵی جیهادەی کۆکراوەتەوە بیکەن بەسەر کفنەکەیدا، کاتێك ئەسپەردە بەخاك کرا.

بەڵێ. لەدوورترین (ثغور) ی موسڵمانان، لەناوچەیەك کە پێی دەوترا (مدینة سالم) بەئازاری ناوسك لەکاتی جیهادا وەفاتی کرد، لەساڵی ۳۹۳ ی کۆچیدا، کە (ان شاء الله) شەهیدە و هەر لەوێش نێژدرا و وەسیەتەکەی جێبەجێکرا.

***

## خوای گەورە زانایی و قودرەت و دەسەلاتی خۆیمان پیشان ئەدات

﴿ لِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ يَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ إِنَاثًا وَيَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ الذُّكُورَ (٤٩) أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَاثًا وَيَجْعَلُ مَنْ يَشَاءُ عَقِيمًا إِنَّهُ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴾ الشورى:٥٠. واتە: هەر بۆ خوایە خاوەنداریێتی ئاسمانەکان و زەوی، هەرچی بوێت دروستی دەکات، بەرهەکەس بیەوێت کچ دەبەخشێت و بەهەر کەس بیەوێت کوڕ دەبەخشێت، یاخود لەهەردوو جۆر " بەهەندێك خێزان دەبەخشێت لەکوڕ و لەکچ " هەیشە ویستی خوا وایە هیچی ناداتیّ و نەزۆك دەبێت، بەراستی ئەو زاتە زاناو بەدەسەلاتە.

مەسەلەی منالّبوون موعجیزەیەکی زۆر گەورەیە، گەورەترین بەلّگەیە لەسەر مردن وزیندووبوونەوە و دەسەلاتی بێپایانی خوا، کەچی لەئەنجامی زۆر روودان و دووبارە بوونەوەیەوە لای مرۆڤ ئاسایی بووە و زۆر سەرنجی نادات، بۆیە قورئان ئاوا جەخت دەکاتە سەری و سەرنجمان رادەکێشیّ بۆی، تا چاکتر لە قودرەت و دەسەلاتی خوا تیّ بگەین.

بوونی منالّ دەستی مرۆڤی تیانیە کە رەگەزەکەی چی دەبێت کەچی بە حیکمەت و تەقدیری خوا لەهەموو ولاتان رێژەی نێرو میّ نزیکن لەیەك، ئەگەر وانەبووایە ناهاوسەنگیەکی سەیر دەبوو لەدونیادا بۆ نموونە شارو لادێیەك هەرکوڕ یان هەرکچیان ببوایە، سبحان الله چۆن ئۆکسجین و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن هاوسەنگی راگیراوەو شتەکانی تریش هەروا ئەم مەسەلەی بوونی منالّی نێرومیّ هەرهاوسەنگی وتەقدیراتێکی سەیری تیایە کەتەنها لەدەست خوا دێت کە زانست وتوانای بێپایانە..

## لەهەموو زانایەک زاناترە

مرۆڤ کە لەدایك دەبێت هیچ نازانێت و بەویستی خوا وردە وردە شت فێر دەبێت، بەوەی کە هۆکارەکانی فێربوونی داوەتێ، وەك گوێ و چاو ودڵ، هەروەك دەفەرموێت: ﴿ وَاللهُ أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لا تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمْ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ النحل: ٧٨. واتە: خوا ئێوەی لە سکی دایکتان دەرهێناوە بێ ئەوەی هیچ شتێك بزانن، ئنجا دەزگای بیستن و بینین و تێگەیشتنی پێداون، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری بکەن..

خوای گەورەیە مرۆڤ بە زانست و زانین پایەبەرز دەکات بەڵام ئەبێ هەمیشە ئەوەمان لەیاد بێت کەخۆی لە هەموو زانایەك زاناترە،هەروەك دەفەرموێ ﴿ نَرْفَعُ دَرَجَاتٍ مَنْ نَشَاءُ وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ ﴾ یوسف: ٧٦..واتە: پلەو پایەی هەرکەس بمانەوێت بەرزی دەکەینەوە و، خوا لە هەموو خاوەن زانینێك زاناترە.. ئەمەش بۆ ئەوەی کەس لەخۆی بایی نەبێت و هەمیشە داوای زیادبوونی زانست و زانیاری لە خوا بکەین (وَقل رَّبي زِدني عِلما)..

## خوا کارئاسانی بۆ بانگخوازان ئەکات:

بانگخوازی رەحمەتی ئەحمەد دیدادت ئەڵێت:پاش ئەوەی کتێبی ئیزهاری هەقم بەقەدەری خوا لە مەخزەنی دوکانی خاوەن کارەکەمدا دۆزیەوە، خوابەوە بەرچاورۆشنی کردم کە وەڵامی مژدەدەرانبوو لەهیندستان،پیاوێکی بەریتانیش بەناوی فیرفاکس موسڵمان بووبوو، نزیکەی دووسەد کەسێك هەموو یەکشەمەیەك لەخزمەتیا ئەبووین وانەیەکی ئەدایێ لەسەر (چۆن تەورات وئینجیل بەکاربهێنین لەبانگەوازکردندا،زۆر سوودمان لێبینی، پاش ماوەیەك نەمانبینیەوە، بۆیە داوام کرد من لەجێی ئەو هەمان بەراوردکاری لەنێوان ئایینەکاندا بکەم،

ئەمەش بەڵگەیە کەخوا باروزرووف سازئەکات بۆبانگخوازان و هاوکاریان دەکات.

مەقامی بانگخوازی مەقامی پێغەمبەرانە راستە وەحیان بۆنایەت بەڵام وەحی لەبەردەستیانایەو موبەشیراتیش لەکاتی پێویستدا دڵیان خۆش دەکات.

بەندەی موخلیصی موفلیس پاش ٤٤ ساڵ لەبواری بانگەوازدا بەشی خۆم ئەو ریعایەت وموبەشیراتانەم بینیوە، بۆیە لەئەزموونی کەمی خۆمەوە ئەمەتان عەرز دەکەم.

بەخوا بەخوا ئەگەر سەروماڵمان دانێین لەپێناو دینی خوادا کەمەو وەك ئەوەیە هیچمان نەکردبێت.سەیری ئەم ئایەتانە بکەن کەباس لە وەدەکەن کە پێغەمبەران لەژێرچاودێری خوادان:

**١- بۆ موسا سەلامی خوای لەسەر- ﴿ أَنِ اقْذِفِيهِ فِي التَّابُوتِ فَاقْذِفِيهِ فِي الْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ الْيَمُّ بِالسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِي وَعَدُوٌّ لَهُ وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِنِّي وَلِتُصْنَعَ عَلَى عَيْنِي (٣٩)طه–وَاصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي (٤١) –قَالَ لَا تَخَافَا إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى (٤٦)﴾ طه:٣٩–٤٦.**

**٢- بۆنوح سەلامی خوای لەسەر- ﴿ وَاصْنَعِ الْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا﴾ هود:٣٧. ﴿ تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا جَزَاءً لِمَنْ كَانَ كُفِرَ﴾ القمر:١٤.**

**٣- بۆ سەروەرمان درووودوسەلامی خوای لەسەر- ﴿ وَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا﴾ الطور:٤٨.**

**٤- ﴿ فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَنَجَّيْنَاهُ مِنَ الْغَمِّ وَكَذَلِكَ نُنْجِي الْمُؤْمِنِينَ ﴾ الانبياء:٨٨.** یونس سەلامی خوای لەسەر بەبێ ئیزنی خوا بانگەوازی بەجێهێشت خواش لەسکی حوتا بەندی کرد، پاش تەسبیحاتی زۆری ئازادی کردو لەوخەمە

رزگاری کرد، ئەمەش بۆ بڕواداران بەگشتی و بانگخوازان بەتایبەتی دووبارە ئەبێتەوە..

شێخی گەورەمان نوورسی ناوی ناوە زللەی میهرەبانی و ئەڵێت: ئامادەم هەشتا نموونەتان بۆ باس بکەم کەبەسەرخۆم و قوتابیەکانمدا هاتوون. بکەونە بانگەواز بەهەرچی بۆتان ئەکرێت تارۆژی رووناکتان نەبووە بەشەوی تاریکی قەبروقیامەت.



## خوا ئاگاداره وپاداشتی چاکه ئەداتەوە:

پیاوێکی میسری ئەڵێت: نەنکم ساڵی ١٩٤٩ لەخەستەخانە کەوتبوو پێویستی بەخوێنی ئەی بی ناقص هەبوو دەست نەدەکەوت، ژیانی لەمەترسیدابوو، باوکم تائێوارە پەلەقاژێی بوو دەستی نەکەوت، بانکی خوێنیش ئەوسا وەك ئێستا نەبوو، ئێوارە بێهیوا ئەبێت و ئەیەوێت سەرێ لەماڵەوە بداتەوە کەسێك ئەبینێت لەخەستەخانە دێتە دەرەوە لەبەرخوا بۆی دەوستێت وفەرمووی لێدەکات بیگەیەنێت، کابرا سەردەکەوێت و پاش قسەوباس ئەڵێت: پەکمان کەوتووە بۆ ئەوجۆرە خوێنە، خۆشبەختانە ئەڵێت: من گروپی خوێنەکەم ئەوەیەو یەکسەر ئەگەڕێنەوە وخوێن ئەبەخشێ بەنەنکم و بەوەش لەمردن رزگاری بوو، نەنکم لەتەمەن درێژەکان بوو تا ساڵی ١٩٩٦ ژیا لەکاتێکدا کەس ئەو رۆژەی خوێنەکە بەتەمای نەمابوو، سبحان الله لەوخوایەی کە پاداشتی چاکە لای ون نابێت وئەجەلێکی بۆهەریەکەمان داناوەو خۆی قەدەرەکان بەجۆرێك رێکدەخات کەئێمە سەری لێدەرناکەین.

***

## هەرخوا خۆیەتی کەئاوا ڕووداوەکان ئەسازێنێ

## قەدەر/بەشی یەکەم

لەبەسەرهاتی موساوە سەلامی خوای لەسەر کەقورئان باسی دەکات لەمەسەلەی قەدەرتێدەگەین لەژیانی پێغەمبەران و بانگخوازاندا، بۆنموونە ئەوەتا قورئان دەفەرموێت:-

﴿ إِذْ أَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّكَ مَا يُوحَى ﴾ طه: ٣٨. ئەو کاتەی دەبوو پەیام بدرێ و ئیلهام بکرێ، بە دایکت پەیامان دا و ئیلهامان کرد.

﴿ أَنِ اقْذِفِيهِ فِي التَّابُوتِ فَاقْذِفِيهِ فِي الْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ الْيَمُّ بِالسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِي وَعَدُوٌّ لَهُ ﴾

موسا بخە نێو سندوق و لە دەریای بهاوە تا دەریا بیخاتە لێواری زریبارێ و دوژمنی من و دوژمنی ئەو(لە ئاو بیگرێتەوە و) هەڵی گرێتەوە.

﴿ وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِنِّي وَلِتُصْنَعَ عَلَى عَيْنِي ﴾ طه:٣٩.

(ئەی موسا) خۆشەویستی خۆم خستە سەر تۆ(بەجۆرێکی وەها هەرکەس کە تۆ ببینێ خۆشی بوێ) وە لەژێر چاودێری من پەروەردە بی.

﴿ إِذْ تَمْشِي أُخْتُكَ فَتَقُولُ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى مَنْ يَكْفُلُهُ فَرَجَعْنَاكَ إِلَى أُمِّكَ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ ﴾ طه:٤٠.

لەوکاتەدا خوشکت (نزیکی کاخی فیرعەون) دەڕۆیی (و دیتی تۆیان لە ئاو گرتەوە و دەگەڕان لە دایەنێك شیرت بداتێ، خوشکت هاواری لێکردن و پێی گوتن): ئایا بۆلای کەسێك ڕێنوێنیتان بکەم کە سەرپەرشتی بکات و بەخێوی بکات؟ (وە دایەنێکی باش بۆ ئەوبێ؟ ئەوان ڕازی بوون و دایکتی بۆ هەڵدان، ئە ئاوا) جا تۆمان بۆلای دایکت گەڕاندەوە تا چاوی پێت ڕوون کاتەوە و پێت شاد بێتەوە و غەمگین نەبێ و پەژارە دای نەگرێ.

﴿ وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَاكَ مِنَ الْغَمِّ وَفَتَنَّاكَ فُتُونًا فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِي أَهْلِ مَدْيَنَ ﴾ طه:٤٠. وە (دوای گەورە بوون، بە هەڵە لە فیرعەونیان) یەکێکیانت کوشت، وە ئێمە تۆمان لە غەم و پەژارە (ی شەڕ و بەڵای فیرعەون و لە تۆڵەی ئەوان) ڕزگار کرد، وە (دوای ئەوەش) چەندین کەڕەت تۆمان تاقی کردەوە(بۆ ئەوەی لە پاشەڕۆژدا ڕۆژگارانێك خەبات بکەی، دوای ئەوە) جا ساڵانی ساڵ لەنێو خەڵکی مەدیەن دا مایتەوە.

﴿ ثُمَّ جِئْتَ عَلَى قَدَرٍ يَا مُوسَى ﴾ طه:٤٠. لە پاشان ئەی موسا لە کاتی دیاریکراو و مۆقەددەر کراو (لە مەدیەن بۆ میسر) هاتیەوە.

﴿ وَاصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي﴾ (طه:٤١. وە تۆم بۆ(پەیامبەری) خۆم هەڵبژارد.

قەدەرەکان ئەوەندە وردەکاری تیکراوە سەرسام ئەبیت، هەرخوا خۆیەتی کەئاوا ڕووداوەکان ئەسازێنێ، هەرخوایە دڵی دایکی موسای دامەزراند کەجگەرگۆشەکەی بخاتە دەریاوە، هەرخوا خۆیەتی فەرمانی بەدەریا کرد بەشەپۆلەکانی سەبەتەکەی موسای شیرەخۆر بەرەو کەناری کۆشکی فیرعەون بیات،و خەدەم وحەشەمی کۆشکی فیرعەون ئەومناڵ وسەبەتەیە بگرنەوە.

ئنجا خوا خۆشەویستی کردو ژنی فیرعەون دڵی چووە سەری.ئنجا شیری هیچ ئافرەتێك نەخوا، ئنجا خوشکی بتوانێ بچێتە کۆشکی فیرعەونەوەو تەگبیریان بۆبکات، قسەکانی هەمووی جێی گومان بووەو خوا نەبوایە هەموو کارەکە کەشف ئەبوو! ئنجا گەڕایەوە کۆشی گەرمی دایکی نەك هەر سەلامەت بوو، بگرە مووچەشیان بۆ بڕیەوە و مەمنوونی بوون شیری بداتێ.گەورە بوو لەماڵی فیرعەوندا، ئنجا بەهەڵەکەسێکی لێکوشتن، ئنجا چووە مەدیەن و خوارزگاری کرد وژنی هێنا،ئنجا بەقەدەرێکی تایبەت لەکات و ساتی پێویستا هاتەوە بۆگەیاندنی پەیامەکە...

## قەدەر - بەشی دووەم

جارێکی تر لەم ئایەتانەی سورەتی (القصص) وردبنەوە تا بەئاشکرا لەویست و ئیرادەو قەدەری خواتێبگەن، هەندێ کورتکردنەوە لەمەشهەدەکانداهەیە خەیاڵتانی بۆ بخەنە کار:

﴿ طسم (١) تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ (٢)﴾ ئەوانە ئایاتی کتێبی ڕوون و ڕوونکەرەوەن.

﴿ نَتْلُوا عَلَيْكَ مِنْ نَبَإِ مُوسَى وَفِرْعَوْنَ بِالْحَقِّ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ (٣)﴾ ئێمە هەندێك لە دەنگوباسی مووسا و فیرعەون ڕاست و دروست بۆ تۆ دەخوێنینەوە، وە بۆ (ئەوەی) ئیمانداران (لێی ئاگادار بن و کەڵکی لێ وەرگرن).



﴿ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي الْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَائِفَةً مِنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَاءَهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءَهُمْ إِنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ (٤)﴾ بێ گومان فیرعەون لە زەمین دا یاخی بوو، وە خەڵکی ئەوێی دەستە دەستە و تاقمە تاقمە کرد (دژایەتی و دووبەرەکی خستە نێوانیان). لە ئەوان دەستە و تاقمێکی (کە بەنی ئیسرائیل بوون، لە بەرابەری قیبتیەکان دا) زەبوون و بێ هێز و پێز کرد. کوڕەکانیانی سەر دەبڕی، وە کچەکانی زیندوو (بۆ خزمەت) ڕادەگرت. بەڕاستی فیرعەون لە گەندەڵکاران و خراپەکاران بوو.

﴿ وَنُرِيدُ أَنْ نَمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ (٥)﴾ ئێمه دەمانەویست دەرحەق بە کەسانێك لوتف و کەرەم بکەین و بە چاکە بیان خوێنینەوە کە لە زەمیندا زەبوون و بێ هێز و پێز کرابوون، وە ئەوان بکەینە پێشەوا و، وە بیان کەینە میراتبەران.

﴿ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُمْ مَا كَانُوا يَحْذَرُونَ (٦)﴾ وە ئەوان لە سەرزەمینی (میسر) دا نیشتەجێ و خاوەن دەسەلات بکەین، وە بە فیرعەون و هامان و لەشکرەکانیان شتێك نیشان بدەین کە لێی دەترسان و خۆیانیان لێ دەپاراست (کە تیاچوونیان بوو بەدەستی بەنی ئیسرائیل).

﴿ وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي الْيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِي إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ (٧)﴾ وە بە دایکی موسامان ڕاگەیاند: شیری بدەیە. جا هەرکاتێ نیگەران بووی و لێی ترسای بیهاوە نێو دەریا، وە مەترسێ و غەمگین مەبە بێگومان ئێمە بۆتی دێنینەوە و دەیکەینە پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران.

﴿ فَالْتَقَطَهُ آلُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا خَاطِئِينَ (٨)﴾ (کار گەیشتە ئەو جێگایەی دایکی موسا ناچار بوو موسای بهاوێتە دەریایە). خانەدانی فیرعەون ئەویان (لەنێو شەپۆلان) هەڵ گرتەوە، تا سەرەنجام ببێتە دوژمنیان و (هۆی مەینەت و) پەژارەیان.بێگومان فیرعەون و هامان و سەربازانیان خەتا کاربوون (و لە ئێرەدا دوچاری هەڵە بون).

﴿ وَقَالَتِ امْرَأَتُ فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ لِي وَلَكَ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَى أَنْ يَنْفَعَنَا أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَدًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ (٩)﴾

وە ژنی فیرعەون گوتی: (ئەی فیرعەون، ئەو کۆرپەیە) نووری چاوی من و تۆیە. (شادی هێنی غەم ڕەوێنە، واز لە کوشتنی بێنە). ئەوی مەکوژن ئومێدە

سوودی بۆمان دەبێ، یان بیکەینە کوڕی خۆمان. (وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ) ئەوان تێ نەگەیشتن و نەیان دەزانی (کە قەدەر لەپشت پەردەی غەیبەوە چییان بۆ ئامادە دەکا و موسا چیان بەسەر دێنێ).

﴿ وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَى فَارِغًا إِنْ كَادَتْ لَتُبْدِي بِهِ لَوْلَا أَنْ رَبَطْنَا عَلَى قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ (١٠)﴾ وە دڵی دایکی موسای (تاقەتی لێ بڕابوو) خاڵی مابوو. ئەوەندەی نەمابوو ڕازی ئەو بدرکێنێ (و دەنگی خۆی لێ هەڵێنێ: کێ مووسای کوڕم دێنێ!) ئەگەر دڵی ئەوێمان دانەمرکاندبایە، تاکو لە زومرەی ئیمانداران بایە.

﴿ وَقَالَتْ لِأُخْتِهِ قُصِّيهِ فَبَصُرَتْ بِهِ عَنْ جُنُبٍ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ (١١)﴾ وە (دایکی موسا) بە خوشکی مووسای وت: شوێنی کەوە. جا ئەویش لە دوورەوە گرتیە بەرچاو، بێ ئەوەی ئەوان تێی بگەن و بیناسن.

﴿ وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ الْمَرَاضِعَ مِنْ قَبْلُ فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُ لَكُمْ وَهُمْ لَهُ نَاصِحُونَ (١٢)﴾ وە ئێمە پێش ئەوەی (دایکی بۆ بە دایەن بگرن نەمان هێشت مەمکی هیچ دایەنێك بگرێ و بمژێ و) دایەنمان لێ دوور خستەوە. (خوشکی موسا خۆی گەیاندە ئەوان و) وتی: ئایا بە خاو و خێزانی ماڵێك ئێوە ڕێنوێنی بکەم کە سەرپەرستی ئەویتان بۆ وە ئەستۆ بگرن و (بۆتانی بەخێو بکەن و) خێر خواز و دڵسۆزی بن و باشی پێ ڕابگەن؟

( وَهُمْ لَهُ نَاصِحُونَ ) بیهێننە بەرچاوتان بەچ زەحمەتێك ئەم ئافرەتە بەنی ئیسرائیلیە چۆن دوای سەبەتەی براکەی کەوتووە دوراو دوور کەشەپۆلی ئاو بەفەرمانی خوا بەرەو کەناری لای ماڵی فیرعەونی بردووە، دیارە پاسەوانان ئەوناوەیان تەنیوە، چۆن خۆی گەیاندۆتە ناو ماڵی فیرعەون، تۆ کێیت و چ کارەیت لەم ناوە، ئنجا خۆی وقسەکانی هەمووی جێی گومانن، کەدەڵێ:

ماڵێکتان پیشان بدەم کەدڵسۆزن بۆ ئەم ماڵەو سەرپەرشتیان بۆبکات، دیارە لێیان پرسیوە، تۆکێیت؟ چۆن ئەوە ئەزانیت کەدڵسۆزن وسەرپەرشتی دەکەن؟ رەنگە بەزەحمەت خۆی دەربازکردبێت لەو پرسیارانە بەوەی کەوتبێتی: کێ هەیە دڵسۆزنەبێت بە جەنابی فیرعەون...(قەدەرێکی خوایە کەئەوەی دەیەوێت ئەبێت ببێت).

﴿ فَرَدَدْنَاهُ إِلَى أُمِّهِ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ (١٣)﴾ القصص.

(دەست و پێوەندی فیرعەون دایکی موسایان بردە کۆشکی فیرعەون. موسا دەمی بە مەمکی دایکێوە نا. ئێمە ئە ئاوا) موسامان بۆ لای دایکی گێڕاوە تا چاوی ڕوون بێتەوە و شاد و شەنگوڵ بێ و غەمگین نەبێ و بزانێ کە بەڵێنی خودای ڕاستە، بەڵام زۆربەی خەڵك (ئەوە) نازانن.

## قەدەر بەشی سێیەم:

بانگخوازان هەوڵ ئەدەن بۆ چاکسازی و تەوفیقیشیان لەخواوەیە:

﴿ إِنْ أُرِيدُ إِلَّا الْإِصْلَاحَ مَا اسْتَطَعْتُ وَمَا تَوْفِيقِي إِلَّا بِاللَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴾ هود:٨٨.

دکتۆری ئەندازیار فازڵ سولەیمان ئەڵێت:زۆر سوودم لەدکتۆر محمد مەمدوح وەرگرت لەئەمەریکا لەبواری بانگەوازدا، جەنابیان وتیان: ئیتر لەخەم رەخسیویت و بانگەوازبکە، منیش وتم: ئەترسم هەندێ پرسیار هەیە لێم بکەن و نەتوانم وەڵام بدەمەوە، وتی:ئەوەی دەربارەی ئافرەت و ئیرهاب و توندوتیژیەو زۆر لەبارەیانەوە پرسیار ئەکرێت وەڵامیان دیارە، وتم: ئەترسم پرسیارم لەسەر قەدەر لێبکرێت

ونەتوانم وەك پێویست وەڵام بدەمەوە، وتی: نیەتت بۆخوا راست بێت خواخۆی بۆت ئاسان دەكات.

پاش سێ رۆژ بەپەلە ئەمویست بچم بۆ وتارێك لەكەنیسەیەك كە سەعاتە رێیەك دووربوو، هاتمە ناودەرگاكەو برۆم ئەنەسی كورم كە تەمەنی ۳ساڵە هات بەدوامداو ورکی گرتبوو ئەگریا كە بیبەم لەگەڵ خۆمدا، من پەلەم بوو هەرچی هەوڵم دا نەیەت سوودی نەبوو، قەت شتی واشی نەكردبوو، لام سەیر بوو ناچار بەپەلە گۆڕیمان و بردم.

یەكشەممە بوو جادە قەرەباڵغ نەبوو، لەكاتی خۆیدا گەیشتم، سەیرم كرد لەسووچێكی پشتەوە شوێنێك تایبەت كراوە بۆمناڵان كە وێنە بكێشن و رەنگ بكەن، پێمووت: كورم لای من بەعاقڵی و بێدەنگ دائەنیشیت تالێدەبمەوە یان ئەچیت وێنە رەنگ دەكەیت، وتی: ئەچم رەنگ دەكەم.

وتارەكەم دا لەتەواوبووندا بووم یەكێك پرسیاری كردو وتی: ئەزانم لەدوای تەواوبوونی وتارەكەت وەڵامی پرسیار ئەدەیتەوە، بەڵام ئەم پرسیارەم زۆر مەبەستە بۆیە ئەمەوێت هەرئێستا وەڵامم بدەیتەوە، ئێوە دەڵێن:مرۆڤ سەرپشكە لەكارەكانیاو ئەشڵێن خوا هەمووشتەكان پێش ئەوەی ببێت ئەیزانێت و نووسراوە، ئەوە دژبەیەكی تیایەو چۆن ئەگونجێت.

ئەوەی پرسیاری لەبارەوە كرد مەسەلەی قەدەربوو كەئەترسام نەتوانم بەباشی وەڵام بدەمەوە، كەچی خوا ئاسانی كردبۆم و وتم:ئەوە ئەنەسی كورمە لەوسوچەدا، تەمەنی ۳ ساڵەوهات لەگەڵما، منیش پێمووت: بەعاقڵی و بێدەنگ دائەنیشیت یان ئەچیتە ئەو سووچەوە بۆیە دەكەیت، من لەسەدا نەوەو نۆ ئەمزانی بەبۆچوونی خۆم كەبۆیەكردنەكە هەڵدەبژێرێت، ئەویش ئەوەی هەڵبژارد ومن تەواو سەرپشكم كردبوو، جامن كەباوكی ئەوم ئەوە پێشبینیم بوو ئەویش تەواو

سەرپشك بوو، جا خوای گەورە كە بەدیهێنەری ئاسمانەكان و زەویەو زانستەكەی بێكۆتاییە تەواو ئێمەی سەرپشك كردووەو نەشزانێت كەچی دەكەین وبەویستی خۆمان چی هەڵدەبژێرین.

وەلآمەكەم پێكای و هەموو هەستان چەپڵەیان بۆ لێدام ودانیشتنەوە راهیبەیەك نەبێت كەهەر بەپێوەمایەوەو وتی: سوپاس بۆخوا كە ئەو وەلآمەم دەستكەوت و ئاینی هەقم دۆزیەوە. ئنجا لەقەدەرو حیكمەتی هاتنی ئەنەس تێگەیشتم كە خوا هێنای بەخەیاڵمدا ئەو بێنمەوە بەنموونەو وەلآمەكەش قەناعەتی بەهەموویان كرد.

## بانگخواز كاك عەزیم وئاگالێبوونی خوابۆی:

مامۆستا قادر دەرەشیشی دەڵێت:

كاك عەزیم ئاوەڵزاوامەو بانگخوازێكی چاكە لەو گوندانەی لای رێژاوی ئێران، بەرپرسێكی سافاك زوو كە دواتر ئەبێتە پیاوی دەسەلآت، نیوەی ساماناكەی ئەدات كەئەم تووش بكات، دێن ئەیگرن و ئەیبەن بۆ دادگا،عەزیزی براشی كە سەر بەپاسدارانە خۆی ئەبەستێ و ئەچێت لەگەڵیاو ئەڵێت حوكمی بدەن چیم بۆ بكوژرێ ئەیكوژم و بائەوانیش من بكوژنەوە. بەهەرحاڵ لەمەحكەمەدا ئەیەوێت قسەبكات پێی دەڵێن:قسە نەكەیت تۆ سیخوڕیت و چەند تۆمەتی تری بۆ ریزدەكەن.

لەوەدا ئەبن حوكمی لەسێدارەدانی بۆدەربكەن، كەسێك كەقۆڵی هەڵبەستراوە خۆی ئەكات بە مەحكەمەداو ئەڵێ ئەوە چ كەرێك لێرەیە،كوا ئاغای ئازادی كاك عەزیمیش ئەڵێت منم، بەحاكم ئەڵێت: كوا تاوانی چیە؟ ئەوانیش بۆی ریزدەكەن، ئەڵێت:ناماقوڵێتان كرد كوا بەڵگەكانتان.تومەزكابرا لەئیتلاعاتەو لەمەشهەدەوە بەپەلە هاتووەو تومەز لەرێگاش دەعمی كردووەو بەپەلە قۆڵی كەشكاوە بۆیان

بەستووە وهاتووە تا نەهێڵێت ئەو حوکمە بدرێت و قەتلوعام روونەدات بەدەستی عەزیزی برای، ئنجا کابرا خەوی دیوە یان چۆن خواناردویەتی ئەوە نازانین گرنگ ئەوەیە ئەو بانگخوازە لەمەرگ رزگاری بوو بەم کەرامەتە، پاش چەند ساڵ لەسەرەمەرگدا کابرای کۆنەسافاك جوابی بۆمامۆستا عەزیم ناردبوو کە گەردنی ئازاد بکات لەو خراپەیەی کە بەرامبەری کردبووی.

## خوا ئاگادارەو هەقی بۆخاڵی باوکم کردەوە:

حاجی شێخ عومەری قەرەداخی خاڵی باوکمە، تەمەنی ئێستا ٨٥ ساڵە لەسەرخێر، جەنابیان وتیان کە لە سەری نەنکمەوە خزمایەتیمان هەیە لەگەڵ شێخاندا، رەنگە ئەوەش بێت من نەمزانیوە خەمی تەواوکردنی مەکتوباتمەو سوپاس بۆخوا بەرگی پێنجی تەواوکراوکاك ئەحمەدی شێخم زۆر خۆش ئەوێت.

لەچلەکاندا لە گوندی نەوتی شێخ عومەر بێ دایك وباوك گەورە دەبێت، فەیمەی خوشکی کەلەسلێمانی ئەبێت و شوو ئەکات بەباپیرم، ئەو جاروبار هاوکاری بۆدەنێرێت، تا ئەچێت بۆ سەربازی زەمانی عوسمانیەکان و برێك پارە پاشەکەوت ئەکات و لای فەیمەخان دای ئەنێت.پێش ئەوەی بچێت بۆسەربازی ئەچێتە لای شێخ مەحمودی نەمر وەك خزمێك حەزدەکات لای ئەو بێت، ئەویش پێی ئەفەرموێت:تۆ خزمی خۆمی بۆیە حەزناکەم لەگەڵما بیت چونکە ئەم شۆرشەی ئێمە دڵسۆز ئەیکات و دوای ئێمە نادڵسۆزەکان ئەیخۆن.

هەندێ لەخزمانی شێخ عومەر هەرچی دەبێت لەسەرخۆیانی تاپۆ ئەکەن و ئەم وخوشکی بێبەری دەکەن، بۆیە ئەچێتە لای خەزووری خاڵی لەگوندی ولیان پێی ئەڵێت: ئەمەوێت شکات لەوخزمانەم بکەم، ئەویش ئامۆژگاری دەکات کە ئەوکارەنەکات و بچێتە شار بۆکاروکاسپی و خوا هەقی بۆدەکاتەوە.

سالی ١٩٥٨ خالە شێخ عومەر دێتە سەدەکەی دەربەند و ئەبێتە پاسەوان، هەندێ کەسی ناوچەکە دێنە لای و دەڵێن شەو بەقەیاغ دێین ماتۆر ئەدزین،ڕێمان بدە ماتۆڕی ٣٠ دینارت ئەدەینێ کە مەبلەغێکی زۆری خەیاڵی بوو، ئەمیش قایل نابێت خیانەت بکات، کەسێك لەدزەکان پێی ئەڵێت: دەسا تۆ ئەوە عەقڵت بێت نابی بەهیچ وژنت بۆنایەو نابیت بەخاوەن خانوو!

سبحان الله حاجی خاڵە شێخ عومەر دواتر هاتە سولەیمانی وتائێستاش نەبوونی نەدیوەو خوا دەرووی خێری لێکردۆتەوە، کەچی جارێك ئەو دزە ئەبینێت کەئەو نوقلانەیەی بۆ لێدا کوڕەکەی دەستی گرتووە و سواڵی بۆدەکات بۆئەوەی بیبات بۆلای دکتۆر!!



## تەوفیقاتی خوا بۆ بانگخوازان:

دکتۆر فازل صالح السامرائی زانایەکی عێراقی بواری زمانی عەرەبیە، لە پاڵ کەعبەدا دوعا دەکات خوا یارمەتی بدات بۆخزمەتی قورئان، خوای گەورەش دوعاکەی قەبوڵ کرد.

کاتێك کتێبی معانی النحو ئەنوسێت و بەرنامەی بۆدائەنێت لەباسی (لا)ی نافیە للجنسدا ئەبێت لەخەویا کەسێك پرسیارێکی لێدەکات و ئەڵێت: جیاوازی نێوان (لارجل فی الدار) و(مامن رجل فی الدار) چیە کە ئەم بەخەیاڵیدا نەهاتووەو لەکتێبەکەیدا بۆی نەچووە، لەخەوەکەدا وەڵامی ئەداتەوە وئەویش ئەڵێت راستە وایە، کە خەبەری ئەبێتەوە پرسیارەکەی بیرئەمێنیّ و وەڵامەکەی بیرئەچێتەوە، چی کتێب و سەرچاوەی نەحو ئەبێت ئەگەڕێت باس نەکراوە، بەهەرحاڵ دووهەفتە زیاتر دیراسەئەکات و شەن وکەوی ئەکات تا ئەگاتە ئەنجام، ئنجا بیری ئەکەوێتەوە کەخۆشی لەخەوەکەدا هەرئەوەی وەڵام داوەتەوە.

ئەمەش جیاوازیەکیانە: ئەگەرکەسێك بپرسێت: هل من رجل فی الدار، لەوەڵاما ئەوترێت (لارجل فی الدار) کەئەمەش (لا)ی نافیەیە بۆجنس کەلەکاتی ئەو پرسیارەدا بۆوەڵام بەکاردێت، بەڵام (مامن رجل فی الدار ) رەددانەوەی قسەیەکە، کەسێك بڵێت (ان فی الدار رجلا) بۆ رەددی ئەوترێت (مامن رجل فی الدار).
نموونەی ئەوەش زۆرە لەقورئاندا: **(ذٰلِكَ الكِتابُ لارَيبَ فِيه)**، **(لاإكراهَ فی الدِّين)**، هەروەها: **﴿ لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلَاثَةٍ وَمَا مِنْ إِلَهٍ إِلَّا إِلَهٌ وَاحِدٌ وَإِنْ لَمْ يَنْتَهُوا عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ المائدة:٧٣.**

**﴿ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِيَ بِعَوْرَةٍ إِنْ يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا ﴾ الأحزاب:١٣.**

## زەینەب غەزالی وتەوفیقی خوا:

ئەم بانگخوازە ساڵی ١٩١٧ لەمیسر لەدایکبووە،باوکی لەخەویا ئەم مەلۆتکە ئەبێت بەدەستیەوەو لێی دەکەوێتە قورەوە وزۆر بۆی دەگەڕێت، لەوکاتەدا پیاوێك منالەکەی ئەداتەوە دەست و ئەڵێت: بیگرەئەوە سەیدە زەینەبە من باپیرەیم عومەری کوڕی خەتاب. ئیتر لەدوای ئەم خەوەوە باوکی هەمیشە بەسەیدە زەینەب بانگی ئەکردو بواری بۆ ئەڕەخسان کەببێتە پارێزەری ئیسلام وحەزی دەکرد ببێتە (پارێزەر).




ساڵی ١٩٣٧ چووە ریزی برایانەوە، ئەوەی تووشی برایان بوو ئەمیش بەزیادەوە تووشی بوو، ئارامگربوو تا دواپلەی ئارامگری، حەوت شەوو حەوت رۆژ سزایان داو نانیان نەدایە، لەخەویا خۆشەویستی بینی کەپێی فەرمو: ئەی زەینەب ئەی غەزالی ئێوە لەسەر رێبازی منن ئارام بگرن.

هەرجەلسەیەکی تەعزیب تەواو دەبوو کە شەمس بەدرانی خوانەناس ئامادەی ئەبوو لەکۆتاییدا ئەوەندەی بیتوانیایە بەوحاڵەی خۆیەوە تفی ئەکردە رووی شەمس بەدرانی جەللاد.

نەگبەتێکیان هێنا دەست درێژی بکاتە سەری ئەمیش بەرگری کردو کابرا
بوورایەوەو لەکۆڵی بووەوە، جارێکی تر یەکێکی تریان هێنا، ئەمیان ئامادەنەبوو
ئەو ناهەقیە بکات، بۆیە سزایان داو گونیان خەساند، لەسەردەمی ساداتدا ئەو
پیاوە داوای قەرەبووی کردەوەو برێك پارەیان دایە.

سالی ١٩٧١ کەلە بەندیخانە رزگاری بوو چوو بۆ سعودیەو حەجی کرد،
شافەیسەڵ داوای لێکرد لەو ولاتە بمێنێتەوەو مووچەی بۆببرێتەوە، ئەویش قایل
نەبوو مەیدانی دەعوەی میسر بەجێبهێڵێت و گەڕایەوە میسر.

سادات راوێژکارێکی یاسایی ناردە لای تا داوای قەرەبوو بکات وچەندی
ئەوێت بیدەنێ، ئەویش قایل نەبوو هیچ وەرگرێ وتی:هەموو دونیام بدەنێ
قەرەبووی قامچیەك ناکاتەوە کەلەبەرخوا لێیان داوم،من پاداشتی خۆم لەخوا
وەردەگرم.(هاوسەری کۆچکردووم زۆر سەرسام بوو بەم شێرەژنە هەرچەند
بۆخۆی لەدڵسۆزی و بۆخوا سوڵحاندا هیچی وای لەو کەمتر نەبوو، رەنگە ئێستا
لەعالەمی بەرزەخدا بەخزمەت ئەو بۆخواسوڵحاوانە گەیشتبێت و چاوی روون
بوو بێتەوە پێیان ومەجلیسیان گەرم بێت)..

## ئەی پارەی تەکسیەکە؟

کاك کامەران کەلەتەلەفیزیۆنی یەکگرتووی سولەیمانی کارمەندە وتی:
لەگرانیەکەدا زۆر پێویستم بەفەرشێك هەبوو، خوشکەکەم وتی: خەسووم
دەهەزاری سویسری لاداناوم و تەنانەت بەکوڕەکەشی نەوتووە کەبۆی هەڵگرم بۆ
کاتی کەفتەکاری و پێویستی، برۆ فەرشێکی لێبکڕەو کەبووت بۆی بهێنەوە،
خۆپارەکە هەردانراوە، منیش وتم: باشترە پرسێکی پێبکەیت، نەیکرد.

فەرشەکەم لەبازاڕ کڕی بە ١٢٥٠ دینارو هێنامەوەو دەهەزاریشم دا بەتەکسی.

بۆ بەیانی تەلەفونم بۆمامۆستایەك کرد لەوبارەیەوە،وتی: بۆئەوەی گوناهبارنەبیت هەقە خاوەن پارەکە ئاگاداربکرێت.منیش لەبەرخوا تا تووشی گوناه نەبم بڕیارم دا فەرشەکە ببەمەوە ئەو پەڕەکەی پەنجا دینارێکم لێ دائەشکێنێت.

بۆبەیانی برادەرێکم کە دوانزە هەزاری منی لابوو وەتووشی زەرەربووبوو، تەلەفونی کردو وتی: سەد دۆلارم بۆناردویت بەدیاری، ئێوە چەند بەتەمای ئەو پارەیە بوون منیش ئەوەندە.چووم سەد دۆلارەکەم گۆڕیەوە بە١٢٥٠ ولەبەرخۆمەوە وتم: ئەی خوایە بەقوربانت بم ئەی دەهەزاری تەکسیەکە؟پاشان پارەکەم بردەوە بۆخوشکەکەم.ئەمەش بوو بەوانەیەکی کرداری و تێگەیشتم ئەوەی واز لەشتێك بهێنێت لەبەرخوا،خوا بۆی قەرەبوو دەکاتەوەودەرگای خێری لێدەکاتەوە.

دکتۆر محمد راتب نابلسی لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا ئەڵێت: ﴿ وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا (٢) وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا (٣)﴾ الطلاق.

دوکاندارێك ئەناسم لەسوریا پێش بیست ساڵ ویستی خانوویەك بکڕێت کەبایی ٣٥٠٠٠ لیرە بوو، خاوەنەکەی سەفەری ئەکردو زۆر پەلەی بوو ئەیدا بە ٢٥٠٠٠ لیرە، ئەمیش تەنها ١٥٠٠٠ لیرەی هەبوو بۆیە ویستی لەرێی بانقەوە پارەکە تەواوبکات، بەڕێوەبەری بانقیش ئەیناسی پێی وت: برام تۆ پیاوێکی خواناسی ئەو پارەیەی وەری دەگریت سووی ئەچێتە سەر، لەبەرخوا وەری نەگرت، کە گەڕایەوە دوکانەکەی برادەرێکی چاوەڕێی دەکرد وتی: ئەوە لە

کوێت نیوسەعاتە چاوەڕێت ئەکەم؟وتی: بۆچی؟ وتی: ئەچم بۆ وڵاتانی کەنداو بۆ دووساڵ ئەم پارەیەم هەیە هێناومە بەئەمانەت لات بێت، ئیشوکاری خۆتی پێ مەیسەر بکە تادێمەوە.پارەکە سەد هەزار لیرەبوو، لەکاتێکدا ئەم پەکی لەدەهەزار لیرە کەوتبوو.

## شێخ وەحید عبدالسلام بالی:

ئەم بانگخوازە ساڵی ١٩٦٣ لەمیسر لەدایکبووە، شەش ساڵ لەمەوبەر لەگەڵ چەند زانایەکی تر چوونە مالاوی بۆ بانگەوازکردن، لەمالاوی و مۆزەنیق و کینیا نزیکەی شەش هەزارکەس لەسەردەستیانا موسڵمان بوون، دەزگای خێرخوازیان دامەزراندووە لەو وڵاتانەداو پرۆژەی خێرخوازیان هەیە وەك کەفالەتی منالی بێباوك و دروستکردنی قوتابخانەو لێدانی بیری ئاو.

ناوبراو ئەڵێت: دیاریمان ئامادەکرد وداوامان لە بەڕێوەبەری بەندیخانەیەك کرد ڕێمان بدات سەر بدەین، ئەویش ڕێی داین وپاش قسەبۆکردن ژمارەیەك بەندکراو موسڵمانبوون وچەند ئەفسەرو بەڕێوەبەرەکەش موسڵمانبوون و ئێمەش دیاریەکانمان بەسەر ئەوانەی موسڵمانبوون و ئەوانەش موسڵمان نەبوون دابەشمان کرد.

بەڕێوەبەرەکە سەرسام بوو بەوەی کە مەسیحیەکان لە جەژنی سەری ساڵیاندا هەرکەس بۆخۆی ئەخواو ئەخواتەوە، کەچی موسڵمانان قوربانی ئەکەن و دابەشی دەکەن.

مانەوەی ئەم بانگخوازە لەئەفەریقیا ئەگەڕێتەوە بۆخەوێك کە کاتێ چۆتە مالاوی بینویەتی: لەخەویا وەك لە مۆڵێك بێت و ئافرەتێکی بالا بەرزی جل سپی کەلەملاوئەولایەوە خزمەتکارێکی پیاوو ئافرەت هەبووەو تاجێکی شاهانەشی لەسەر

سەربووە.لەقادرمە دێتە خوارەوەو ئەمیش سەر ئەکەوێ کەئەگاتە ئاستی ئەو ئافرەتە دەست ئەخاتە سەر سەری ئەم و ئەڵێت ئەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ ئیسلام ئەوییش پێی دەڵێت دوام بکەوە ئەچنەوە سەرەوە دائەنیشن و باسی ئیسلامی بۆدەکات. تەفسیرەکەیان بەوە بۆکردکە خەڵکی لە ئەفەریقیا پێویستیان پێیەتی بۆ گەڕانەوە بۆ ئیسلام.




**خوا هادیە..**

هیدایەتی دڵەکان لای خوایە وبەدەستی خوایە: ﴿ **وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَنْ فِي الْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا أَفَأَنْتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ** (٩٩) **وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَنْ تُؤْمِنَ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ وَيَجْعَلُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ** (١٠٠)﴾ **یونس.** واتە: ئەگەر پەروەردگاری تۆ بیەوێ، خەڵکی سەرزەمین گشتی ئیمان دێنێ (بەڵام ئیمانی قەهری و زۆری، ئیختیار لە خەڵك دەستێنێ. خودا بەشەری ئازاد خوڵقاندووەو عەقڵی پێداوەو بە وەسیلەی پێغەمبەران یاساکانی پێراگەیاندووە، تا لە سۆنگەی ئاوەزی خۆی و ڕێنوێنیەکانی

ئاسمانی، بەختەوەری دنیا و ئاخیرەت بێ. ئەی پێغەمبەر) ئایا تۆ خەڵكی بە زۆری وادار بە ئیمانهێنان دەكەی؟ (ئیمانی بە ناچاری روالەتیە و كەڵكی نییە).

هیچ كەس ناتوانێ ئیمان بێنێ مەگەر (هەوڵی بۆ بداو) خودا ئیزن بدا. خودا عەزاب دەگەیەنێ بە كەسانێك (لە ئاوەز بەهرە وەرناگرن و بیرناكەنەوەو) نەزانن و تێناگەن.

خوای گەورە بوار بۆهەمووكەس دەرەخسێنێت بۆ ئەوەی ئیمان بهێنێت و بیانووی ناهێڵێت، ئەمە بێجگە لەوەی ئایەتەكانی خواو بەڵگەونیشانەكانی زۆرن لە بوونەوەرو نەفسی مرۆڤیشدا. قال اللهُ تعالَى: يا ابنَ آدمَ! قم إليَّ أمشي إليكَ، و امشِ إليَّ أُهَرْوِلُ إليكَ/ الراوي: رجل من الصحابة | المحدث: الألباني | المصدر: السلسلة الصحيحة الصفحة أو الرقم | ٢٢٨٧ :خلاصة حكم المحدث: إسناده صحيح رجاله ثقات.

## دورانی نزیک نزیکانی دوور:

لەچاوپێكەوتنێكدا مامۆستا قانیع خورشید باسی دورانی نزیك و نزیكانی دووری كردو وتی: سەعدی شیرازی تەفسیری (ونحن أقرب اليه من حبل الوريد) بۆ چەند قوتابیەكی دەركرد، لەگەرمەی باسەكەیدا هۆنراوەیەكی عیرفانی بۆدێت و دەیلێت، گەنجێك دیارە خزمەتی مزگەوتی كردووە بەویا تێئەپەڕێت و گوێی لە هۆنراوەكەی ئەم ئەبێت وكارلەدڵی دەكات و هاوارێك دەكاو دەكەوێت، بەوە قوتابیەكانی دائەچڵەكن و وریا ئەبنەوە، جا لەوێدا ئەو گەنجە دووری نزیكەو ئەمانەی دانیشتوون نزیكانی دوورن.

جا بەڕاستی ئەوە كێشەی بانگخوازانە جاری واهەیە ئەوانەی دوورن زیاتر لێی نزیكن و لە بەرهەمەكان و وتەكانی سوودمەند ئەبن.

## چالاكوانێكی جووله‌كه موسڵمان بوو

گالی فه‌حیما چالاكوانێكی جووله‌كه‌یه كه‌به‌ڕه‌گه‌ز مه‌غریبین، ساڵی ١٩٧٩ له شاری ئوم فه‌حم له‌دایكبووه، سه‌ر به‌حیزبی لیكۆد بووه، به‌هۆی دڕنده‌یی جووله‌كه‌وه له‌كاتی هێرشیدا بۆسه‌ر جه‌نین ساڵی ٢٠٠٢ بیروبۆچوونی گۆڕا،چه‌ند جار هه‌وڵی تیرۆركردنیان دا، پاشان گرتیان وبه‌تۆمه‌تی هاوسۆزی بۆ فه‌له‌ستینیه‌كان شه‌ش مانگ له‌ژووری تاكه‌كه‌سیدا به‌ندیان كرد، پاش سێ ساڵ به‌ندكردن ساڵی ٢٠٠٧ به‌ربوو به‌مه‌رجێك كه ئیسرائیل به‌جێنه‌هێڵێت، ساڵی ٢٠١٠موسڵمان بوو، شێخ رائید سه‌لاح سه‌رۆكی بزووتنه‌وه‌ی ئیسلامی ناو فه‌له‌ستین به نموونه‌ی به‌رزی خۆی ده‌زانێت وئه‌ڵێت: كه شێخ رائیدم بینی به‌بێ ئه‌وه‌ی قسه‌م له‌گه‌ڵ بكات له‌ناخه‌وه هه‌ژاندمی، وه‌ك ئه‌وه‌ی به سیمای جوان و ره‌وشتی به‌رزو ساده‌ییه‌كه‌ی بانگم بكات به‌ره‌و ئیسلام.

گالی ده‌ڵێت: ئیسلام گه‌وره‌ترین دیاری خوایه بۆ مرۆڤایه‌تی! (شایانی باسه ئه‌م رائید سه‌لاحه سه‌ربازانی ئیسرائیلی به‌تایبه‌ت ئه‌یانوویست له‌سه‌ركه‌شتیه‌كه‌ی توركیا كه‌هاتبوو به‌ره‌و غه‌زه بیكوژن خوا سه‌ری لێتێكدان و ته‌نها بریندار بوو،خوا هێشتیه‌وه بۆ به‌ره‌نگاربوونه‌وه‌ی جووله‌كه).

له‌م به‌سه‌رهاته‌وه به‌ئاشكرا تێده‌گه‌ین كه هیدایه‌ت و ئه‌جه‌ل لای خوایه و بوونه‌وه‌ر هه‌مووی به‌فه‌رمانی خوا هه‌ڵئه‌سوڕێت.

***





## خۆت بفرۆشە بەوخوایەی کە پاداشتت ئەداتەوەو ئەتبینێت:

هەموو رۆژێك خەڵکی رۆژیان لێئەبێتەوە خۆیان دەفرۆشن، (كلُّ النَّاسِ يغدو، فبائعٌ نفسَهُ فمُعتِقُها أو موبِقُها ) : صحیح.. هەیە خۆی ئەفرۆشیّ بەنرخێکی کەم، هەشە خۆی ئەفرۆشێت بەخواو بەهەشت بەدەست دەهێنێت، هەروەك شێخ حەسەنی بەصری ئەڵێت(نرخی تۆ بەهەشتە خۆت تالآن فرۆش مەکە).

بەلای منەوە یەکێ لەوانەی خۆیان تالآن فرۆش نەکرد (حاجی ئەحمەد بیس) ە لەمیسر کەئەندامی مەکتەبی ئیرشاد بوو:

ناوبراو ساڵی ١٩١٥ لەمیسر لەدایکبووەو لەخەودا بەباوکی دەوترێت فێری قورئانی بکات، ئەویش زۆرهەولی لەگەڵ ئەدات لە ١٠ ساڵیدا هەموو قورئان لەبەردەکات. ساڵی ١٩٣٩ ئەچێتە ریزی برایانەوەو نزیکەی ٢٥ ساڵ لە بەندیخانەدا ئەبێت وسزاو ئازارێك ئەچێژێت کەهی باسکردن نیە، ساڵی ١٩٩٢ ئەم دونیا فانیە بەجێدەهێڵێت، ساڵی شەست جار خەتمی قورئانی دەکرد.

ساڵی ١٩٨٧ بووە پەرلەمانتارو زۆرخزمەتی کرد.

ناوبراو دەڵێت: کە گیرام مودەڕیس بووم فەسڵیان کردم، کەژنەکەم جاروبار سەردانی ئەکردم منداڵەکانم پۆشتە بوون، ئەمووت بەچی ئەژین؟، ئەیووت خێری تۆ زۆرە،زەوی ئەفرۆشم وئەیخۆین، کەدوایی بەربووم زانیم کە زەویەکانی من کەلەباوکمەوە بۆم ماوەتەوە کەسوکارم پێیان عەیب بووە لەلادێ بیفرۆشن، بۆیە ئەوزەویانەی فرۆشتبوو کە خۆی بەمیراتی لەباوکیەوە بۆی مابۆوە، ئنجا هەرچی ئاڵتون و ناوماڵی هەبوو فرۆشتی لەبەرخواو تا دواپلەی ئارامی ئارامی گرت و ٢٥ ساڵ لەجێ ی باوکیش بوو بۆمناڵەکانم و هەموویانی پێگەیاند و بەچاکی پەروەردەی کردن، هەرگیز گیانفیدایی و خۆشەویستیەکەیم بیرناچێت، عادەتی خۆی وابوو هەرچی بچومایەتەوە ماڵەوە پاش سەلام کردن لەخۆشەویستیا دەستی ماچ ئەکردم..!! وەك دایك چۆن منالّی ئەلاوێنێت ئاوابوو بۆم، لەکۆتایی حەفتاکاندا کۆچی کردو لەمەیدانی جیهادا بەتەنها جێی هێشتم.

بەڕاستی من بەهیممەتی ئەم بانگخوازانە سەرسامم کەتادواهەناسە بەو هەموو نارەحەتیەی دێتە رێیان ساحەکە چۆڵ ناکەن، خوایە بە بانگخوازی بمانژێنەو لەسەر بانگخوازی بمانمرێنە.





## سەلاحەدین:

سەلاحەدینی ئەیوبی ١٢ ساڵ تێکۆشا تا موسڵمانانی یەکخست،هەمیشە ئەم توانای سەربازی و ژمارەی جەنگاوەرانی کەمتر بووە لەخاچپەرستان و بەتەوفیقی خوا سەردەکەوت، دایکی هەرزوو مژدەی درابوویە کەشمشێرێك لەشمشێرەکانی خوای دەبێت، هەرواش دەرچوو پاش خالید ئەم دووەم کەسە ئەو نازناوەی هەبێت.

لەجەنگی حەتین دا سوپاکەی ١٢هەزارکەس بوو رووبەڕووی ٦٣هەزار خاچپەرست بووەوەو سەرکەوت بەسەریاندا.

پاش ئەوەی ٨٨ساڵ قودس بەدەست خاچپەرستانەوە بوو بەفەزڵی خوا ئازادی کردەوە.لەهەڵمەتی سێیەمی خاچپەرستاندا کە ٤٥٠هەزارجەنگاوەر دەبوون، نەیانتوانی قودس لە سەلاحەدین بسەننەوەوناچارداوای ڕێکەوتنیان کرد. کەمرد قازی فازیلی هاوەڵی شمشێرەکەی لەگەڵدا ناشت، وتی: بۆئەوەی عەسای دەستی بێت بۆبەهەشت و شایەتی شانزە ساڵ جیهادی بۆبدات.

## دەربازبوون نیەوخۆت تەسلیمی خوابکە

﴿ يَقُولُ الْإِنْسَانُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ الْمَفَرُّ (١٠) كَلَّا لَا وَزَرَ (١١) إِلَى رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمُسْتَقَرُّ (١٢)﴾ القيامة.. ئەویَ ڕۆژیَ ئادەمی دەڵیَ: ڕێگای دەرباز بوون و هەڵاتن کوێیە؟!

نەخێر، هیچ پەنایەك نییە! (نە هەڵاتن و نە ڕێی هەڵاتن دەست دەدا، هیچ کەس ناتوانیَ پەنا بدا). قەرارگا (ی بەهەشت و جەهەنەم) ئەویَ ڕۆژیَ لە دەستی پەروەردگاری تۆ دایە.

ئنجاسەیرکەن خۆشەویستمان چۆن لەم فەرموودەدا جەخت ئەکاتەوە سەر ئەم راستیانەی قورئان و بەڕاستی خۆی تەسلیمی ئەو خوایە دەکات کە ئەمانبینێت و ئاگای لێمانە(اللهمَّ أسْلَمْتُ نَفسي إليكَ، و وجَّهْتُ وجْهِي إليكَ، و فَوَّضْتُ أمْرِي إليكَ، و ألْجَأْتُ ظَهْرِي إليكَ، رَغْبَةً و رَهْبَةً إليكَ، لا مَنْجَا و لا مَلْجَأَ منْكَ إلَّا إليكَ، آمَنْتُ بِكتابِكَ الذي انْزَلْتَ، و بِنبيِّكَ الذي أرْسَلْتَ –صحيح الالباني)..

## پێشەوا تەبەری

ناوبراو لە تەبەرستان لەدایکبووەوباوکی گرنگیەکی زۆری پێەدا وکارئاسانی بۆدەکات بۆ فێربوونی زانست، ئەویش بەهۆی ئەوەی تەبەری تەمەنی چوار ساڵێك ئەبوو باوکی لەخەویا بینی کەتەبەری لەخزمەت سەروەردا جانتایەك بەردی لەبەردەستایەو بەرد ئەهاوێژێت و بەرگری لەخۆشەویست ئەکات.

تەبەری لەحەوت ساڵیدا قورئانی هەموو لەبەرکرد، لەهەشت ساڵیدا تەراویحی بە خەڵك ئەکردو لەنۆ ساڵیدا فەرموودەی وەرئەگرت و لە دوانزە ساڵیدا کەوتە گەشتی زانستی و بەوڵاتاندا ئەگەڕا، هاتە بەغداد ئیمام ئەحمەد ببینێت بەداخەوە هەواڵیان دایە کە کۆچی دوایی کردووە.

تەبەری لەپێناوی زانستدا هاوسەرگیری نەکردووەوهەمیشە پۆشتەوپەرداخ بووەو هەشتاوشەش ساڵ ژیا نەسرەوت و ئەوەی کەنووسیویەتی ئەگەر دابەش بکرێت بەسەرتەمەنیدا رۆژی هەژدە لاپەڕەی بەردەکەوێت.

ناوبراو زۆردەنگی خۆش بووە لەقورئان خوێندنداو تەفسیرەکەی قوتابخانەیەکی تەفسیرە. مێژووەکەشی کارێکی مەزنە بەڵام دیارە مەعصوم نیە بۆیە زانایان هەستاون بەتەحقیق کردنی بەوەش ئەوەندەی تر بەهای نووسینەکانی بەرزبوونەوە.

(جا ئەو خەوبینیەنەی باوکی بەڵگەی زانستی بێپایانی خوایە کە عالمی غەیب و شەهادەیەو ئەوەی پیشانی باوکی تەبەری داوە تا گرنگی زیاتری پێبدات ).




## دۆستانی خوا:

### بەشی یەکەم:

دوان لەدۆستانی خوا لەخزمەتیانا بووم، بەرێزێکیان وتی: شەوێك بیرم ئەکردەوە لە کاك ئەحمەدی موفتی زادەی رەحمەتی، کە نۆساڵ ونیو بەندکراو شەش ساڵی لەتاکەکەسیدابوو، دڵنیابووم هەرچی ئازارو ئەشکەنجەی کۆن و نوێ هەیە لەسەری تاقیان کردۆتەوە، لەدڵی خۆمدا وتم: ئاخۆ لەتابووتەکەشدا دایان نابێ و ئۆکسجینی لێبڕابێ و بووڕابێتەوە، شەو لەخەوما تابووتێکیان هێناو منیان خستە ناوی و ئۆکسجینم لێبڕاو بوورامەوە، دەریان هێنام و هاتمەوە هۆش خۆم و وتیان کاك ئەحمەدیش ئاوا سزا دراوە. (ئەمەش بەڵگەیە کەخوا ئاگای لەدڵی ئەو مامۆستایە بووە بۆیە ئەو خەوەی پیشانداوە )

کاك ئەحمەد یەکێ بوولە سەرقافڵەکانی کاروانی باوەڕ وەکو بانگخوازانی سەرتاسەری دونیای کۆن و نوێ تووشی ئەشکەنجەو ئازاربوو، خۆشەویست درودی خوای لەسەر سەرمەشقی بوو کەبەقەدەر هەموو ئوممەت تاڵاوی چەشت

وپەت پەتی بینی لە ٢٣ ساڵدا، لەسەرەمەرگیدا فاتیمە وتی: وا کرباە، ئای لەو دەردەسەری و ناخۆشی ونارەحەتیە،خۆشەویست هاتەوە هۆش خۆی و فەرمووی: ئیتر باوکت رزگاری ئەبێت لەدەست دونیاودەردەسەری و ناخۆشی و نارەحەتی نابینێت.

تۆ بیربکەرەوە سەرکردەو پێشەوامان کەخوا بە رەئوف ورەحیم وەسفی ئەکات سێ ساڵ خۆی و هاوەڵ وخزمانی ئابلۆقەدرابن لە شیوێکداو نان نەبێت بیخۆن و لەبرسا گەڵا بخۆن وشەو مناڵ لەبرسا بگری و دایکی شیری نەبێت بیداتێ.

تۆ رابمێنە لە سیرەتی کەچۆن سەدان جار بریندار بوو بەبریندار بوون و شەهیدبوونی خزم وخوێش و یارانی، ئەمەندە ناسۆری چەشت وئەوەندە خەمی خوارد خەریك بوو تیابچێت ﴿ **فَلَعَلَّكَ بَاخِعٌ نَفْسَكَ عَلَى آثَارِهِمْ إِنْ لَمْ يُؤْمِنُوا بِهَٰذَا الْحَدِيثِ أَسَفًا** ﴾ **الكهف**:٦.



## دۆستانی خوا -بەشی دووەم

یەکێکی تر لەو دۆستانەی خوا کە لەخزمەتیا بووم وتی: ساڵی ٢٠١٣ چوومەوە سەید سادق شەوێك زۆر دوعام کرد:خوایە حەزدەکەم یەکێك لەخۆشەویستانت بناسم. خواش کە ئاگای لەناخ ودڵ ودەروون وخەتەرەی دڵمانە دڵی نەشکاندم و شەو لەخەوما کەسێکیان پیشاندام کەناوی (م...) ەو ژمارەی تەلەفونەکەشیان دامێ کە ئەوە خۆشەویستێکی خوایە.

بۆبەیانی تەلەفونەکەیم لای خۆم نووسی،بەڵام حەزم نەکرد پەیوەندی پێوەبکەم و دڵنیا بووم خوا رێم لێی دەخات. ئوتومبیلەکەم کێشەیەکی هەبوو بەیانی زوو بردمە بەردوکانی فیتەرێکی ناسیاو، لەوبەریەوە چاخانەیەك هەبوو چووم تا چایەك بخۆمەوە و چاوەڕێ بکەم تاوەستاکە دێت وکارەکەم بۆبکات، کەچوومە ژوورەوە دووکەس نان وماستیان ئەخوارد، یەکێکیان کەمنی بینی سڵەمیەوەو تەکانێکی دا هەستم کرد وەك بینیبێتم، وتم: بەخوا ئەوە رەنگە دۆستەکەی خوابێت کەلەخەودا پیشانیان دام، چۆن تەئکیدکەم لەناوەکەی؟ گوێم لێبوو بەوەی تەنیشتی وت: جگەرە مەخۆ خراپە، ئەویش وتی: کاك (م..) بەخوا دەمێکە وازم هێناوە، دڵنیابووم ئەوە خۆیەتی، دواتر کەهەستان کاك (م..) پارەی چاکەی بۆدام ورۆیشت..

دوایی زانیم لەوناوە دوکانی پارچەی سەیارەی هەیە وهەندێ شتی تر لەنێوانماندا گوزەرا کەحەزناکەم باسی بکەم..

جامنیش بەندەی موفلیسی موخلیص زۆردڵخۆشم جاروبار بەفەزڵی خوا رێم لەو دۆستانەی خوا دەکەوێت کەسەعاتێك لەخزمەتیانا بەهێندەی سەدکتێب سوود وەردەگرم کەتۆزێکی بۆئێوەش ئەگێڕمەوە بەڵکو سوودمەندبن..

## دەمودەست:

کاك ئەحمەد کە خەڵکی تەقتەقەبەخزمەتی گەیشتم لەخەستەخانەی هیوا وتی:لەم ساڵانەیدواییدا تازە تەکسی کوردستان هاتبوو، منیش تەکسیەکەم بە ١٨٠ وەرەقە کڕیبوو ئیشم پێدەکرد، ڕۆژێکی سەرما کەسێکم بینی بەدوو دارشەقەوە ئەچوو بەرەو بەڕێوەبەرایەتی هاتوچۆی هەولێر بۆی گەڕامەوەو سوارم کردو گەیاندم لەبەرئەوەی کەمئەندام بوو پاسەوانەکان کارئاسانیان بۆکردم بردمە ناوەوەوپارەم لێوەرنەگرت، هەرئەو دابەزی دەمودەست کەسێك وتی: ببمە بۆ فلأن شوێن و بمهێنەوە دەهەزارت ئەدەمێ! یەکسەرزانیم خوا هەقی ئەو چاکەیەی بۆکردمەوە.

بەڕاستی لەم خێرخوازانەمان زۆرن دوێنێ من بەتەکسی چووم بۆهیوا، هەرچەندم کرد پارەی وەرنەگرت، وتی: هەرنەفەرێك بێت بۆخەستەخانەی هیوا پارەی لێوەرناگرم، خۆبۆمن ئاسایی بوو وەریبگرێت، بەڵام خەڵکێکی داماوی زۆرهەن کە ئەوپارەیەی تەکسیە زۆرە بۆیان، دیارە هەرچی بۆخوا بکەین ئاگادارەو بەزایە ناچێت.

## چیرۆکێکی واقعی...

خوێندکاری کۆلیژی شریعەی بەغدا بووم...لەپاسێکی کۆستەردا ئەگەڕامەوە بۆ بەغدا..سەرەتاکانی ساڵی ١٩٩٠بوو. لەتەنیشت شۆفێرەکەوە دانیشتبووم وپێکەوە باسی مانای ئایەتی (**عسى ان تكرهوا شيئا وهو خير لكم**)مان ئەکرد... شۆفێرەکە چیرۆکێکی زۆر سەیری گێڕایەوەومنیش جوان گوێم بۆ شل کرد..چونکە زۆر تامەزرۆ بووم...چونکەتەفسیرێکی عەمەلی بوو وتی: ١٠/١٠/١٩٨٩بوو.. نەفەرەکانی سلێمانیم گەیاندە بەغدا ولە گەراجی نەهزە دامبەزاندن..و لە قەراغ جادەکە پاسەکەم وەستاند ویستم شتێ بخۆم..دواتر

کەهاتمەدەرەوە دەبینم وەسڵێکی غەرامەیان کردوە بەفلچەی سەیارەکەما...زۆرتوڕە بووم زۆر نارەحەتبووم.وزۆر قسەم بە مروور ووت..ئەوەی زیاتر تووڕەی کردم خەڵکەکەبوو کەئەیان ووت:بابە ناشکوری مەکە خێری پێوەیە..وتم:کەس خێری لە غەرامە بینیوە؟..

وەسڵەکەم خستەگیرفانی کراسەکەم وبەتوندی قاپی سەیارەکەم داخست ولێمخوڕی...دوای چەندڕۆژێ بۆسەردانێك چوم بۆ رومادی... لەبەر ئیزدحامی ڕێگاکە بەگەڕەکەکاندا ڕۆشتم... لەکۆڵانێکدا چەن پیاوێ هاتنە سەر ڕێگەم کە دزداشەیان لەبەردابوو وپەپەلە وەستاندمیان ویەکێکیان وتی تەواوە خۆیەتی بیگرن!! هەرنەیان هیشت دەم بکەمەوە گرتمیان.. ویەکێکیان هەواڵی دابەپۆلیس... دواتر بەکەلەپچەکراوی بردمیان بۆ سجنی گەورەی رومادی و پاسەکەشمیان برد بۆحیجز...

چەن ڕۆژێ هەرلێیان نەپرسیمەوە.. و منیش زۆر ئەترسام چونکە خزم و کەسم پێشمەرگەبوون.. وبەعسیش بەو دڕندەییەی.بەڵام دواتر پێیانوتم کەتۆ چەن ڕۆژێ بەرلەئێستا لەرومادی بەم پاسەت داوتە لە منداڵێك دواتر هەڵاتوویت... هەناسەیەکی خۆشیم هەڵکێشا کە بۆم دەرکەوت لەسەر سیاسەت نەگیراوم... هەرچەندە ویستم بێتاوانی خۆمیان بۆ باس بکەم..گوێیان لێنەگرتم.. هەرئەوەندە وتیان لاتحچی زائد.. سبەینێ داگایی ئەکرێیت... دەساڵ زینداتیش ئەکرێیت... ئەوشەوە خەوم لێ نەکەوت.. هەرخەیاڵم لای دەساڵ زیندانی بوو..چونکە شایەتیان هەبوو لەسەرم وەمنیش بەڵگەم پێنەبوو...

بەڵێ دادگایی کرام.. زۆر گریام وپاڕامەوە لێیان کەمن لەژیانمدا چۆلەکەیەکیشم نەکردوە بەژێرەوە... ئەوەبوو تەواو بێ هیوابووم...خەریکبو دادگاییەکە هەڵگرن... حاکم وتی کوڕم دواقسەت چیە؟؟ وتم..گەورەم باشە من

کەی داومە لەو منالّە؟بەیانی بوو؟ ئێوارەبوو؟چەن شەممە بوو؟ چەنی مانگ بوو؟..
حاکم وتی.. ئەووەرەقەیەی بدەنیّ باسەیری کات...منیش بەدەم فرمێسکەوە دەسم کرد بەخوێندنەوەی..و سەیرێکی بەرواری ئەو ڕۆژەم کرد... وتم: اللـه اکبر....حاکم وتی..چیە وا اللـه اکبەرت کرد؟؟

وتم: گەورەم من ئەو ئێوارەیە لە بەغدا بووم و لە ڕومادی نەبوووم... کەس وکاری منداڵە کوژراوەکە هاواریان کرد..چزاب... وەڵاهی کلشی چزب سیدی..حاکم بێدەنگی کردن و بەمنیشی وت.. چۆن ئەیسەلمێنی ئەوئێوارەیە لەبەغدابوویت؟؟منیش وەسڵی غەرامەکەم بیرکەوتەوە...وەسڵی سەرپێچییەکەم لەگیرفانی کراسەکمدابوو..دەرم هێنا بەدەم گریانەوە وتم بەحاکم فەرموو من لە دەی دەی نۆسەدو هەشتاونۆ لە بەغدا غەرامەکراووم، حاکم کەسەیری وەرەقەکەی کرد هەرلەوێدا بێتاوانی ڕاگەیانم.. عەرەبەکانیش ماچیان کردم وداوای لێبووردنیان لێکردم و وتیان:واللـه کۆستەرێك ڕەقەم سلێمانی بوو،بەدەم گێڕانەوەی ئەم بەسەر هاتە دڵتەزێنەوە گەشتینە ناو شاری بەغداو خواحافیزیمان لەیەکتر کرد....وتم..بەڕاستی ئێستالەتەفسیری ئەوئایەتە گەیشتم...ئەکاونتی نزار فایەق.

## دوعاکەی بۆ ئیبن عەباس:

خۆشەویستمان درورودی خوای لەسەر باوەشی کرد بە ئیبن عەباسی ئامۆزایداو دوعای بۆکرد کە شارەزابێت لەقورئاندا،خوای گەورەش کە (سميع الدعاء) ە گیرای کردو ئەمەش هاتەدی و ئیبن عەباس بووە زانایەکی گەورەی ئوممەت و بە(حبر الأمة) ناوبانگی دەرکرد..

## زانایانی ئەم ئوممەتە:

منالێك بەهەتیوی لەمۆریتانیاخالۆوانی گەورەی ئەکەن بەناوی محمدئەمین شەنقیتی، کەسالّی ١٩٠٥ لەدایکبووە،رێی زانست ئەگرێتەبەر تا ئەبێتە قازی لەمۆریتانیا.. تاسالّی ١٩٧٤ کەدوای جێبەجێکردنی فەریزەی حەج کۆچی دوایی دەکات لەمەککە لەخزمەت پەیامەکەی خوادابووە،شەنقیتیەکان زۆر زیرەك و بلیمەتن، زانای گەورەیان تیاهەلّکەوتووەو خزمەتی گەورەیان بەئیسلام کردووە.دێتەسعودیە بۆحەج لەسالّی ١٣٦٧ی کۆچیداو ئەمێنێتەوەو ناوبانگی بلاّو ئەبێتەوە، پاشان لەزانکۆی ئیسلامی ئەبێتە وانەبێژو ئەبێتە ئەندامی هەیئەی کیباری عولەماو ئەندامی مەجلیسی تەئسیسی رابیتەی عالەمی ئیسلامی، قوتابی زۆر پێدەگەیەنێت وەك ئیبن بازی رەحمەتی.. لەکتێبەکانیشی: ( أضواء البيان في ايضاح القرآن بالقرآن).

لەگەلّ ئەوەدا کەجاری واهەبوو قورگی ئازاری هەبوو گوێی نەئەدایە وگەرم ئەبوو ئازاری بیرئەچۆوە.

شێخ محمد ئیبراهیم لەبارەیەوە ئەلّێت: لەتەوقی سەریەوە تا پەنجەی پێی پڕە لەزانست.

ئیبن باز ئەڵێت:کێ گوێ لەتەفسیرکردنی بگرێت سەرسام ئەبێت لەفراوانی زانستەکەی وشارەزایی و فەصاحەت و بەلاغەتەکەی و بێزارنابێت لە گوێگرتن لەقسەکانی..

ئەلبانی ئەڵێت: لەوەدا کەزۆر زانستی کۆکردبۆوە وێنەیم نەبینیوە..

بەکر بن زەید ئەڵێت: ئەگەر یەکێك هەبێت لەم زەمانەدا نازناوی شەیخی ئیسلامی بدرێتێ ئەوە ئەوە شایانی ئەو نازناوەیە..ئەو گوێی بەدونیا نەئەدا..

بەڕاستی ئەم پەیامە جیهانیەو خواخۆی بانگخوازانی بۆ دێنێ لەچوارقوڕنەی دونیاوەوتەوفیقیان ئەدات که بێن و خزمەتی بکەن وئەم زانستە دەست بەدەست بگەیەنن..خوا زانایەو وەعدی داوە قورئانەکەی بپارێزێت و ئەم بانگەوازە تاقیامەت بمێنێت..



## بەرەکەتی دوعا:

زانای گەورە محمد ئەمین شەنقیتی ئەڵێت: لاوێك ئەناسم کەتا بیست ساڵێك رۆژانە کاری دەکردوئێوارە چی دەست ئەکەوت ئەیخستە بەردەمی باوکی تا چەندی ئەوێت لێی هەڵبگرێت،وتیان بۆ پارەکە نادەیتە دەستی؟ وتی: شەرم ئەکەم دەستی من لەسەرەوە بێت و دەستی باوکم لەخوارەوەو دەست بگرێتەوە بۆمن.. باوکیشی هەمیشە دوعای بۆدەکرد کە خوایەقورئان بدە بەکوڕەکەم و بیکە بەئەهلی قورئان.. بەبەرەکەتی دوعاکەی باوکی رێی لە موفتی ولاتەکەیان کەوت و هانی

دا لەسەرخوێندن تا گەیشتە ئەوەی دکتۆرا وەربگرێت لەتەفسیردا، ئەو رۆژەی نامەی دکتۆراکەی موناقەشە کراو قەبوڵ کرا بەپلەی بەرز گریا، وتیان بۆدەگریت؟ وتی: بۆدوعاکەی باوکم ئەگریم کەئەوەتا پاش بیست ساڵ هاتە دی..لا ٣٠٥ سهره عائلیه (الدکتور حسان شمسی پاشا)..

## دکتۆر خالید

دکتۆری نەشتەرگەری دڵی سعودی خالید جوبەیر ئەڵێت لەکاتی ئازادکردنی کوەیتا وەك پزیشکێکی ئەفسەر بەشداربووم، برادەرێکی ئەفسەرم پەیوەندی پێوەکردم و وتی: لەبەرەکانی پێشەوە ئەفسەرێکمان لایە بڕوای بەهیچ نەماوە، نازانین چی لەگەڵ بکەین، وتم: بۆم بنێرن، کەهات بۆلام ئەمە زووتر دینداربووە بەهۆی خوێندنەوەی عیلمی کەلام و هەندێ شتی ترەوە لێی شێوابوو، کەوتمە قسە بۆی و وتم: خوا وائەفەرموێت، پێغەمبەر وائەفەرموێت، وتی باسی ئەوانەم بۆمەکە، منیش وتم: باشە پەیمانم بدەرێ من شتێکت بۆئەکەم کە بەگوێم بکەیت ودەدەمێم لەگەڵ نەکەیت، وتی: ئاخر بابزانم چیم بۆدەکەی..

وتم: هەقت نەبێت، پەیمانم بدەرێ و هیچی تر، بەزۆر پەیمانم لێوەرگرت و کەوتمە خوێندنی روقیەی شەرعی بەسەریاو فووم کرد بەتۆزێك ئاوداو وتم:لەبەرچاوم بیخۆرەوە، دوای دووسێ رۆژ هاتەوەو یەك کارتۆن ئاوی هێناو وتی: قورئان بەسەرئەوەشدا بخوێنە بۆم، قورئانم بەسەردا خوێندو بردی لەگەڵ خۆیا بۆ بەرەکانی پێشەوەی جەنگ، دوای دەساڵ وتارم ئەدا لەشوێنێك هات بۆلام ودەعوەتی کردم وباسی باش بوونی خۆی بۆکردم بەبەرەکەتی قورئان، جا بەڕاستی هەموو پێویستە وەك خۆشەویست زۆر دوعا بکەین و بڵێین: اللهم

يامقلب القلوب ثبت قلبي على الايمان، چونكه بەڕاستی پێویستمان بەوەیە خوا بەفەزڵ وكەرەمی خۆی بمانپارێزێت لەلادان.

منی بەندەی موفلیسی خواش كەسێك ئەناسم حافزی قورئان بوو لێی شێواوەو وەك شارەزا لەبواری ئیسلامدا ئەیهێننە سەر شاشەو هاوسەرەكەی حیجابی لابردووەو بۆتە فیتنە بۆخۆی و دەوروبەری..یەكێكی تریش ئەناسم تووشی ڤایرۆسی قورئانیەكان بووەو دینداریەكەی لەگیانەلادایە،پەنا ئەگرم بەخوا..جا ئەبێ بزانین كەخوا ئاگاداری دڵ ونیەتەو بەردەوام بەندەكانی تاقیدەكاتەوە تا لەواقیعدا دەربكەوێت كێ ڕاست ئەكات لەدینداریدا.



## وانەی كرداری لەدەعوەدا:

بانگخوازی میسری وەحید عبدالسلام بالی ئەڵێت:لەئەفەریقیا دەعوەمان ئەكرد قەشەیەك بەرامبەرمان وەستایەوەو ئەیویست بۆمان بسەلمێنێت كە ئیسلام دینێكی ناتەواوەو لەحەماسەتی خۆیا قەڵەمەكەی لەگیرفانی كەوتە خوارەوە برادەرێكیش

قەڵەمەی بۆهەڵگرتەوەو خستیەوە گیرفانی، تۆزێ قسەی تری کردو وەستا،وتی: چۆن سپی پێستێك خزمەتی من بکاو قەڵەمم بۆهەڵگرێتەوە، ئەو دینەی ئێوەی پەروەردەکردووەو فێری تەوازوع و خزمەتی کردوون دیارە دینی هەقەو شایەتمانی هێناو موسڵمان بوو. هەڵگرتنەوەی ئەو قەڵەمە وانەی کرداری بوو کە رێگاکەی بۆکورت کردینەوە. جا بەڕاستی مەقامی دەعوە مەقامی پێغەمبەرانەو زۆر بەرزە وخواش ئەمانبینێ و تەوفیقمان لای ئەوە، بۆیە ئەبێت هەوڵی خۆمان بدەین و هەمووکەسیش بەشی خۆی خێری تیایە.

## دکتۆر صلاح هارون:

ساڵی ١٩٧١ لەمیسر لەدایکبووە، دکتۆری دەروونیەودەڵێت:کاتێك کە نەخۆشەکانم تەلەفونیان بۆدەکردم ودەیانووت بەقسەکانت دڵئارامیمان بۆهات، هەڵوێستەیەکم کرد و وتم:باشە ئەوانە قسەیان لەگەڵ منداکردووە وئاوا ئارامیان بۆهاتووە، ئەی ئەگەر قسەلەگەڵ خوا بکەن؟

دوای ئەوەی زانکۆم بەپلەی بەرز تەواوکرد هەموو ئاواتێکم ئەوەبوو کە ببمەوە موعید لەزانکۆ، پێنج ساڵی رەبەق داوام پێشکەشی زانکۆکانی میسرکرد سوودی نەبور، دوا زانکۆ کە تەقدیمم کرد وبەتەمای بووم، تەلەفونێکیان بۆکردم و وتیان: بەداخەوە وەرنەگیرایت، بەیەکجاری دونیا لەبەرچاوم رەش بوو، زۆر ناخۆشە هەواڵی وابیبستی پاش پێنج ساڵ هەوڵ و چاوەڕوانی، زۆرگلەییم لەبەختی خۆم کرد، دوایی بەخۆمم وت: بەخشین و نەبەخشینی خوا هەردوکیان هەربەخشینە لەراستیدا چونکە تاقیمان ئەکاتەوەو پاداشت وەردەگرین، کە رۆیشتمەوە ماڵەوە کەوتمە نوێژکردن و لەفاتیحەدا زۆر لەسەر ( تەنها تۆ ئەپەرستین و تەنها پەنا بەتۆدەگرین)، راوەستام، زۆرگریام، پاشان خەوتم،

لەخەومدا کەسێك وتی: هەستە چۆن ئەخەویت و پێغەمبەر درووودی خوای لەسەر هاتووە بۆمالّتان، هەرناوی موبارەکیم بیست هەستام وبەخێرایی چوومە خوارەوە بینیم پشتی لێمە، بەدەنگی نزم بەوکەسەم وت:بۆچی خۆشەویست پشتی لێمە، وتی: ئەی تۆ دوێنێ ئەوەو ئەوەت نەووت؟

وتم: ئاخر زوو پەشیمان بوومەوەو نوێژم کردوزۆریش گریام.وتی: تۆ خەمی دامەزراندن دەخۆێت؟دەئەوەتە پێغەمبەری خوا مژدەی دامەزراندنی بۆهێناوی.. لەخۆشیا خەبەرم بۆوە، بۆ بەیانی سوپاس بۆ خوا تەعین بووم...شایانی باسە چەند سالّێك لەزانکۆی ئەسیوت و چەندسالّێك لە زانکۆی شاعبدالعزیز لەسعودیە مامۆستا بووەو ئێستاش لەزانکۆی پۆرسەعید لە بەشی عیلمی نەفس مامۆستایە.

(جامنی بەندەی هەژاری دەرگانەکەی خوا بۆیە ئەم باسانەتان بۆدەهێنم تابزانن دونیا بێ ساحێب نیەو خوا ئەمانبینێ و تاقیمان ئەکاتەوە بەخۆشی و ناخۆشی ﴿وَنَبْلُوكُمْ بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ﴾ الانبیاء:٣٥..وێنەی د.صلاح



### نوری بەصیرەت:

بانگخواز مەحمود مصری ئەلّێت: برادەرێکم ئەیویست بچێت بۆکوەیت بۆئیش،پاش خوا حافیزی لەکەس وکاری رۆژی هەینی ئەچێت بۆ مزگەوتەکەی شێخ عبدالحمید کشك کە بەرنەدەکەوت،زۆر چاوەڕێی کرد تانوێژخوێنان هەموو رۆیشتن،چووە لای شێخ و دەستی ماچ کرد وباوەشی

پیاکردو وتی: ئەچم بۆ کوەیت بۆکارکردن دوعای خێرم بۆبکە،ئەویش دوعای بۆکرد.

دوای دووسالّ کەهاتەوە پاش سەردانی کەس وکاری چوو بۆنوێژی هەینی لای شێخ و پاش تەواوبوون و ڕۆیشتنی نوێژخوێنان چووە لای شێخ و دەستی ماچ کردو بێ ئەوەی ئەم قسە بکات شێخ فەرمووی: برام دووساڵە دیارنیت، برادەرەکەم فرمێسك لەچاوی هات و وتی: یاشێخ چۆن ئەزانی، ئەویش وتی: خوای گەورە بەفەزڵی خۆی بەصیرەتێکی داومەتێ دۆست وخۆشەویستی خۆم لەیادناکەم.

جارێکی تر کەسێك دەمرێت دەیهێنن بۆمزگەوتەکەی شێخ و لەدوای دواوە دای ئەنێن تەنانەت ئەوانەی دواوەش جەنازەکە نابینن و شێخیش وتارئەدات و باسی ستەمی دەسەلآت ئەکات، بەبێ ئەوەی بیانبینێ چونکە نابینا بوو، بەبێ ئەوەی کەس پێی بلێت، لەگەرمەی وتارەکەدا ئاماژەی بۆ تابووتی مردووەکە کردو وتی: تۆ کەئێستا بەرەو لای خوا چوویت هەواڵی ئەو ستەمەی بدەرێ کەلە ئێمە ئەکرێت، هەمووان سەرسام بوون بەو بەصیرەتەی کەخوا داویەتی بەشێخ، فیردەوسی ئەعلا مەسکەن و مەئوای بێت بەڕاستی شۆڕەسواری وتارو مینبەری ڕەسولوالله بوو..

جا بەڕاستی خوای گەورە کەزاناو ئاگادارەو ئەبینێ و ئەبیستێت ئەگەر ویستی ئاوا بەسیرەت ئەدا بەنابینایەك..

## قوتابیەکی شێخ کوشک بەناوی شێخ ئەحمەد نەشئەت دەڵێت:

دوو مانگ پێش ئەوەی بمرێت عبدالمنعم ی کوڕی وەسیەتەکەی بۆ نووسی، پێش هەفتەیەك لە مردنیشی وەسیەتەکەی وچی ئەمانات لابوو دای بە عبدالسلامی

کوڕی.. دواهەمین شەوی ژیانی وەسیەتی کردەوە بۆ عبدالسلامی کوڕی و پێی وت: خۆشەویست (د.خ) لەتەمەنی چەندا کۆچی دوایی کرد؟؟

ئەویش وتی: شەست و سێ ساڵ. شێخ وتی: ئەمشەو منیش شەست و سێ ساڵم تەواو کرد.

ئەو بەیانیە کە هەینی بوو بەخێزانی وت: ئەمشەو لەخەوما پێغەمبەرم بینی(د.خ) حەزرەتی عومەری لەگەڵ بوو، فەرمووی سەلام لەعومەربکە، کەویستم سەلامی لێبکەم مردم و خۆشەویست درووددی خوای لەسەر شتمی! ژنەکەی وتی: خۆشەویست درووددی خوای لەسەر نافەرموێت:خەوی ناخۆش مەگێڕنەوە؟

شێخ وتی: جائەوە کەی ناخۆشە من ئەوە ئاواتمە.دوای ئەوە بەپەلە خۆی شت ولەڕکاتی دووەمی سوونەتەکەی کە کردی لە سوجدەدا گیانی سپارد ئەو دوعایەی هاتە دی کە بەئیمامی بژی و بەئیمامی بمرێت و لە سوجدەدا گیانی دەرچێت.

شێخ ئەحمەد ئەڵێت: موفتی سعودیە لە تەعزیەکەیدا پێی وتم: چوارڕۆژ پێش مردنی تەلەفونم بۆکردو وتم: ئەمەوێ بتبینم، وتی:باشە ئەگەر مام!

پاش سیانزە ساڵ کە برای کوشك مرد و ویستیان بینێژن و سەری قەبرەکەی کوشکیان هەڵدایەوە بینیان تەرمەکەی شێخ کوشك وەك خۆیەتی و بۆنی میسکی لێدێت!





## شێخ عبدالحمیدو بورجی بیزا

ئەم بورجە لە ئیتالیا سالی ١١٧٣ی زایینی دەستکرا بەبینا کردنی تا زەنگی کەنیسەکەی تەنیشتی پیاهەڵواسن، ئەم بورجە ٥٦مەتر بەرزە وهەشت قاتە و١٤٥٠٠ تەن قورسە، کەبە پێنج سالّ تاقاتی سێیەم دروستکرا لەبەرئەوەی گلّی ئەساسەکەی باش نەبوو لاربوونەوەی تیادروست بوو سەد سالّ لێی وەستان بۆیان چارنەکرا دواتر لە ٩٩ سالّدا پێنج قاتەکەی تری تەواوکرا، سالّی ١٩٩٠ رێگیری کرا لەگەشتیاران بچنە ناوی لەترسی کەوتنی، پاشان سالّی ٢٠٠١ کردیانەوە بەڕووی گەشتیاراندا. ٢٩٤ قادرمەی هەیەو تازە مەصعەدی کارەبایی بۆدانراوە.




بانگخوازی میسری‌دکتۆر صه‌فوه‌ت حیجازی ئه‌ڵێت: کاتێك له‌به‌ندیخانه که‌سێك هه‌واڵی رۆژنامه‌یه‌کی بۆشێخ عبدالحمید کشك خوێنده‌وه که بورجی بیزا به‌ره‌و رووخان ده‌چێت، شێخ زۆرگریا، هه‌موو به‌ندکراوه‌کان لایان سه‌یربوو، گه‌نجێك لێی پرسی یا شێخ بورجی بیزا بڕوخێ یان نا بۆچی باشه‌و په‌یوه‌ندی چیه به‌تۆوه؟شێخ وتی: ئه‌ی ئێوه له‌فه‌رمووده‌دا نه‌تانبیستووه که‌خۆشه‌ویستمان دروودی خوای له‌سه‌ر مژده‌ی فه‌تحی رۆمای داوه؟وتیان به‌ڵێ بیستومانه، وتی: ده‌ی من دڵنیام له‌و فه‌تحه‌و به‌ئاواته‌وه‌بووم که‌رۆما فه‌تح کرا له‌سه‌ر ئه‌و بورجه بانگ بده‌م..

## مامۆستا کامه‌ران:

من ماموستا کامه‌ران له سه ر داوای برای خوشه ویستم ئه ندازیار عوسمان به کورتی باسی ئه‌رزه وه رگرتن و ده‌عمکردنی سه‌یاره‌ی خۆمتان بو ده‌گێڕمه‌وه..

بسم الله... عاده ت وایه سالآنه ماموستایان و فه رمانبه ران فۆرمی زه‌وی وه‌رگرتن پڕده‌که‌نه‌وه منیش له سالّی ٢٠٠٥ پڕم کرده‌وه به‌لاّم له راستیدا هیچ به ته‌ما نه‌بووم وه‌ریبگرم چونکه خالّ و خزمه‌تم که‌مبوو له هه‌مان کاتدا بێ

ئومیدیش نه بووم چونکه به یەقینەوە رووم کردە دەرگای خواو تکام لێ کرد و وتم خوایە تو خاوەنی ئاسمانەکان و زەویت هەموو شتێ به دەستی تۆ ئاسانە منیش کرێچیم لەو نازو نیعمە تەی خۆت بە شی منیش بدە..

ئه وه بوو چه ند ساڵێ تێپەڕی ماموستایەکی هاوڕێم تێلی بۆ کردم که ئه و له لادێ ماموستا بوو وتی: مامۆستا کامەران له شارەوانی دەربەند ناوی فەرمانبەران هەڵواسراوە ئەوەندە عەزیەت بکێشە سه یری ئەو ناوانە بکە بزانە منی تیام منیش کاتێ رۆشتم سه یری ناوەکانم کرد به داخەوە ئه وی تیا نەبوو بەڵام خۆمی تیابوو.. زور سەیر بوو بەلامەوە بڕوام نەدەکرد به هەرحاڵ گەلێ دڵخوش بووم و سوپاسی خوام کرد.

ئەوەبوو هه ندێ خزم و هاورێ ئەیانووت خۆزگه واستەیەکت بکردایە بۆ ئەوەی ئەرزەکەت له شوێنێکی باش وەربگریت.. منیش بریارم دا واسته بکەم به لاَم ته نها لای خوای گەورە و له نوێژدا ئەم دوعایەم له سوجدەدا خوێند ( ربی انزلنی منزلا مبارکا وانت خیر المنزلین ).. ماوەیەك تێپەری من سەفەرێکم بۆ دروست بوو بۆ شاری خانەقین.بە لاَم شەو له خەوم دا سەری زەلامێك له شوێنی سەکندا بوو که خەبەرم بوەوە زۆر ترسام دەستم کرد به دوعای سەلامەتی کردن به هەرحاڵ به یانیەکەی له کاتی سلف لێداندا دووبارە دوعای ترم خوێندو پاشان وتم (بسم الله توکلت علی الله ولا حول ولا قوه الا بالله ) ئیتر که وتمە رێ بەرە و خانەقین..

قەدەری خوا له رێگەی ساڵح ئاغا توشی حادیسە بووم به لاَم سوپاس بۆ خوا سەلامەت دەرچووم و سه یارەکەم خراپ تێك شکا به شێوەیەك ته نها کورسیەکەی خۆم له پێشەوە به سەلامەتی دەرچوو... به داخه سه یارەی بەرامبەر که به ریژەی ٪۱۰۰ تاوان بار کرابوو له لایەن پولیسی هاتووچۆوە ، نەفەرەکان

به خه ستی بریندار بوون منیش ئەمزانی من هیچ مخالف نیم هه رلەویّ دا دوعام کرد و وتم خوایه که س نەمریّ من هیچم ناویّ و مەرێکم کرد بەخێر ئەوه بوو من سجن کرام بۆ ماوه ی ٧ روژ، شەوی حەوتەم لە خەوما منالّیکی کچی جوان هات بۆ لام و شوشەیەك عه تری پیّ بوو عه تری پیا ئەکردم ئیتر خەبەرم بوەوه بانگی حەرەسەکەم کرد که ئاشنا بوو بووم لە گه لّیانا ئەو چەند رۆژه و پێمووت : ئێستا خەوێکم بینی پشت بەخوا بەیانی لە سجن بەرئەبم، ئەوەبوو به یانیەکەی بەربووم سوپاس بۆ خوا لە هەمان کاتدا تەرەفی بەرامبەر چەند کەسێکیان هێناو لە مالّی علی برام کۆبوینەوە و ئەوان وتیان مامۆستا چیت ئەویّ لە خزمەتتاندا ئەبین منیش وتم بەلّێنم به خوا داوه کەس نەمریّ من هیچم ناویّ و ته نها ئەوەنده ئەلّێم خوای گەوره ئەفەرموێت: ﴿ **وَالكاظِمينَ الغَيظَ وَالعافينَ عَنِ النّاس وَاللهُ يُحِبُ المُحسِنين** ﴾..

وتم: ئەگەر خوا منی خۆش بوێت ئەوه هەموو شتێکه بۆمن به راستی مەجلیسەکەمان به قسەی خوش و دووعای خێر بۆیەك کردن کۆتای پێهێنا به لاّم من نزیکەی ٣٠ وەرەقه زەرەری مادیم کرد.. ئەوه بوو خوا کردی بڕیار بوو تثبیت حدودی زەویەکانمان بۆ بکەن منیش معامەلەم بۆکرد سبحان الله ئەو دوعایەم خوای گەوره لێی وەرگرتبوم که وتم: ﴿ **رَبّي أَنزِلني مُنزَلاً مُّبارَكاً وَأَنتَ خَيرُ المُنزَلين** ﴾ چونکه وتیان ماموستا وادیاره واسیتەکەت زۆر گەورەیه، چونکه زەویەکەت روکن و روو به قیبله و خۆرهەلاّته!

منیش دیسان سوپاسی خوام کردو وتم سوپاس بۆ خوا واسیتەی من تەنها خوای گەورەیه، ئەوەبوو به هۆی ئەوەی نەمتوانی بیکەم به خانوو فروشتم به ٣ دەفتەر دۆلارو خانویەکم لە سلێمانی پیّ کڕی و ئەویش دیسان بوو به خێرو بەرەکەت و خانوەکەشم دوای دوو سالّ فرۆشت به ٦ ده فتەرو نیوو ئەرزەیەکم

بیَ کرِی و ئەرزەکەش پیاوێك هات وتی  ئەو ئەرزە بگۆڕەوە لە گەڵما بە خانوەکەی ئەو کە خانویەکی جوان و کامیل کاشی و غەربی بوو  ئیتر خوا بۆی کردم دەفتەرێك باقیم دایەوە و ئێستا لە و خانوە خۆشەدام  هە موو ئەو نیعمە تانە بە فەزڵی خوا بوون  چونکە من لە بەرخاتری  ئایەتی والکاظمین الغیظ والعافین عن الناس  کابرام عە فوکرد بە لاَم خوا  زۆر زۆر لەوە زیاتری پێبەخشیم.. والله یضاعف لمن یشاء  والله واسع علیم..



## خوا غافلْ نیە!

وامەزانە خوا غافڵە لەستەمکاران با ماوەیەکیش مۆڵەتیان بداتیْ!

﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ اللَّهَ غَافِلًا عَمَّا يَعْمَلُ الظَّالِمُونَ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ الْأَبْصَارُ ﴾ ابراهيم:٤٢.

مامۆستا قادر دەرەشیشی وتی: سەرەتای سالّی شەستەکان منالّ بووم، پیاوێك کە ناوی صابر بوو هاتە مالّمان لەلادێ بەشپرزی و جل وبەرگی دڕاوو سەروچاوی برینداراەوەو وتی: کوا حەمە رەشید نەهاتووە، براکانم کەلەمن گەورەتر بوون وتیان: نەهاتووەو نەمان بینیوە، ئەو شەوە لای ئێمە مایەوە ورێنەی ئەکرد.

حەمەرەشید کالاّوشتومەکی ئەهێناو صابریش حەمالّی و بەردەستی بۆدەکرد، لەدوایەمین جاردا کەبەیەکەوە لەئێرانەوە دێن بەرەو ئەمدیو حەمەڕەشید بیست هەزار تمەن کەبۆ ئەورۆژە زۆربوو پێی ئەبێ و لەرێگا لەپشتەوە صابری نمەك حەرام بەردێك ئەدات بەسەری حەمەرەشیداو پاشان دەستەویەخەو پاش شەڕێکی قورس حەمەرەشی لەوشاخ وهەردە ئەکوژێت، دواتر لەئێران صابر ئەگیرێ و پاش چەند مانگێك ئازاد ئەکرێت و دوکان دائەنێ و بەپارەی حەرام کاسپی ئەکات.سبحان الله خوای تۆلّەسێن پاش زیاتر لەسی سالّ لەوکاتەدا کەدێت بەرەو ئەمدیولەهەمان ئەو شوێنەدا کە حەمەرەشیدی کوشتبوو دووکەس ئەم بەبەرد ئەکوژنەوەو یەك ملیۆن تمەنی پێ دەبێت دەیبەن..بەڕاستی ژیان و بەسەرهاتەکانی پەندی زۆریان تیان بۆکەسێ کەس بێ! !

## بەرووبوومی بانگەواز بەئیزنی خوای زانای دانا:

وشەی چاك وەك درەختێکی رەگوڕیشەدارە کەهەردەم بەئیزنی خوای زاناو دانا بەربوومی دەبێت وخەلّکی خوا لەسایەیدا ئەحەسێنەوە.بۆنموونە:

مامۆستا قادری دەرەشیشی وتی: کاك عەزیم لە کوردوستانی ئێران سەرەتای هەشتاکان تا پۆلی ٣ی بنەڕەتی خوێندبوو،خەریکی شوانی بوو،برایەکی هەلّەبجە کەئاوارەی ئەودیو بووبوو بەهۆی جەنگی عێراق ئێرانەوە، کتێبی ژیانی زەینەب

غەزالی ئەداتیٚ کە بەزمانی فارسی بووە، ئەم کتێبە کاك عەزیم والیێەکات کەس وکارو شوانێتی بەجێدێلیٚ و دێتە جوانرۆ و علومی شەرعی دەخوێنیٚ و شەهادەی پۆلی نۆ بەدەست دێنێت، کەسوکاری هەقی ئەوەی کە شوانێتی بۆنەکردون و بەجێی هێشتوون بێبەشی ئەکەن لەئەرزوئاوو میرات.شایانی باسە کاك عەزیم ئاوەڵزاوای مامۆستا قادرەوبانگخوازێکی چالاکە.

هەروەها مامۆستایەکی تریش وتی: کە نامیلکەی بالأنسی بەندەی پێبووە لەهەولێر ولەتەکسیەکدا خوێندویەتیەوە، شۆفێری تەکسیەکەوتوویەتی:حەزدەکەم بەدەنگی بەرز بیخوێنیتەوە تامنیش سوودوەرگرم،کاتیٚ ئەمیش بابەتێك لەسەردوعای دایکوباوکی کتێبەکەی منی بۆدەخوێنێتەوە، ئەبینێت شوفێرەکە فرمێسك لەچاوانی دێت و ئەڵێت: من دایکو باوکم زویر کردووە شەرت بیٚ بچم ئاشتیان بکەمەوە..



## قەدەرێکی سەیر:

لەم سالأنەی دواییدا کەسێك بەچوخمەکەی سەرشەقامدا ئەڕوات لەسلێمانی، خشتێك لەسەقفی چوخمەکە ئەکەوێتە خوارەوەو سەری بریندارئەکات، ماڵێك لەویا فریای دەکەون و بۆی تیمار دەکەن، کیژۆڵەیەکی ماڵەکە ئەبینێت دواتر ئەچێتە داوایو ئەبێتە هاوسەری، ئەمەش یەکێکە

لەوقەدەرە سەیرانەی کە ئێمە بەعەقڵی کوڵمانەوە تێی ناگەین، ئیمان بەقەدەر مەسەلەیکی زەرووورە تالەم دونیایەدا بوون ونەبوون تایمان تێك نەدات و شپرزمان نەکات: ﴿ مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنْفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ (٢٢) لِكَيْ لَا تَأْسَوْا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ (٢٣) ﴾ الحديد. هەر بەلاّ و گرفتێك لە زەمین دا و لە خودی خۆتان دا ڕوونادا مەگین بەر لە ئەوەی ئەو بەلاّ و گرفتە وەدی بێنن لە کتێبێك دا (بەنێوی لەوحی مەحفووز، یان عیلمی خودا) تۆمارکراوە. قەتعەن ئەو کارە بۆ خودا سادە و ئاسانە.

ئەوە بەخاتری ئەوەیە تاکوو غەم نەخۆن بۆ ئەوەی لەدەستتان دەردەچێ، وە شادی و شادمانی نەکەن بەهۆی ئەوەی خودا پێتان دەدا. وە خودا هیچ فیزنی فەخر فرۆشی خۆش ناوێ..ئەوەش وێنەی جوخم کە کاتی خۆی لەکۆلاّنەکاندا هەبووە بۆهاتوچۆکردن.

## ئەگەر ئەتزانی!

دکتۆر عبدالرحمان السمیط ئەڵێت: چاوپێکەوتنێکم بۆ دیاریکرابوو لەگەڵ ئەمیری پێشووی کوەیت شێخ جابر بۆ ماوەی ١٥ خولەك، چاوپێکەوتنەکەمان درێژبووەوە بۆ سەعات و نیوێك و باسی کارەکانم بۆکرد لە ئەفریقیا.

شێخ جابر وتی: کەی دەگەڕێیتەوە بۆ ئەفریقیا؟ وتم: هەفتەی داهاتوو.

پێش دووڕۆژ لە سەفەرەکەم فەرمانبەری دیوانی ئەمیری بیتاقەی فڕۆکەکەیان لێوەرگرتم و وتیان: سبەینێ سەعات دە لەفڕۆکەخانە بە، کە بۆ سبەی سەعات دە ئامادەبووم سواری فڕۆکەی تایبەتی ئەمیریان کردم کە شەش کەسی تیابوو،

خەریك بوو دانیشم، وتیان: برۆ پێشەوە،کەچووم، شێخ جابر بەجلی ئاساییەوە دانیشتبوو بەجۆرێك کەنەناسرێتەوەو کە گەیشتینە مەلاوی بە پەساپۆرتێکی تر خۆی ناساند و سەردانی ئیشەکانمانی کرد و ئێوارە گەڕایەوە، پاش ئەوەی کەدڵنیا بوو لەکارەکانمان ٢٣ ملیۆن دیناری کوەیتی بەخشی بە ڕێکخراوەکەمان کە بۆکاری خێرخوازی بەکاری بهێنین.

دکتۆر دەڵێت: شێخ جابر لێی پرسیم، بیستومە چەند جار ئۆتومبیلتان وەرگەڕاوەو تەقەتان لێکراوەو دزوجەردە ڕێی پێگرتوون و دڕندەتان تووش بووە و لوغمتان پیا تەقیوەتەوە، بۆ ئاوا خۆت خستۆتە مەترسیەوە؟ وتم: ئەگەر ڕێم بدەی قسەیەك بکەم.وتی: فەرمو،وتم: سوێند بەخوا ئەگەر ئەو لەزەتەی ئێمە ئەیچێژین لەوکارانە تۆ بتزانیایە چەندە یەك ڕۆژ لەسەرکورسیەکەت دانەئەنیشتی و لەگەڵ ئێمە دەهاتی دەستت ئەخستە قوڕەوە وخزمەتی ئەو هەژارو لێقەوماوانەت دەکرد، ئەو لەزەتەی کە کاتێك ئەو هەژارونەدارو نەخوێندەوارانە ئەبینی بوونەتە پزیشك و وەزیری بەرگری و جێگری سەرۆکی مالاوی.



من ئەمتوانی وەك پزیشکەکانی تر بۆخۆم خۆشگوزەران بم ودەوڵەمەند بم دوور لەهەموو زەحمەت و ناڕەحەتیەك، بەلاَم لای من بەختەوەریی ڕاستەقینە ماڵ وسامان نیە، بەڵکوئەوەیە کە خەڵکی بەختەوەربکەیت وخۆشی بخەیتە دڵیانەوە.

## خوای عبدالرحمان!!

دکتۆری بانگخواز عبالرحمان السمیط بیستی دێیەکی دوورە دەست ئیسلامی پێنەگەیشتووە، وتی: بابچین، وتیان: زەحمەتە ئاولەرێماندایەو تیمساحی تیایە، وتی: ئەڕۆین لەسەرخوا، بەبەلەم رۆیشتن تیمساح بەملاو بەولایاندا دەهاتن ودەچوون، بەسەلامەتی گەیشتن..

ئەهلی دێیەکە لایان سەیربوو، وتیان: چۆن گەیشتوون، وتیان: ئێمە بۆگەیاندنی دینی خواهاتووین و ئەوپاراستوینی، گەورەی دێیەکە وتی: دەکەمادام وایە دوعا بکە بارانمان بۆبباریێت، ئەگەر باری موسڵمان دەبین، وتی: خەڵکەکە کۆبکەنەوە، کۆیان کردەوەو ئنجا دەستنوێژی شت و دوورکات نوێژی کردو زۆرگریاو لەدوعاکەیدا وتی:خوایە دینەکەی عبدالرحمان ژێرمەخە بەهۆی گوناهی عبدالرحمانەوە..بەفەزڵی خوا هەورکۆبۆوەو باران باری، هەموو ئەهلی دێ بەیەکەوە وتیان (أشهد أن لااله الاالله وان محمدا رسول الله ).ئەوەش ئیخلاص بۆخوا لەبانگەوازدا کە بە ٣٠ساڵ یانزە ملیۆن ونیوکەسی موسڵمان کرد.



## بەڕەوشت وخووی بەرز دڵان هیدایەت وەردەگرن:

ئاینی پیرۆزی ئیسلام گرنگیەکی زۆری داوە بەڕەوشت و مامەڵەی جوان و ڕێزگرتنی غەریب ومیوان.لەبەرئەوەی کە ئاینێکی جیهانیەو ئەوەش هۆکارێکی گرنگە بۆ بڵاوبوونەوەی بەسەرتاسەری دونیادا، ئەوەی ڕەوشت وخووی جوان بێت وەك ئەوەیە بەرۆژ بەڕۆژوو بێت و بەشەویش شەو نوێژ بکات وخوانەبینێ و پاداشتی گەورەی ئەداتەوە.

ئەم پیاوو ئافرەتەساڵی ١٩٩٣ بۆ گەشتیاری ئەچنە تورکیا و لەدنیەك کە ئوتێلی لێنابێت پیاوێك ئەیانباتەوەو ئەوشەوە خزمەتیان ئەکات، هەرچەند شەو



ساردیش ئەبێت ئەوان لەژوورەوە ئەخەوێنێ وخۆی وهاوسەریشی لەژێردرەختێکدا لەدەرەوە ئەخەون، بۆبەیانی کە ئەم ژن وپیاوە ئەم دیمەنە ئەبینن

زۆرکاریان تێدەکات و وایان لێدەکات موسڵمان بن، کەئەگەڕێنەوە ڕۆمانیا ئەکەونە بانگەوازکردن و زیاتر لەهەزار کەسیان موسڵمان کردووەو لەهەوڵی ئەوەدان مەرکەزێکی ئیسلامیش بکەنەوە بۆ ناساندنی ئیسلام. سەرووەرمان ئەفەرموێت: (إنَّكم لَن تَسَعُوا النَّاسَ بأمْوَالِكُم فَسَعُوهم بأخْلاقِكم ).

***

## وانەیەکی سەیر:

ئەم بەیانیە ٢١-٩-٢٠١٧ لەئاهەنگی ئینیستیوتی بانگخوازان بۆ پێشبڕکیی وتاری‌گەنجانی بانگخواز مامۆستا ئیسماعیل شێخانی وتی:لەپۆلی ٣ی ناوەندی بووم لەحاجی ئاوا شەو ڕەشەبا بوو ماڵەکەشمان دارەڕابوو، میوانێکیش لەماڵمان بوو پێمووت ئاگات لەخۆت بێت ڕەنگە لەدارەڕاکەوە دوپشك بکەوێتە خوارەوە، خۆشم کەنووستم دوعاکەم خوێند: أعوذبكلمات التامات..هتد، وەلەدڵی خۆما وتم: جائەو دوعایە تۆبڵێی دوپشك بگێڕێتەوە، باشە من چیم خوا لەم هەموو بوونەوەرەدا حساب بۆ ئەم دوعایەی من بکات، خوا شایەتە سەعات سێی شەو خەبەرم بۆوە لەخشەی دوپشکێکی ڕەشی گەورە هاتبووە سەر سەرینەکەم تاریکیش بوو خێرا هەستام و چرام داگیرساندو کوشتم و بووە وانەیەکی کرداری مەزن، بەڵێ خوا ئاگای لەدوعاکەی منیشە لەحاجی ئاواوە..

## پێشەنگ ئەحمەد ئەڵێت:

لەبەشی ناوخۆیی بووم.. لە قوناغی ٤جلی تەخەروجم لای خە یات بوو.. باری تەندروستیم باش نەبوو بە تە نها چووم بۆبازار بۆهێنانەوەی جلەکانم..کە لە داخلی دەرچووم دوعای لە ماڵ دەرچوونم خوێند..لە دڵی خۆما وتم باشە من چەندساڵە دوعای لە ماڵ دەرچوون ئەخوێنم بلێی سودێکی وای هەبێت؟ خواشاهیدە کەلەوسەرەوە گەڕامەوە وابزانم زەختم دابەزیبوو بەرچاووم رەش بوو یەك شتم نەبینی کە پەڕیمە وە لەجادەکەی تەواری کەمێك خوارتر ئیسعافێك لێی دام نزیکە ی ٥تا٦ م.هە لێدام بردیانم بۆ تەواری وتیان بزانین میزت نەبووە بە خوێن یان حەوزم نە شکابێت.. سوپاس بۆ خوا هیچم لێنەهاتبوو بەلاَم کە مێك ئازارم.هە بوو..من ئە وسە لامەتیە بۆفەزڵی خواو ئەودوعای لە ماڵ دەرچونە ئەگێڕمەوە–

***

## ئەی خوا؟؟

عومەری کوڕی خەتاب بە شوانێکی وت: مەڕێکم پێبفرۆشە، وتی: هی خۆم نیەو من شوانی خەڵکم! وتی: بڵێ گورگ خواردی، وتی: جا وا ئەویشم خەڵەتاند ئەی خوا؟؟

دینداری بریتیە لە خۆپاراستن لەگوناه لەبەرئەوەی خوا ناخەڵەتێت و ئەتبینێت.

شێخ صالح المغامسی کە وتاربێژی مزگەوتی قوبایە دەڵێت: لەساڵانی پەنجاکاندا لەناوچەی قصیم کەسێك چوولای دۆستێکی بۆقەرز، دۆستەکەی نەخۆش بوو، متمانەی پێکرد وکیسەیەکی لەژێر سەرینەکەی دەرهێناو چەند جونەیهێکی دایەکابرا، تەماع گرتی شەو هاتەوە بۆ دزینی باقی پارەکە کەلەکیسەکەدابوو، چەند رۆژبوو باران بوو خانووەکانیش قوڕبوون، ئەوماڵەش تاقەژوورێکیان هەبوو پیاوە نەخۆشەکەو هاوسەرەکەی ومناڵەکەیان لەسەر سیسمەکەیان نووستبوون، کابرا مناڵەکەیانی هەڵگرت و هێنایە بەر بارانەکە لەحەوشەکەدا تاخەبەری بێتەوەو بگری و دایکەکەی بەوشەوە تاریکە بێت بەلایەوە، ئەمیش فرسەت بهێنێ و پارەکەی ژێرسەرینەکە ببات و بۆی دەرچێت..

ژنەکە گوێی لەدەنگی مناڵەکەی بوو زانی مناڵەکەی ناتوانێت بچێتە حەوشە دیارە شتێك هەیەو ترسا، مێردە نەخۆشەکەی هەستاندو بردی لەگەڵ خۆیا، کابراش فرسەتێکی باشی بۆهەڵکەوت وچووە ژوورەکەوەو دەستی دایە کیسە پارەی ژێر سەرینەکەو سەقفەکە رووخا بەسەریا.. دەرودراوسێ هاتن و بردیاننە ماڵێکی تەنیشتیان بۆبەیانی کەهاتن داروپەردووەکەیان لابرد دزەیان بینی بووە بەژێرەوەو پارەکەش لەدەستیایەتی، بەوجۆرە خەسارەتمەندی دونیاوقیامەت بوو..

دیسانەوە دەڵێین:هەرویستت خراپەیەك بکەی باخەڵکیش ئاگادارنەبێت ئەی خوا؟؟



## مژدەی دروستکردنی مزگەوتێک!

مامۆستا مەلا شێخ حسێن ئیمامی مزگەوتی ئازادی گەڕەکی ئیمام قاسمی قەلادزێ، لە کۆتایی نەوەدەکاندا بۆی گێڕامەوەو وتی: مزگەوتەکەمان گەورە بوو (١٥ م * ١٥ م ) بوو، سەرم کرد بەکۆشی بەرپرسی هەردوولایەنەکەدا بۆیان نەکردم،رابیتەو ئیغاسەش لەبەرگەورەیی نەهاتنە پێشەوە، زۆرمەراقم بوو، سەرەتای نۆمینەی حاجیان دوعام کردو وتم: خوایە پێنج فەرزە لێت دەپاڕێمەوەو هەموو رەمەزان و لەیلەتول قەدریش هەر داوام لێکردی ئەم مزگەوتە بکەینەوە، نازانم بۆ ئاسان نابێت؟ شەو خەوم بینی بەپیاوێکەوە وتی: ئەو مزگەوتە بۆ دروست ناکەیتەوە؟ وتم: ئاخر قوربان گەورەیەو بەچی دروستی بکەمەوە؟ فەرمووی (فاذا عزمت فتوكل على الله )، ئەوشیشەش داگرە لەو سەربانە و بیچەقێنە بەزەویدا، دام گرت و بەئاسانی چەقاندم،دووکەس هاتن دەری بهێننەوە بۆیان دەرنەهاتەوە .

لێم پرسی جەنابت کێیت؟ فەرمووی: من حەزرەتی محمدم!

لەخۆشیدا خەبەرم بۆوە فرمێسك لەچاوانم دەهات.کەوتمە گەڕان و یارمەتی کۆکردنەوە دەستم پێکردو بەدوو هەزاری سویسری سەقفەکەیان بۆشکاندم.

لەملاشەوە ئێمە لە ئیغاسە پێنج مزگەوتمان تا ئەو کاتە لەقەڵادزێدا کردبوو، وە لەدەوروبەری قەڵادزێش ١٥ مزگەوتێکمان کردبوو، لەو ماوەیەدا (١٤) مزگەوتی ترمان بۆهات گەورەکەیمان دانا بۆ دروستکردنەوەی مزگەوتی ئازادی و ئەوەبوو سوپاس بۆخوا مزگەوتەکە کراو، مژدەکەی رەسولی نازدارهاتە دی بەبێ ئەوەی ئێمە ئاگامان لەوخەوە بێت خوا خستیە دڵمانەوە ئەو مزگەوتە بکەینەوە!

## بینینی خۆشەویستمان!

لەدکتۆر ئەحمەدکوبەیسیان پرسی ئەگەر خۆشەویست ببینی دروودی خوای لەسەر چی ئەڵێیت، وتی: ناتوانم هیچ بڵێم، ناتوانم سەیری بکەم، رەنگە لەهۆش خۆشم بچم!

جارێك لەخەوما بەخزمەتی گەیشتم هیچم بۆنەوترا، یەکێك لەویا بوو وتی:ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە ئەحمەدکوبەیسیە.فەرمووی: ئەیناسم لەفلانە وەختا بانگی دەکەین بۆلای خۆمان.کەخەبەرم بۆوە دڵم خۆش بوو کەلەو ماوەیەی دیاری کردووە ئەمرم و ئەچمەوە بۆلای خۆشەویست.

کەسێك پێی وتم:تۆ بۆ وا تەئویلی دەکەیت، لەوانەیە بچی بۆحەج یان بۆعومرە! ئەوەبوو بۆیەکەم جار لەو کاتەی ئەو دیاری کردبوو لەخەوەکەدا چووم بۆعومرەو چووم بۆمەدینە، کەچوم مزگەوتەکە دوای عیشا داخرا،لەدەرەوە بەرامبەر ئارامگەی خۆشەویست تانوێژی بەیانی چاوەڕێم کردو ئنجا چوومە خزمەتی و سەلامم لێکرد!

بەڵام کەهاتمە ئیمارات کەنازونیعمەتی زۆرە ئەو خەوانەم نەما، بەڵام خەویان پێوەدیوم!




## دەلیلی صدقی خۆشەویستمان:

خۆشەویست درووودی خوای لەسەر هەندێ خورمای لای بیلال بینی: فەرمووی ئەوە چیە؟ وتی: ئەوە بۆمیوانەکانتم ئامادە کردووە، فەرمووی: ناترسی دوکەڵت هەبێت لەئاگری جەهەننەمدا، ببەخشە ئەی بیلال لەکەمی مەترسە لای خاوەنی عەرش. ( دخل النَّبيُّ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم على بلالٍ وعنده صُبَرٌ من تمرٍ فقال ما هذا يا بلالُ قال أُعِدُّ ذلك لأضيافِك قال أما تخشَى أن يكونَ لك دخانٌ في نارِ جهنَّمَ أنفِقْ يا بلالُ ولا تخْشَ من ذي العرشِ إقلالًا /الراوي: عبدالله بن مسعود | المحدث: المنذري | المصدر: الترغيب والترهيب، إسناده حسن.

هەروەها ئەفەرموێت: نەوەی ئادەم ببەخشە پێت دەخشرێت ( يا ابن آدم أنفق يُنفَق عليك). جا تەسدیقی ئەمە دەبینین کەیاساوباوی خوایە لەدونیادا ودەلیلی صدقی خۆشەویستمانە.

حاجی محمدی شارستێنی دۆستێکی خۆشەویستمە لەدوکان دەڵێت: دوکانی خەیاتیم هەبوو لەدوکانی سەروو لەحەفتاکاندا هاتنە لام وتیان پارمەتیمان بدە بۆمزگەوت، منیش ٢٠ دینارم پێبوو دام پێیان، نیوەڕۆ تۆپێك قوماشم فرۆشت ٣٠ دیناری قازانج کرد، خوا بەزیادەوە خستیەوە جێی.

هەروەها دەڵێت: ساڵی ١٩٧٤ چووبووینە ئەشکەوتێکەوە لای شارستێن، سبحان الله لە شاخەکە دڵۆپ دڵۆپ رۆژی چوارتەنەکە ئاودەهاتە خوارێ بۆ ئێمە بەس بوو.هەژدە دینارم پێبوو، ناسیاوێکم موحتاج بوو بۆئارد ١٠دیناریم لەبەرخوا دایە،دووناسیاوم بەرانیان هەبوو، وتیان لێمان بکڕەو کەی پارەت بوو بماندەرێ، خواکردی مشتەری پەیدابوون و قازانجی باشم کرد، ئنجا وەجبەیەکی ترم کڕی و شەریکیشم هەبوو، شەو خەوم بینی پێیان وتم: مەیفرۆشە دانەی ئەبێت بەهەژدە دینار، دوای سێ رۆژ دانەی ١٨ دیناری دەکرد، تێکڕا فرۆشتمان یەکی بە ١٧ دینار کەخۆمان یەکی ١١ دینارمان پێدابوو بەو شێوەیە خوا هەقی بۆکردمەوە.

شایانی باسە مزگەوتی دوکانیش کە ئیغاسە کردی ئەو نزیکەی یەك ملیۆن دۆلاری داوە، کە مەگەرتەنها خوا پاداشتی بداتەوە.

***



## مامۆستاو سەرمەشق:

وەك شاعیرەکەی لەمەڕخۆمان دەڵێم: بەداخەوە نەئەوکەسە بووم کەسم لا بیێ بەکەس،نەدەستم گەییە داوێنی ئەوکەسەی ئەو من بکا بەکەس..پاش ٥٩ساڵ تەمەن زۆر بیرئەکەمەوەو رادەمێنم لەخۆم و لەدەورووبەرم و لە کەسایەتیەکانی کۆن و نوێ، باشە بۆ پێناگەین؟.سەعدی کوڕی موعاز لەناو هاوەڵاندا دەستی بەدامێنی خۆشەویستەوە بوو تابووە کەسێك کەمرد عەرشی خوای بۆ هاتە لەرزە.تەنها حەوتساڵیش تەمەنی ئیسلامەتیەکەی بوو!

ئەڵبەتە ئێمە پاش تەوفیقی خوا پێویستمان بە تەزکیەی نەفسە، پێویستمان زۆر بەشارەزابوونە لەئیسلام تا بەلارێدا نەمانبەن و تووشی زەندەقە نەبین چونکە تەزکیەو تەعلیم لازم و مەلزومی یەکن.شێخ شەعراوی ساڵی ١٩٦٣ئەزهەر هەڵیدەبژێرن بەسەرۆکی بەعسەتێك بۆ جەزائیر ئەمیش حەزناکات بچێت.شەو خەو بەپیاو باشێکەوە دەبینێت کەنایناسێت و پێی دەڵێت: وەرە بۆلامان بۆ جەزائیر! کەدەچێت بۆ جەزائیر لەساڵیادی هەشتەمینی سەربەخۆیی جەزائیردا لە کۆشکی کۆماری چاوی بەزانایەك دەکەوێت کە ئەو پیاوەبووە چۆتە خەوی، ئەچێتە لای باوەشی پیادەکات و حەوت ساڵ لەجەزائیر دەمێنێتەوە ئامادەی هەموو وانەکانی دەبێت.

ئەو زانایەش ناوی شێخ محمد القاید ەو زانایەکی پایەبەرزی جەزائیربوو. لەنەوەی حەزرەتی حەسەنەو زۆر بۆخوا سوڵحاوبوو.ئەوەی سەیرە ئەمیش ساڵی ١٩١١ لەدایکبووەو ١٩٩٨ دا وەك شەعراوی کۆچی دوایی کرد.

ئەم پیاوە سەردەستەی رێبازی قایدی هیبری شازلی بوو، لەسەردەستی ئەمدا شەعراوی هەنگاوی ئیمانی وپاکردنەوەی دەروونی ناو رۆڵێکی گەورەی بینی.

ئەمرۆ کەمبوونەوەی تەزکیەو بۆ خوا سولحان دەبینم لای هەندێکمان کەئەمەش ئاگادارکردنەوەو کار بۆکردنی دەوێت، چونکە ئەگەر لە زەمانی خۆشەویستدا(د.خ)و لەجەنگی ئوحودا صحابە هەبوبێت دونیای ویستبێت (منکم من یرید الدنیا ) خوا دەرسی داادان و بەو شکستەیان هێنانیەوە سەر راستە رێ،دیارە ئێستاش لەو چەشنەمان زۆرە،جا باوەك خۆشەویست دوعابکەین (اللهم اعط نفسي تقواها وزكها أنت خير من زكاها أنت وليها ومولاها).

## مژدەدان بەهاتنیان:

خۆشەویستمان (د.خ) دەفەرموێت: (إِنِّي عندَ اللَّهِ لخاتِمُ النَّبيِّينَ، وإنَّ آدمَ لمنجدِلٌ في طينتِهِ، وسأنبِّئُكُم بأوَّلِ ذلِكَ: دَعوةُ أبي إبراهيمَ، وبشارَةُ عيسى بي ورؤيا أمِّي الَّتي رأت، وَكَذلِكَ أمَّهاتِ النبيِّينَ يريْنَ).

الراوي: العرباض بن سارية | المحدث: أحمد شاكر | المصدر: عمدة التفسير/الصفحة أو الرقم | ١/١٨٥ :خلاصة حكم المحدث: أسانيده صحاح.

بەپێی ئەم فەرموودەیە دایکی پێغەمبەران ئاگاداردەکرێن بەخەو کە کوڕێکی مەزنیان دەبێت و پەیامبەری خوادەبێت، هەروەك چۆن دایکی خۆشەویستیشمان بینی کە بەلەدایکبوونی نورێك تا شامی روناك کردەوە.جائەوەی من لەژیانی بانگخوازو قورئانخوێن و کەسانی تر کە دەوریان هەبووە بینیومە کەخوا مژدەی داوە بەدایك وباوکی ئەو کەسە مەزنانەوەك:

١ – مەلا عبدالکریمی مودەڕیس ئەفەرموێت: کەدایکی کاك ئەحمەدی شێخ خەو دەبینێت بەخۆشەویستەوە ومژدەی کوڕێکی ئەداتێ و بۆی ناو ئەنێت (کاك ئەحمەد)!

٢- خاڵی باوکی متوەلی شەعراویش ئەو بەیانیەی کە شەعراوی لەدایك دەبێت خەوبەدایکی شەعراویەوە دەبینێت کە جوجەڵەیەکی دەبێت و دێتە مزگەوتەوەو دەبێتە کەڵەشێرو لەسەرمینبەردەخوێنێت،کەئەم خەوەش وادەکات باوکی سووربێت لەسەرئەوەی خوێندنی پێتەواو بکات.

## نەجمەدین ئەیوب:

ماوەیەکی زۆربوو نەجمەدین ئەیوب ژنی نەهێنا.

شێرکۆی برای لێی پرسی:براکەم بۆ هاوسەرگیریی ناکەی؟

نەجمەدین وتی: ئەو کەسە نادۆزمەوە کە بۆ یەکتر ئەگونجێین.

شێرکۆ وتی: کچێك هەیە زۆر باشە بۆ نایخوازیت؟

نەجمەدین وتی: کێیە؟

شێرکۆ: کچێکی جوان و دەوڵەمەندە،کورەزای مەلەك شای سوڵتانی سەلجوقیەکانە.

نەجمەدین: ئەوە لەگەڵ من ناگونجێ.

شێرکۆ سەری سوڕما و وتی:ئەی کێ لەگەڵ تۆ ئەگونجێ؟

نەجمەدین وتی:

من هاوسەرێکم ئەوێت کە میهرەبان بێت و دەستم بگرێت و بمباتە بەهەشت و کوڕێکی ئازاو سوارچاکم بۆ پەروەردە بکات قودس ڕزگار بکات.

شێرکۆ قسەی براکەی بەدڵ نەبوو،وتی:

ئنجا ئەمەی تۆ ئەیڵێی لەکوێ پەیدا دەبێ؟

نەجمەدین وتی: لای خوای گەورە ئاسانە ئەگەر نیەتمان پاك بێت.

ڕۆژێك نەجمەدین لەمزگەوتێكی تكریت لەگەڵ پیاوچاكێكی شارەكە دانیشتبوو، پێكەوە قسەیان دەكرد.

لەوكاتەدا كچێك لەپشتی پەردەوە پیاوچاكەكەی بانگ كرد، پیاو چاكەكەش یارمەتی لە نەجمەدین وەرگرت بۆئەوەی لەگەڵ كچەكە قسە بكات.

نەجمەدین گوێی لێ بوو پیاوچاكەكە بەكچەكەی وت:

بۆچی شوت بەو كوڕە نەكرد كە ناردبووم بۆ ماڵتان بۆ خوازبێنی؟

كچەكە وتی: قوربان ڕاستە ئەو كوڕێكی قۆزو دەوڵەمەند بوو، بەڵام بۆ من ناگونجێ.

پیاوچاكەكە: ئەی تۆ چیت ئەوێ؟

كچەكە: من پیاوێكم ئەوێ،دەستم بگرێت و لەگەڵ خۆی بمباتە بەهەشتەوە، ئەمەوێ كوڕێكی ئازاو سوارچاكم لێی هەبێ پێكەوە پەروەردەی بكەین و قودس بۆ موسوڵمانان ڕزگاربكات.

نەجمەدین كچی سوڵتان و وەزیرەكانی ڕەتكردەوە سەرەڕای ئەوەی جوان و دەوڵەمەند بوون.

كچەكەش كوڕی قۆزو خاوەن پلەوپایەی ڕەتكردەوە.

***

## لەپێناو چیدا؟

چونکە هەردووکیان یەك ئامانجیان هەبوو،ئەیانویست دەستی یەك بگرن و پێکەوە برۆنە بەهەشت،کوڕێك پەروەردە بکەن قودس ڕزگار بکات.

نەجمەدین چووە لای پیاوچاکەکەو پێی وت: قوربان ئەمەوێ لەگەڵ ئەو کچە هاوسەرگیری بکەم.

پیاوچاکەکە: ئاخر ئەوە کچی هەژارترین پیاوی گەڕەکە.

نەجمەدین وتی: من ئەوم ئەوێت.

نەجمەدین لەگەڵ مەلیك خاتون هاوسەرگیری کرد و خوای گەورە کە زاناو ئاگادارە بەپێی نیەتی خۆی لەگەڵ کردن.

کوڕێکی سوارچاکی پێ بەخشین کە توانی خەونی موسوڵمانان بەدی بێنێت و قودس ڕزگاربکات ئەویش صەلاحەدینی ئەیوبی بوو. دایکی کاتێك دووگیان بوو بە سەلاحەدین لەخەودا مژدەیان دایە کە شمشێرێك لەشمشێرەکانی خوای دەبێت.

## ویردی ساڵحان:

ئیبن تەیمیە دوای نوێژی بەیانی تا خۆرهەڵاتن لەزیکرو فیکرابوو ئەیفەرموو: ئەوە وزەی گیانمە.

بەهەمان شێوەش پیاوباشان بەیانیان تاخۆرهەڵاتن ویردەکانیان دەخوێنن و قورئان دەورئەکەنەوە وپاشان کەنوێژی چێشتەنگاودەکەن خێری حەج و عومرەیەکیان بۆ دەنوسرێت. مامۆستا عبدالکریمی مودەڕیس ئاوابوو بۆیە توانی ئەو خزمەتەگەورەیە بکات، مامۆستا شێخ نورەدینی موفتیش لەهەڵەبجە هەروا بوو، بێجگە لەویردەکانی بەیانیان وئێواران هەموورۆژێك لەسەرخۆی فەرزکردبوو کەهەزار سەڵاوات بدات، جاخۆی لەمبارەیەوە ئەفەرموێت: ئەگەر ڕۆژێك هەزار

سەڵاوات زیاترم دابێت جەنابی شێخ محمد عوسمانی سیراجودینی گەورە دێتەخەوەو دەمم ماچ دەکات لەسەر ئەوەی کەئەو رۆژە سەڵاواتی زیاترم داوە لەسەر خۆشەویستمان.




شەوێك ژنێك لەهەڵەبجە کەمناڵی نەدەبوو خۆشەویستمان(د.خ) دەچێتە خەوی‌و دەفەرموێت: برۆ بۆلای شێخ نورەدین بادوعات بۆبکات مناڵت ببێت، بڵێ بەو ناونیشانەی کەرۆژی هەزارجار سەڵاواتم لەسەرئەدات، کەژنەکە دێتە خزمەت مامۆستاو ئەمەی بۆ دەگێڕێتەوە لەدڵەوە دوعای بۆدەکات و بەبەرەکەتی سەڵاوات و بەشارەتەکەی خۆشەویست خوا مناڵی ئەداتێ.

یەکێ لەو هۆکارانەی کەبۆتە هۆی ئەوەی کەئێمەومانان پێناگەین ئەوەیە کە ویردوسەڵاواتمان کەمە، خۆشەویست دروودی خوای لەسەر دەفەرموێت: رێی بەهەشی هەڵەکردووە کەسێك سەڵاواتم لەسەر نەدات.

ئاشکرایە خوا سەڵاوات و رەحمەت و بەرەکەت ئەبارێنێ بەسەریاو مەلائیکەتیش سەڵاوات ئەدەن لەسەری و داواشی لەئێمە کردووە سەڵاواتی لەسەربدەین کەبەهەرسەڵاواتێکیش خوای میهرەبان دەجار رەحمەت و بەرەکەت ئەبارێنێ بەسەرمانا.

## سەلام لەخۆشەویستمان:

خوشکە گەورەکەم وتی: ژنێکی دراوسێمان کە جل وبەرگ ئەدورێت ساڵی ٢٠١٥ خوشك وبراکەی ئەیانەوێت بچن بۆعومرە، ئەمیش حەزدەکات بچێت مێردەکەی ناهێڵێت و دەڵێت: ئەگەربچیت نابێت بێیتەوە ئەم ماڵە، ئەویش منالی گەورەی هەیە تامالی لێنەشێوێت ناچێت و بەخوشك وبراکەی دەڵێت کە چوونە لای خۆشەویستمان دروودی خوای لەسەر پێی رابگەیەنن کە لەسلێمانیەوە تامەدینە سەلامی لێدەکەم. دیارە ئەوانیش سەلامەکە دەگەیەنن.

جا بەبێ ئەوەی من ئاگام لەهیچ بێت خۆشەویستم بینی (د.خ) لەبەردەم ئەو ژنەدا وەستابووجلێکی سپی لەبەردابوو، منیش بەڕاکردن و بەپێی پەتی رامکرد بۆلای وتم: چۆن ئەو ژنە زانیویەتی خۆشەویستمان هاتووەوبۆمن ئاگادارنەبووم و خەبەرم بۆوە.

بۆبەیانی چووم بۆنان کڕین ئەو ژنەم بینی خەوەکەم بۆگێڕایەوە لەخۆشیا زۆرگریاو نانەواکە زۆرلای سەیربوو ئەوژنە بۆ وادەگری..

دیارە خوا ویستویەتی دڵی ئەو ئافرەتە خۆش بکات کە زۆرتامەزرۆی دیداری خۆشەویستەو وا مێردەکەی رێگربووە بچێت بۆعومرە و لەخەودا خۆشەویست سەردانی کردووە.شایانی باسە دوای ساڵێك مێردەکەی مردوو ئەویش چوو بۆعومرەو ئاواتەکەی هاتەدی..

***

## مامۆستا مەلا عبدالكریمی مودەریس دەڵێت:

باوكم خوێندەوار بوو موریدی شێخ عەلادینی بیارەبوو، لە پێش وەفاتیا بەچەند ڕۆژێ ڕۆیشت بۆ تەعزیەی دۆستێکی،لەوسەر کەهاتبۆوە بەعەساکەی خەتێکی لە ژێر دارگوێزێکدا کێشابوو وتبووی: ئەگەر لەم ڕۆژانەدا مردم لەژێر ئەم دارەدا لە سەرحاسی ئەم خەتە بمنێژن.ئەو ڕۆژە بۆ شەو وەسیەتی کرد بۆمان کەلەپاش خۆی تەرکی خوێندن نەکەم و پەیوەندیم بەشێخ عەلادینەوە بێ. هەروەها قەراری دا کە قەڵەم و کاغەزو دەوات بۆ من بسێنێ، نەکا خۆی بمرێ و پەکم بکەوێ، ئێمە فامی ئەوەمان نەبوو بەڵام دایکم زۆر زویر بوو، بەخواستی خوا پاش چەند ڕۆژێك وەفاتی کردو لەو شوێنەی دیاری کردبوو ناشتمان. ل٣٤٧بیرەوەریەکانی مامۆستا مەلا عبدالكریم مودەریس.

## بەسکی برسی!

زانایانی ئەم وڵاتە بەش مەینەتە بەسکی برسی خزمەتی ئەم ئاینەیان کردووەوخوای زانای داناش ئاگادارەو هەرئەویش پاداشتیان ئەداتەوە، پرۆفیسۆر مستەفا زەڵمی لە ژیاننامەکەیدا باسی نەبوونی و نەداری خۆی و هەندێ لەوزانایانەدەکات کە بۆخوا سوڵحاوبوون. هەروەها مامۆستا جەعفەرموستەفاش لەهەڵەبجە باسی جەنابی مامۆستا شێخ نوورەدینی موفتی دەکات، کەلەگەڵ چەند زانایەکی تردا بەپێ ئەم دێ بۆ ئەودێ و ئەم شار بۆ ئەوشار گەڕاون بۆ هۆشیارکردنەوەی خەڵکی لەفیکری کۆمۆنیستی کە لەشەستەکاندا هەوڵ ئەدرا ڕەواجی پێبدرێت.

مامۆستاو هاوەڵەکانی لە گەشتێکیاندا ماندووشەکەت دەبن و لەچایخانەیەکی ڕێدا لائەدەن وپارەیەکی زۆرکەمیان پێدەبێت بۆیە بەهەزارحاڵ نان و چایەکیان دەست دەکەوێت بیخۆن.

کەسانێك ئەمرۆ گەرمی و ساردیان نەدیوەو لەم گۆڕەپانی دەعوەیەدا بەراست و چەپدا تۆمەت ئەبەخشنەوەو هەوڵ وماندووبوونی زانایانی کۆن و نوێمان سفردەکەن، جابەبیانووی عەقیدەی ئەشعەری یان بیروبۆچوونی مەزهەبیان،وەیان بەهۆی ئەوەی کەسۆفی و دەروێش بوون، دیارە ڕەنج و ماندووبوون وشەونخوونی ئەو بەرێزانەو تێکۆشانیان بۆ ئەم دینە بەسکی برسی و گیرفانی خاڵی مەگەر تەنها خوا پاداشتیان بداتەوەو ئێمەش کەلەدوای ئەوان هاتووین پێویستە بەرێزەوە باسیان بکەین، نەلەبەرئەوەی مەعصوم بوون، بەڵکو لەبەرئەوەی ئەوان زۆر لەمانە باشترن کە ئێستا ڕەخنەیان لێدەگرن. (خۆشەویستمان (د.خ) دەفەرموێت: (اذكُروا محاسنَ موتاكم وكفُّوا عن مساوئِهم ) صحيح ابن حبان.

## ئامۆژگاریم بۆلاوان:

جەنابی شێخ علاءالدین کوڕی شێخ عومەری ضیاءالدین ساڵی١٢٨٠ ی کۆچی لەدایك بووەو ساڵی ١٣٧٣ کۆچی دونیای جێهێشتووەو لەبیارە بەخاك سپێردراوە، ئەم خواناسە مەردە خزمەتێکی گەورەی بە ئیسلام کرد ولەگەڵ ئەوەشدا کە کەراماتی لێبینراوە کەچی هەرگیز خۆی بەهیچ نەدەزانی و لەبارەی کەراماتەوە پرسیاری لێبکرایە دەیووت: من هیچی لێنازانم هەروەها دەیووت: کەشف و کەرامات چی تیایە وا ئێوە ئەوەندە بەشتێکی گرنگی دەزانن،ئەگەر حەیوانێك لەبالأمبۆ مرداربێتەوە، داڵەکەرخۆرە خوا ئەوەندەی بەهرە پێبەخشیوە

که لەسەر شاخەکانی بیارەوە بەکەشف دەیدۆزێتەوە وتاسەر ئەو حەیوانە راناوەستێت.(ژیاننامەی شێخ نورەدینی موفتی لا٤٩).

- بەهەمان شێوە ش مامۆستا سەعید نورسی کە کەراماتی بەئاشکرا لێبینراوە، کاتێك کەسێك دێت بۆلای و داوای لێدەکات شتێکی لەوبابەتە پیشان بدات، پێی دەڵێت:نموونەی من وتۆ وەك باوکێکە منالەکەی دەباتە دوکانێکی پڕ گەوهەرو مرواری تا چی دەوێت بۆی بکڕێت کەچی منالەکە ورِك دەگرێت بۆ ئەو میزەلانە رەنگاورەنگەی کە دوکاندارەکە بۆجوانی و رازاندنەوە هەڵی واسیون، جامنیش بانگتان دەکەم بۆلای دورِو مرواری بەنرخی قورئان وخۆتان بەشتی لاوەکیەوە سەرقاڵ مەکەن.

- جەنابی شێخ عوسمانی نەقشەبەندی گۆڕی پڕنوور بێت بەهەمان شێوەبوو، باوکم بەرەحمەت بێت چووبوە خزمەتی داوای دوعای شیفای لێکردبوو فەرمووبووی من ئەگەر بمتوانیایە ئەژنۆی خۆم چاك دەکردەوە، ئەمە لەکاتێکدا کەفەزڵ وکەرامات و دوعای ئەومەردە بۆخواسوڵحاوە ئینکارناکرێت.

جابەڕاستی زۆر لەزانایانی کۆن و نوێ و پیاوانی بۆ خوا سوڵحاوی رابوونی ئیسلامی وەك مەودوودی و سەیدو ئیمام بەنناو نورسی وملیۆنەهای تر کەراماتیان لێبینراوە، دیارە خوا ویستویەتی بەوە دڵقایمیان بکات،بەلاًم هەرگیز خۆیان بەگەورە نەزانیوە وهەمیشە خاکی بوون، مەگەرکەسانی تر باسیان کردبێت ئەگینا خۆیان لەوباسەلاداوە.

جابەڕاستی لاوانی موسڵمان زۆر ئەبێت وریابن کەئەو کەڵەپیاوانە لەکەدارنەکرێن وگوێ بۆ ئەوانە نەگرن بەناوی جەرح وتەعدیلەوە لەگەورەیی و رێزی زانایانی کۆن و نوێمان کەم بکەنەوە ئیتر لەژێر هەرناوێکدا بێت،خۆشەویستمان (د.خ)دەفەرموێت:(کفی بالمرء شرا أن يحقر أخاه المسلم).

ـ مامۆستا عبدالکریمی مودەریس باسی شێخ عومەری ئیبنول قەرەداخی دەکات لەلاپەڕە ١٣٢ ی ڕۆژگاری ژیان داو دەڵێت: ئەم زانایە چوارساڵ لەخزمەتیابووم کاتی خۆی بەفیرۆ نەئەداو بەردەوام یاتەدریس یا تەئلیف یا موتالەعەی دەکرد، ڕۆژێك پێی وتم خەوێکی دیوە گوایە لەخەویا لەسەر سەکۆی خانەقا کەللە شەکری لەبەردەستا بووەوشکاندونی و داونی بەخەڵك،منیش وتم: جا تەعبیرەکەی دیارە ئەو زانستانەیە کەبەڕێزت بڵاوی دەکەیتەوەو دەیدەی بەقوتابیەکانت.



ـ مامۆستا مودەریس دەڵێت: ڕۆژێك مەلا حەمە سەعیدی سەڵەسی کەلەگەڵ من دەیخوێند تووشی حاڵەتی فیّ لێهاتن بوو، ئێمەش بەچوارکەس هێنامانە بەردەستی جەنابی شێخ عومەر، ئەویش فەرموودەیەکی قودسی بەسەراخوێندەوە کە ئیمام ئەحمەد ریوایەتی کردووە لەئیمام عەلیەوە:کە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (كلمة لااله الا الله حصنى فمن قالها دخل حصنى، ومن دخل حصنى أمن من عذابى). کەئەمەی بەسەراخوێندەوە مەلا حەمە سەعید چاوی کردەوەو رزگاربوو، چەند وەقت لەلای خۆم بوو، دواتریش نەمبیستەوە تووشی فیّ لێهاتن بوو بێتەوە.

بەداخەوە ئێمە قەدری زانایانی خۆمان نازانین، ئاخر ئەوان نەبوونایە کیّ لەم وڵاتەدا مەشخەڵدارو مامۆستا و بانگخوازبوو؟ تۆ بڵێی ئەوان لەئیسلامەتی حاڵی نەبووبن و خەڵکیان بەلاڕێدا بردبێت ونەیانزانیبێت بیدعەو سوننەت چیە؟، خۆ

هیچ نەبێت ئەوە یەکێك لە بەرهەمەکانیان کە مامۆستای مودەڕیسە کە مایەی شانازی کوردو عێراق وهەورامان و مەدرەسەی بیارەیە!

مامۆستا مەلا عبدالکریمی مودەڕیس لە رۆژگاری ژیان دا دەڵێت: لەجەنگی جیهانی یەکەمدا قەیسەریەکان ساڵی ١٣٣٢ی کۆچی رووبانکردە کوردوستان و لە نێوان سنەو مەریواندا بەگزادەی مەریوان رێیان لێگرتن و جیهادی باشیان کرد و چەند شەهیدیان دا.بەهاری ساڵی ١٣٣٥ یش هێرشیان هێنایەوە لەسنەو سەقزەوەو کوردەکان لەهەموولایەکەوە پێشیان پێگرتن.

لەم ساڵا عەلی ئەحەسەن پاشا هات بۆ پێنجوین و گەورە پیاوانی کۆکردەوەو گلەیی کرد! شێخ عەلادینی بیارەش فەرمووی: ئەساسەن کە ئێمە جیهادمان کردووە بەئەمری دین و بەئەمری خوا جیهادمان کردووە، ئەگەرنا بەقانون تۆ هەقی ئەمری جیهادت لەسەرئێمەنیە، ئنجا ئێمە میللەتێکی فەقیرو بێ چەك و بێ ماڵ وپارەین، چۆن بەوحاڵەوە جیهاد ئەکرێت؟بەلاَم تۆ کە ئەمیربوویت چەك و ئەسبابت زۆربوو، بۆچی مەیدانت دا دوژمن بەسەر ولاَتا غالیب بێت؟کابرا مات بوو قسەی پێنەکرا.

شایانی باسە شێخ عەلادین و هەوادارانی لەنزیکی شاری سنە جیهادی باشیان کردبوولەگەڵ قەیسەریەکان و چەندەها شەهیدیشیان بۆخوا دابوو.

جا بەڕاستی هەرچی رۆژێك لەرۆژان بەردێکی خستبێتە سەربەردێك بۆ ئەم ئیسلامە هەقە بەرێزەوە باسیان بکەین، ئەوان نەبوونایە ئەو دینە بەئێمە نەدەگەیشت و، یا خەڵکی نەنێرین بۆدۆزەخ و تەنها خەمی خۆمان بێت چۆن بچین بۆبەهەشت!

جا بەڕاستی ئەو قسەیە تەواوە: بەشکاندنی پێی کەس ئێمە باشتر بەرێدا ناڕۆین:




**بوخاری:**

ئافرەتێك هاوسەرگیری لەگەڵ پیاوێك كرد بەناوی ئیسماعیل كەزانایەكی گەورە بوو لەسەردەستی ئیمام مالك وانەی خوێندبوو وە بەرووبومی ئەو هاوسەرگیریە پیرۆزە منداڵێك بوو ناویان نا(محمد)پیاوەكە مرد وژنەكەی بەجێهێشت بەمناڵێكی بچوكەوە لەگەڵ سامانیكی زۆر دایكەكە مناڵەكەی بردە بەردەم پەروەردەیەكی ئیسلامی بەڵكو ببێتە زانایەك لەزاناكانی موسوڵمانان بەڵام بەداخەوە مناڵەكەی چاوی كوێر بوو، دیارە بەكوێری زۆر زەحمەتە لەلای شێخێكەوە بیبەیت بۆلای شێخێكی تر بۆ فێربوونی زانست، ئافرەتەكە دەستی كرد بەدوعاكردن.

شەوێكیان لەخەویا ئیبراهیم خەلیلی خوای بینی سەلامی خوای لێبێت كە پێی وت:خوای گەورە بە زۆری دوعاكردنت بینینی بۆ چاوەكانی كوڕەكەت گەڕاندەوە و ئافرەتەكە بەخەبەر هات بینی كوڕەكەی چاوی ئەبینێت.

ئەو مناڵەش (بوخاری) بوو كەگەورەبوو كتێبێكی دانا كەلەدوای قورئانی پیرۆزەوە بەراستگۆترین كتێب ناسراوە كەئەویش صحیحی بوخارییە.

## بەسەرهاتێکی سەیر:

شێخ متەوەلی شەعراوی دەڵێت: مردو هەست بەسەردانی زیندوودەکات بۆیە سونەتە سەلام بکەین.مامۆستا نوری فارس لە شەرحی لوئلوئومەرجاندا موجەلەدی یەك لا ۲۰ دەڵێت: لەهەولێر لەگەڵ صەلاحی کوڕمدا لە دوای راپەڕین لەئوتێل بووین، تووشی خێزانێکی کوردی کەرکوك بووین زۆرکەیف خۆش بوون، کەهۆی ئەو شادی و خۆشیەمان لێپرسین وتیان: لەجەنگی کوەیت دا جەنازەیەکیان بۆ هێنایەنەوەو وتیان ئەوە کوڕەکەتانە شەهید بووەو ئێمەش رازی بووین بەقەدەری خواو ناشتمان..

دایکی و هاوسەرەکەی هەموو هەفتەیەك ئەچوونە سەرگۆڕەکەی وشیوەنیان دەکرد، ئەوەی سەیربوو یەکێك دەهاتە خەویان دەیووت: من کوڕی ئێوەنیم،مەیەن بۆ سەردانم و گوناهبارم مەکەن، لە مەلایەکیان پرسی ئەویش وتی: بەجلی شەرعیەوە بچن و شیوەن مەکەن.ئەوانیش ئەوەیانکرد کەچی خەوەکە دووبارە دەبۆوە.

پاش دووساڵ تەلەفۆنمان لە دەرەوەی وڵات بۆکرا کە کوڕەکەمان برینداربووەو لای ئەمەریکیەکانەو ئەوە دووجارە ئەچین لەزاخۆ دەیبینین و دەگەڕێتەوە بۆ دەرەوەی وڵات و ناوێرێت بێتەوە بۆکەرکوك لەترسی حکومەتی بەعس.

شایانی باسە دوای ئەوەی بەکوڕەکەی شادبۆوە دایکەکە بەردەوام وەك وەفایەك سەردانی ئەو سەربازە بێکەسە مردووەی دەکردو دوعای خێری بۆدەکردا!

***

## بۆ خوا پیاوبن ئەتانبینێ!

رۆژێ لاوێك پیرەمێردێك دەبینێت كە چرایەكی بەدەستەوەیە، لێی دەپرسێت: مامەپیرە بەم رۆژە رووناكە ئەم چرایەت بۆ چیە؟ ئەڵێ: كورم بەدوای پیاودا ئەگەڕێم!

خوای گەورە وەسفی پیاوانێك دەكات كە ماڵ و سامان سەرقاڵیان ناكات وئەو پەیمانەی داویانە بەخوا نایشكێنن و بەهەموو شێوەیەك لەهەوڵی بەدەستهێنانی رەزامەندی خوادان.

رۆژی پێنج شەممە ٢٠١٦/٣/٩ یەكێ لەو پیاوانەم بینی لەمزگەوتەكەی خەستەخانەی هیواو نوێژی نیوەڕۆمان بەجەماعەت كرد.

ئەم پیاوە ناوی جەمالی فەتاحی رەحمانە وخەڵكی شێرەمەڕن و ئێستا لەهەڵەبجەی تازە دائەنیشێ و فەرمانبەرە.كاك جەمال وتی: ساڵی ١٩٩٦ چوینە داوای ئافرەتێك هێشتا سەرەتا بوو بەقەدەری خوا پەرەمێز پیا تەقی و ٦٠٪ی جەستەی سووتا، سەردانم كرد لەخەستەخانەو وتم:مادام ئەو نیەتمان بووە وئەوەش قەدەری خوایە من هەردەتهێنم.

ئەوە بیست ساڵە هاوسەرێتی چوارکچی لێی هەیەو زۆربەختەوەربوون، واچەند ساڵێكە ژنەكەی نەخۆشەو باسی ئەوەی بۆدەكردم كە چەند بۆی گریاوە! (الله أكبر خواچەند ئەو وەفایەی پێخۆشە). بەداخەوە پاش ماوەیەك خێزانەكەی كۆچی دوایی كرد.

هەروەها كاك جەمال وتی: باوكی ساڵی ١٩٩٣ تووشی شێرپەنجەی گەدەبوبووەودكتۆر وتبووی: بۆی عەمەلیات دەكەم بەلام هەرچەند مانگێك دەژی!ئەو بەیانیەی كەدەبوو بۆی عەمەلیات بكات،بەكورەكەی وتبوو: دەرم بكەن لەخەستەخانە ئەمشەو خەوم بینیوە، ئەوەبوو دەریان كردو خزمان سەردانیان

کردبوو، وتبووی: بڕۆن خەمتان نەبێت تا نوێژی بەیانیش هیچ نابێت و بەدووکوڕی وتبوو بڕۆن زەرعاتەکەمان ئاوبدەن!سبحان الله لەدوای نوێژی بەیانی کۆچی دوایی کرد، جاهەندێ کەس خوا ئاگاداریان دەکات کە کەی دەمرن ودەگەڕێنەوە بەربارەگای پەروەردگار. .



## دەستم لەدەستا بەرەو لای پێغەمبەرمان(د.خ):

مامۆستا شێرزاد کە بۆدکتۆراکەی چووبووە سۆدان لەوێوە سەردانی کۆنگۆی دیموکراتی کردو شێخ عومەری برادەری کە خەڵکی کۆنگۆیەخوشکەکەی شووی بە (دێلی ) ناوێکی مەسیحی کردبوو بۆ ئەوەی بژی و بووبووە گاور، دێلی ئەفسەربوو زۆرکارئاسانی بۆ مامۆستا کرد لەفرۆکەخانەو مامۆستا دەرسی بۆچەند کەسێك داناو سوودی زۆری پێگەیاندن بۆ ماوەی بیست ڕۆژ، ژنەکەی دێلی موسڵمان بووەوەو کچەکەشی کەلە پیاوێکی ترە ئەویش موسڵمانبۆوەو دواهەمین ڕۆژیش مامۆستا بەدێلی وت: پێم حەیفە یەکێکی وەك تۆ لەقیامەتدا دەستم بەدەستیەوە نەبێت کاتێك دەچم بۆلای پێغەمبەر(د. خ).ئەویش وتی: من چەند ڕۆژە چاوەڕێی ئەو قسەیەم وئەمویست داوای موسڵمانبوونم لێبکەی.

بەم شێوەیە دیلی موسڵمان بوو، وەبەمامۆستای وت: دڵت خۆش بێت کە تۆ دەگەڕێیتەوەو برایەکی موسڵمانت لەدوای خۆت بەجێهێشتووە.بەڕاستی بانگخوازی راستەقینە وەك بارانە لەهەمووجێیەك مایەی خێروبەرەکەتە.کراس و پانتۆڵ لەبەرەکە دیلیەو ئەوی ناوڕاست شێخ عومەرەو و ئەوی تریش مامۆستا شێرزادەو ژنەکەش کەلەتەمەندایە ئەوەش خوشکی شێخ عومەرەو ئەوەی تەنیشتیشی عائیشەی کچێتی.



## سەبری ئەیوب!

سەبری حەزرەتی ئەیوب بەنمونەی بەرزی ئارامگری باس دەکرێت، بەلاّم ئەو پێغەمبەری خوابوو، دواتر خوا چاکیشی کردەوەو هەمووشتێکیشی پێدایەوە و خوای گەورەش لەبارەیەوە فەرمووی (نعم العبد انه أواب).

بەلای منەوە کەسێکی وەك کاك هاشم لەکەلار سەبری حەزرەتی ئەیوبی هەیە!

ناوبراو ساڵی ١٩٨١ ماڵیان لەجەلەولا بوو لەجەنگی عێراق ئێراندا تووشی ئیفلیجی بوو، ئەوکاتە پابەندنەبوو بەئاینەوە بۆیە چەند جار هەوڵی ئەوەی داوە کە کۆتایی بەژیانی بهێنێ و هاوسەرەکەی کە دووکوڕی لێی هەیە ئازادی ئەکات کەدەتوانێت شووبکاتەوە، ئەویش بەجێی ناهێڵێ و تا ٢٠١٦ کەمن بینیم ٣٥ ساڵە خزمەتی دەکات و کوڕەکانیشی گەورەبوون وهاوسەرگیریان کردووە.

دایکی هەمیشە دەست بەدوعا بوو کە خوا دڵی کوڕەکەی خۆش بکات، شەوێك مامۆستا هاشم خەو بەخۆشەویستەوە دەبینێ کە ئەبوبەکر لەلای ڕاستی بووە و عومەریش لەلای چەپیەوە بوو، خۆشەویست پێی دەفەرموێت بۆ وا بێتاقەتی چیت دەوێت؟ خوا دەیخاتە سەرزمانی دەڵێت: عیلم و ئیمان.

سوپاس بۆخوا وازیاتر لە ٣٢ ساڵە خوا عیلم و ئیمانی پێداوە بەبەرەکەتی دوعای ڕەسوڵی نازدار.

بیرکەنەوە ٣٥ ساڵ بۆ یەکێکی لەش ساغ واتە: ٤١٠ مانگ،واتە: ١٢٣٠٠ ڕۆژ واتە: ٢٩٥٢٠٠ سەعات،واتە: ١٧٧١٢٠٠٠ حەڤدە ملیۆن و حەوت سەدو دوانزە هەزار خولەك!!بەلاّم بۆکەسێك کە تەنها سەری بجولێ،ئەوەی دەیخوا بکرێت بەدەمیەوەو هیچ جوولەیەکی بۆنەکرێت!!ئەو ١٧٧١٢٠٠٠ خولەکە کەهەرخولەکێکی بە ڕۆژێك لێدەڕوات مەگەر هەرخوا پاداشتی بداتەوە، دیارە کەسانی تریش هەن بەهەمان شێوەن وەك کاك عەلی لەصمود کەئەویش نزیکەی

٢٦ ساڵە ئارامگرە و بەوحاڵەوە موتابەعەی ئەنتەرنێت دەكات و خۆڕاگرە كەئەوەش وێنەی كاكە عەلی یە..



## حاجی ڕەجەب:

حاجی ڕەجەب كەسایەتیەكی شاری سلێمانی بوو دوكانی قوماش فرۆشتنی هەبوو لەبەرحەوزە وشكەكە و چەند ساڵێكە كۆچی دوایی كردووە، مامۆستایەكی مەسیحی لە شەستەكاندا دێت بۆلای و دەڵێت: كاك حاجی مووچەی خانەنشینیەكەم شەش مانگە بڕدراوە لەبەغداوەو ماڵ و مناڵم هەیەو پارەشم نیە بچم سۆراغێكی بكەم، بەڵكو برێك پارەم بدەیێ بەقەرز بچم بەدەمیەوە،ئەویش تۆزێ بیری كردەوەوپاشان وتی: چەندت پێویستە دەتدەمێ بۆ خۆت بەمەرجێك سبەینێ هەینیە كەچوویت بۆ بەغدا خۆت بشۆو بچۆ بۆ مزگەوتی شێخ

عبدالقادری گەیلانی.ئەویش وتی: کاك حاجی من مەسیحیم بچم چی بکەم؟وتی: خۆمن ناڵێم ببە بەموسڵمان.

مامۆستاکە بۆ بەیانی خۆی دەشواو دەچێت بۆ مزگەوتەکەو ئەشچێتە ژوورەوەو سەکینەو دڵئارامیەکی زۆری بۆ دێت، بۆ شەممەش کەئەچێت بۆ بەڕێوەبەرایەتیەکەو بەقادرمەدا سەردەکەوێت بۆ ژووری مودیر گوێی لەمودیر دەبێت ئەنەڕێنێت بەسەر فەرمانبەرەکانیدا و دەڵێت: ئەبێ هەرئێستا فایلی فڵانی کوڕی فڵانم بۆ بدۆزنەوە، ئەڵێن:ون بووەو دیارنیە! ئەڵێ من ئەوە نازانم هەرئێستا ئەمەوێت.

ئەمیش کەئەچێت بۆلای ودەڵێت:من ئەوکەسەم هاتووم بزانم بۆ شەش مانگە مووچەکەم بڕدراوە؟

دەڵێت:خواماڵت ئاوابکات تۆچیت؟ئەمشەو لەخەوما سێ جار وەزیر تەلەفونی بۆ کردم کە مەلەفەکەت بدۆزینەوەو مووچەکەت بۆ بگێڕینەوە.

ئافەرم حاجی رەجەب چەند حەزی کردووە دڵی ئەوکەسە بهێنێ بەرەو ئیسلام،



جامع وحضرة (الشيخ عبد القادر الكيلاني) صورة من الجو

دیاره خواش دڵی حاجی ڕەجەبی نەشکاندووەو ئەو کەراماتەی پیشانی ئەو ماموستایە داوە، من دەڵێم: ڕەنگە ئەو ماموستایە موسڵمانیش بووبێت بەڵام ئاشکرای نەکردبێت! (ئەم بەسەرهاتە کاك عەتای حاجی ڕەجەب بۆ ماموستا شێخ حسێنی قورئانخوێنی گێڕابۆوە ).

## ئەگەر قازی من ئەبوو!

پیاوێك بۆ ماموستا عەبدولخالقی ڕووناکی گێڕابۆوەو وتبووی:لەکاتی کوشتنی فرانسۆحەریریدا وەزعی هەولێر شپرزبوو، سەیتەراتی زۆردانران، ئافرەتێك قازێکی پێئەبێت و سواری پاص دەبێت لەکەسنەزانەوە بێت بۆهەولێر بیفرۆشێت، پیاوێکیش لەبەردەمیدا دانیشتبوو زۆر بێ ئەدەبی کرد بەرامبەر ئیسلام خەریك بوو دڵم شەقببات، نەمئەتوانی وەڵامی بدەمەوە وتم: نەك لەسەیتەرەیەك دامبگرن و بڵێن ئیسلامیە!

خواکردی قازەکە پەلاماری گوێی کابرای بەردەمی داو ژنەکە رایدەکێشاو



پیاوەکەش خۆی رائەپسکان ئەم بەلایە چی بوو بۆی بوو، دیارە دەمی قازیش مشارییە، وەحاڵ گوێی کابرای پڕکرد لەخوێن و بەرێسوایی دابەزی! ﴿ **وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَى لِلْبَشَرِ** (٣١)﴾ المدثر.

بەڕاستی سەربازانی خوا زۆرن، خوا دەتوانێت بەرەشەبا، بەترس خستنە ناودڵ بە بوومەلەرزە، بەڤایرۆس،بە باڵندە و،...هتد کێی بوێت لەناوی ببات!جا ئەگەرئەو قازە هی من ئەبوو سەرم نەئەبڕی وهەر خزمەتم ئەکرد لەسەرئەومەوقیفە مەردانەیەی تا ئەو کاتەی خوا ئەیبردەوەو دوایش مۆمیام دەکرد بۆ ئەوەی بمێنێ بۆ یادگار!!



## تەجەلیەتی!!

لەخوارحەوزە وشکەکەی سلێمانی بازارێك هەبوو پێی دەوترا خانی ئاغا فەتحولا، لەوخانەدا لادێ نشینێك دێتە لای حاجی قادری خولەساوەر کەدراوسێ دوکانی حاجی فەقێ شاڵی بوو.

لادێ نشینەکە:تۆپێ خامم ئەوێ هەتە؟؟

حاجی قادر: بەڵێ: هەمە.

لادێ نشین:خامی وەصیە(ئەوخامە ئەوسا دەوترا هی عەبدول ئیلاهی وەصی مەلیك بووە)؟

حاجی قادر: بەڵێ خامی وەصیە.

لادێ نشین:لەخامەکەی حاجی فەقێ شاڵییە؟

حاجی قادر: بەڵێ هەرئەوەیە کەلای ئەوە.

لادێ نشین:دەقەیناکە ئەچم لای ئەو دەیکڕم!

دەوەرە حاجی قادر دڵت شەق نەبات.

جا ئەم حاجی فەقێ شاڵیە ئەیانووت: تەجەلیەتی و رزقی بەسەرا ئەباری، بەوەشەوە کەمرد خانوویەکی لەپاش بەجێما کەئێستا لە ئەسحابەسپی کراوە بەمەتحەف.

ئەم حاجی فەقێیە خێرەومەند بوو، خزمەتی زۆری میوانی دەکردو جاری واهەبوو ئەوەندەمیوانی دەهات هەندێکیانی دەنارد بۆ مزگەوتی خانەقا کەنزیكماڵیان بوو، نانی بەسینی بۆدەناردن و بەتانی ودۆشەکیشی بەشەو بۆدەناردن.

شایانی باسە حاجی رەجەبیش کەقوماشی دەفرۆشت هەروا تەجەلی بوو، دوکانەکەی بەرنەدەکەوت ئەتووت: بایەعی تەوزیع دەکات.(دیارە ئەمیش وەك حاجی فەقێ سرێکی هەبووە لەگەڵ خوادا!!).




## خەوێکی لاوێک بەخۆشەویستەوە:

دکتۆر عومەر عەبدولکافی دەڵێت: لە پێشبڕکێی قورئاندا لەجەزائیر کە بەرپرسانیش ئامادەبووبوون، شێخ ئیبراهیم ئەلئەخزەر لەوتەیەکیدا وتی: ژنێکی هەژار کوڕەکەی دەنێرێت بۆ لای زانایەك کە سێ ڕۆژ لەناوچەکەیانەوە دووردەبێت، تا قورئان لەبەر بکات، کەلاوەکە دەچێتە لای و داوادەکات کەقورئانی فێربکات زاناکە دەڵێت:جارێ جێمان نیە و دەبێت لێرە چاوەڕێ بکەیت و خزمەت بە مزگەوت وقوتابیان بکەیت تا یەکێك دەردەچێت و بێیتە جێی.ئەڵێ:ئەی ئەگەر ئەوە نەکەم؟ ئەڵێ: جونەیهێکی ئاڵتون ئەبێ بدەی!

ئەویش دەڵێت: باوکم و باپیریشم جونەیهی ئاڵتونیان نەدیوە تامن بۆتی بهێنم. بەدڵشکاوی دەگەڕێتەوە شەوێ لەڕێ نوێژی عیشادەکات و لە ژێر درەختێکدا دەخەوێت و لەخەویا خۆشەویستمان دەبینێت(د.خ) پێی دەفەرموێت:کوڕم بەیانی بچۆرەوە بۆلای زاناکەو بڵێ ڕەسولی خوا دەفەرموێت قورئانت فێربکات، دەڵێ: ناونیشانێکم بدەرێ. ئەویش دەفەرموێ :پێی بڵێ بەناونیشانی (زمرا زمرا).

کەبەیانی دێتەوە لای زاناکەو بۆی دەگێڕێتەوە، باوەشی پیادەکات و لای خۆیەوە دایئەنێت.



لێی دەپرسێت:ئەوە مانای چیە؟؟زاناکە دەڵێت:چەندساڵێك لەمەوبەر لەخەوما خۆشەویستم بینی (د.خ)ولێم پرسی ئەوانەی قورئان لەبەردەکەن و کاری پێدەکەن چۆن دەچنە بەهەشتەوە؟؟ فەرمووی: زمرا زمرا!

سەرۆکی جەزائیری کەئەمەی بیست هەستاو وتی: ئەم پێشبڕکێیە کە سێ ساڵ جارێکە با هەموو ساڵێك بێت و هەموو بەشداربویەکی ئەمساڵیش (٥٠) هەزار دیناری بدەنێ.

شایانی باسە کەئەم باسەم بلاوکردەوە مامۆستا شێرزاد عبدالوهاب کۆتایی مانگی دووی٢٠١٥ لە سۆدان بوو بۆ دکتۆراکەی، کەئەم باسەدەبینێت لەفەیس بوکدا لە دارفۆر کەبەملیۆنەها حافزی قورئانیان هەیە لە وتارێکدا ئاماژەی بۆدەکات و زۆریان دەگرین.

جابرِوانە گرنگی ئەنتەرنێت لە بانگەوازدا کە دەتوانی لە خولەکێکدا ئەوەی دەتەوێت بیگەیەنیتە هەزارەها کەس لەسەرتاسەری دونیادا.

***

## شێخ مظهر الخربیط:



یەکێکە لە شێخەکانی هۆزی دلیم، بەشێخی بەرگری بەناوبانگە دژی ئەمەریکیەکان، کاتی خۆی دژی داگیرکردنی کوەیت بوو، پیاوی صدام نەبوو بۆیە مالو مولکی هەمووی بەئەمری صدام دەستی بەسەراگیرا.

جاکاتیَ صدامیش لیێ قەوماو هانای بۆ برد وەك نەریتێکی عەشایەری گرتیە خۆی و ئەمەریکیەکان قەسفی مەزرەعەکەیان کرد وبیست کەس لە بنەماڵەکەی کوژران و، صدام و کوڕەکانی پیوەنەبوون.

ئەمەریکا بەڵێنیان دایە بیکەنە سەرۆکی عێراق بۆ ئەوەی دژایەتیان نەکات، خۆی پیَ نەفرۆشتن، دواتر فەرمانی گرتنی بۆ دەرچوو لەگەلَ ٥٥ کەسەکەدا، بۆیە لەلوبنان کەچووبوو بۆ چارەسەری سەرەتانی ژنەکەی دەستبەسەرکرا بۆماوەی ١٥ مانگ و دوایی بووە پەنابەر لە ئوردون.

ناوبراو ئەلێت: کەئەمەریکا لە ٢٥ کەسەکەی مەجلیسی حوکم زۆربەی شیعەیان دانا زانیم کە شەڕی تایفی بەرپا ئەکەن.(جا من ئەم ناساندنەم بۆ ئەوە هێنا کەئەم رووداوە باس بکەم وهەقم بەسەر هەڵسەنگاندنی ئەو پیاوەوە نیە):

دکتۆر محمد مطنی کەخەڵکی رومادیە بۆی گێڕامەوەکە شیخ مظهر لەساڵی ١٩٩٧ دا لەفەڕەنسا بوو بۆ ئەوەی زەرعی جگەری بۆ بکەن، چونکە جگەری پەکی کەوتبوو، شەو لەخەویا پیاوباشێکی ناوچەکە پیێ دەڵێت پەرداخێك ئاو سەد جار ئایەتەل کورسی و سەدجار فاتیحەی بەسەرا بخوێنە وبیخۆرەوە چاك دەبی، ئەویش ئەوە دەکات و پاشان کە ئەچێتەوە پشکنینی بۆدەکەن، دکتۆرە

فەڕەنسیەکان سەرسام دەبن و دەڵێن:تۆ کەسێکی ترت هێناوە ئەم نەخۆشیەی بووە، ئەگینا ناگونجێ تۆ ئەو نەخۆشە بوو بیت و ئاواش چاك بووبیت، وتیان: دیارە ئەتەوێت بەوە موسڵمانمان بکەیت!!ئەویش بۆی سەلماندن کەهەرخۆی نەخۆشەکەبووەو خوا بەفەزڵی خۆی چاکی کردۆتەوە.

## خوایان کرد بەشەریک!!

لە دێیەکی وڵاتی میسرئەندازیار صلاح عەتیەو هەشت هاوڕێی پڕۆژەیەکی دەواجنیان دامەزراندو یەکی ٢٠٠ جونەیهیان دا کە سەرمایەکەیان ١٨٠٠ جونەیە بوو، ١٠٪ شیان دانا بۆخوا.پڕۆژەکە چونکە نیەتیان ساغ بوو بەرەکەتی تێکەوت وگەورەبووبەجۆرێك بەشی خێرەکە پاش دەیان ساڵ ئەوەندە زۆر بوو کە لقێکی زانکۆی ئەزهەریان کردەوە و دواتر بوو بەزانکۆیەك کە ١٦٠٠ قوتابی کوڕوکچ تیادەخوێنن و دەیان پڕۆژەی تریشیان پێ دروست کرد تەنانەت شەمەندەفەرێکیشیان پێ دامەزراند بۆهاتووچۆی قوتابیان.

ئەمەش تەصدیقی ئەو ئایەتەیە کە هەرکەس قەرزبدات بەخوا خوا بەرەکەتی بۆ تێدەخات و بەچەندقات هەقی بۆدەکاتەوە: ﴿ مَن ذَاالَّذي يُقرِضُ اللهَ قَرضاً حَسَناً فَيُضاعِفَهُ لَهُ أضعافاً كَثيرَة ﴾.

ئەندازیاری خاوەن هیممەت کەبووە خۆشەویستی خەڵکی لەرێی خزمەتەکانیەوە وەك هەموو زیندویەکی تر شەرابی مردنی نۆشی و ئەوەش وێنەی مەوکیبی جەنازەکەیەتی، خۆزگە هەریەك لەئێمە وەك ئەو بەراستی بۆخوا بژیاینایەو خزمەتی خەڵکیمان بکردایە تابە رووسووری بگەڕێینەوە بەر بارەگای هەقی خوایی. (انا لله وانا اليه راجعون).




## خوێندنەکەت تەواودەکەیت!

ئەمڕۆ ۲۰۱٦/۱/۱٤ مامۆستا یەعقوبم بینی کەخێزانی چارەسەری وەردەگرت لەخەستەخانەی هیواوباسی بەسەرهاتی خۆی بۆکردم و وتی:لە دێیەکی شارباژێڕ وتارم ئەدا، ڕێیان پێگرتم زۆر ئازاریان دام و هەڕەشەیان لێکردم کەوتار نەدەم وکۆڵم نەدا وهەردەم سەردانی مالأنی دێم دەکردو زۆریانم هێنا بەرەو مزگەوت!

پاش چەند ساڵێکی تر بۆماوەی هەشت مانگ گرتیانم وئازاروئەشکەنجەی زۆریان دام، لەکۆلێژی شەریعەی بەغدا تانیوەی سالم خوێندبوو زۆرخەمم بوو خوێندنەکەم بفەوتێت، شەو لەخەوما وەك لەمزگەوت بم مامۆستا مەلا عبداللەی چوارتام بینی و مژدەی دامێ کەخوێندنەکەم تەواودەکەم.

پاش هەشت مانگ کەبەربووم و چوومەوە بەغدا وچوومە لای راگروحاڵی خۆم بۆباس کرد کە ڕێم بدەن تاقیکردنەوەی سەری ساڵی پۆلی دوو بدەم،وتی ئەبێت لەپۆلی دوو دەوام بکەیتەوە وئەوەی تۆ داوای دەکەیت نایاساییە.

ناچارچوومە لای سەرۆکی زانکۆ،خوا پاداشتی بداتەوە تەلەفونی کرد بۆ راگرو پاش هەفتەیەك ئیمتحانەکانم هەمووی داو سوپاس بۆ خوا دەرچووم و چوومە پۆلی سێ و ئەوساڵەم نەفەوتاوخوێندنم تەواوکرد.

مامۆستا یەعقوب کە ئەم باسەو چەند بەسەرهاتێکی تری بۆ گێڕامەو فرمێسك لەچاوانی دەهات، بەتایبەت ئەوەی کەدەنگێك لەخەویا پێی وتبوو تۆ لەسەر ڕێبازی پێغەمبەرانیت،زۆر دەرسم لێوەرگرت و زانیم کەئەو بەرێزە بەڕاستی خۆی بۆ خوا یەکلایی کردۆتەوە.

## مامۆستا نوورسی:

نارەحەتی زۆری چەشتووە لە بانگەشە بۆ ئیمانداوخوای گەورەش کەراماتی زۆری داوەتێ:

١- قوتابیەکی دەڵێت لەبەندیخانەدا یەکێکمان لەگەڵدابوو زۆردەورروخولی ئەداین و هەمیشە پیاهەڵئەداین گوایە ئێمە نوورانین، بەبێ ئەوەی مامۆستا نوورسی ئاگای لەمە بێت کەئەو لەقاتعێکی تر بەندکرابوو، نامەیەکی بچوکی کردبوو بەژێر قۆری چاوەو بۆی نووسیبوین ئاگاداربن ئەوکەسە سیخوڕی دەکات بەسەرتانەوە.

٢- عبدالمجیدی برا بچکۆلەی نوورسی زۆرخەمی بوو بمرێت و ژن ومنداڵی سەرگەردابن، مامۆستانوورسی پێی وت: خەمت نەبێت حەوت ساڵ دوای من ئەمریت،سەری حەوتەم ساڵ دوای وەفاتی نوورسی، عبدالمجید بەهاوسەرەکەی

وت: تەنها ئەمسالّم ماوە لەژیاندا، هەرواش دەرچوونورسی سالّی ١٩٦٠ کۆچی دوایی کرد عبدالمجیدیش سالّی ١٩٦٧ کۆچی دوایی کرد.

ماموّستا ئەحمەدی موفتی زادەش زەحمەتی زۆری چەشت بۆخزمەتی ئیسلام، مالّەکەی لانەوازانێك بوو بۆخۆی، هەرچی برادەچوو غازێکیان هەبوو بەردەوام دەسووتاو هەرکەس هەرچی هەبوایە پێی جێبەجێ دەکرد، بەماموّستایان وت: چەند مانگە ئەو غازە بەتالّەو ئیشیش دەکات، وتی: بەقوربانە کەس نەیکوژێنێتەوە ئەوە رزقی خوایە، جارێك برایەك بەناوی ماشەلاّ لەسنەوە سەرئەدات و ئاگرەکە ئەکوژێنێتەوە، ئەلّێن: بۆ کوژانتەوە؟دەلّێت: مەگەر ماموّستا نافەرموێت زیادەڕەوی

و ئیسراف مەکەن! ئیتر بەو شێوەیە ئەو رزقەبڕاو دانەگرسایەوە.(مامۆستا ئەمین لە مەڵبەندی یەکگرتوو شاهێد حاڵی ئەو مەسەلەیەیە کەخۆی لەوێ بووە ).

## دوای ئەوەی ئیسرائیلیەکان قەدەغەی راوە ماسیان کرد لەسەر خەڵکی غەززە

گشت ماسیەکان لە بەشی ئیسرائیل دوور کەوتنەوە تا ئەوەی لەسەر سنوری کەنارەکانی بەشی غەززە پەڕینەوە بێ ئەوەی کەس راویان بکات خۆیان گەیشتن بە ووشکانی!!!

ئەمە وای کرد راوچیەکان هەموو بەیەکەوە سوجدەی شوکر ببەن بۆ نیعمەتی (شۆڕشی ماسیەکان )

وەبەپێی هەواڵەکانی رۆژنامەی ( الرأی) کوەیتی لە یەك رۆژدا ماسیگرەکانی غەززە توانیان ٤٠٠ ماسی نایابی جۆری (وطواط البحر) راوبکەن

خوایەگیان هەر تۆ خاوەن دەسەڵاتی تەنها بە ( کن فیکون) ئەتوانی دونیا ئاوەژوو کەیتەوە.



## مامۆستا مەلا محمدی بەرزنجی:

رۆژی ٢٠١٥/٤/٢ لە یەکەم رۆژی کۆنگرەی زانستی جیهانی رێکخراوی الزاد العراقیە بۆ قیرائات لە ئوتێل تایتانیك کاك دکتۆر صباح بەرزنجیم بینی وتی:

سەرنەوی کەو بەتەنیٚ رێکە رێبواری عەزیز

نزمە دەرگای عەدەم وتەنگە گوزەر یاری عەزیز

دیارە پاش تەمەنێك لەم دونیایەدا کەوەك خەوە، ئەبیٚ کۆم بیتەوەوبچەمێیتەوە تا لەدەرگای دونیا دەرچیت بەتەنیا بەرەو قیامەت،ئەوەندەش دەرگاکە باریکە هەربەتەنیا دەبێت گوزەربکەی پیایدا.

ئنجا باسی جەنابی مامۆستای باوکی کردو وتی:

ساڵی ١٩٣٧شێخ نەجیبی باپیرم وشێخ رەشادی برای و شێخ قادری برای، (کەخەڵکی سەرگەت بوون )،لەگەڵ سی و حەوت کەسی تر بەند دەکرێن لە سولەیمانی لەسەر ئەوەی کە چەکیان هەڵگرتبوو دژی بەگزادەکان کە ئەو کاتە پیاوی رژێمی پاشایەتی بوون، لەناوبەندکراوەکاندا سەید عەتای چەتەو حەمە رەشید خانی بانەشی تیابووە کەدۆستی شێخ لەتیفی حەفید بووە.

شێخ عەلائەدینی بیارە کە خالۆزاو پورزان لەگەڵ باپیرمدا پێی راگەیاندن کەدوعای بۆکردوون و سجنەکە بشکێنن و راکەن. ئەوەبوو شێخ لەتیف دووکیلۆ شیرینیان بۆ دەنێریٚ کە دوو دەمانچەی لەژێرا دانابوو.

لە ١٩٣٧/٨/٢٢ سجنەکە دەشکێنن و رادەکەن بەرەو ئێران وئەچنە مەریوان.باپیرم لەودیو کچی حسێن خانی ولەژێر بەگزادەی فەتالی بەگی دێنیٚ.

باوکم ساڵی ١٩٤٥ لەدایك دەبێت وهەرلەمناڵیەوە دەیخەنە حوجرەو کە جزمی عەممە تەواودەکات مامۆستاکەی داوا لەم و هاوەڵەکانی دەکات کە

قورئانی سی جزمی ببەن بۆ دەرس خوێندن، دیارە ئەوزەمانە قورئانی گەورە زۆر کەمبووە بەتایبەت لەلادێ.

ئەوکاتە تەمەنی ماموستا مەلا محمد شەش حەوت سالێك دەبوو شەو خەو بەخۆشەویستەوە دەبینێ (د.خ)، کە قورئانێکی بەدەستەوەیەو منالان سەرەیان گرتووە بۆی، ئەمیش لەدوواوە دەبێت زۆرخەمی دەبێت کە قورئانەکە بدات بەم، بەهەرحاڵ ئاواتەکەی دێتەدی و کە دەگاتە بەردەم سەروەر قورئانەکەی ئەداتێ و خەبەری دەبێتەوە، ئەملا دەکاو ئەولا دەکات و بەدایکی دەڵێت: کوا قورئانەکەم؟؟ئەویش دەڵێت: قورئانی چی کوڕی خۆم دیارە خەوت بینیوە.

کەدەچێت بۆمزگەوت مەلا عارفی ولەژێر دەبینێت کەخەلیفەی شێخی بیارەبوو، وە زانایەکی خواناسی نەفس موزەکابوو،قورئانێکی بەدەستەوە دەبێت دەیداتێ و دەڵێت: ئەوە قورئانەکەی پێغەمبەر (د.خ).

## لەقەرەداغەوە:

من سەرم سوڕماوە لە بۆخواسوڵحاوی وژیری دوودایکی قەرەداغ پێش نزیکەی شەست ساڵێك، یەکەمیان: دکتۆر عەلی قەرەداغی دەڵێت: دایکم دەیووت: کوڕم هەمیشە دوعا بکە خوا بتکات بەخزمەتکاری دینەکەی!

دیارە کاریگەری دایکی وای لێکرد کە بەدەم خەویشەوە دەرسەکانی دەوتەوە، تا باوکی پێیوت: کوڕم واشمان نەوت!

دووەمیان: مامۆستا محمد عەلی قەرەداخی کەخزمەتێکی گەورەی کردووە بەکەلەپوری کوردی وجێدەستی دیارە دەڵێت: لەمناڵیمدا دەستم شکا، دایکم بە جەڕاحەکەی وت: باشی بۆمەگرەوە بانەتوانێت کاسپی بکات و خەریکی خوێندن بێت!

ئەبێ ئەو دوودایکە بەڕێزە خواناسە چی لەخوا پاڕابنەوە کوڕەکانیان ببنە چرای قیامەت بۆیان!دیارە دوعای دایکیش قبوڵە بۆیە کوڕەکانیان دوژمن پێش دۆست شایەتیان بۆ ئەدەن، خوای گەورە هەموولایەکمان عاقیبەت خێربکات و منداڵەکانیشمان بۆئێمە بکاتە چرای قیامەت..ئامین..

## بانگخوازێکی فرۆکەوان!

دکتۆر محمد موسی الشریف لەساڵی ١٣٨١ ی کۆچی لەمەدینە لەدایکبووەونەسەبی ئەگاتەوە بە پێغەمبەر دروودی خوای لەسەربێت وناوەکەی خۆی خەسارنەکردووەوئێستا تەمەنی (٥٨) ساڵە.

بەکالۆریۆسی لەشەریعەتدا هێناوە ٢٩ ساڵ لەمەوبەرو ئێستاش ماستەرو دکتۆرای هەیە لە کیتاب و سوننەتدا.زیاتر لە ٤٠ پەڕاوی بەسوودی

نووسیوەووتاربێژو ئیمامیشە لە مزگەوتی زەهەبی لە جەدەوئیجازەی ریوایەی حەفصی هەیە لەرێگای شاتبیەو تەیبەوەوئێستا دە قیرائاتەکە دەخوێنێت.

ناوبراو فرۆکەوانیشە لە هێڵی ئاسمانی سعودی و لەئەمەریکا فرۆکەوانی خوێندووە، لەچاوپێکەوتنێکداوتی: کاتێك لەفرۆکەوانی دەمخوێند لەئەمەریکا فرۆکەی بچوکیان ئەداینێ کەلەشارەکەمانەوە بۆشاری تری دەورووبەر لێی بخورین و مەدرەجی تایبەتی هەبوو کەلەنزیکیەوە بەنزینخانە هەبوو بۆ بەنزین تێکردن و لەهەمان کاتدا ئوتومبیلیش لەو بەنزینخانانە بەنزینیان تێدەکرد.

شەوێکی زۆرسارد کە دەبوو بچوومایە بۆ شارێکی تر بۆ بەنزین لەمەدرەجێك نیشتمەوە، هەرچیم کردو لەدەرگامدا کرێکاری بەنزینخانەکە خەوتبوو دەرگای نەکردەوەولەوە ئەچوو بەسەرخۆشی نووستبێت، منیش ئەوشارە نەشارەزابووم و هەرواسەرپێیی حسابێکی بەنزین و دووری شارەکەم کرد وتم: لەسەرخوا دەڕۆم بەشم دەکات، لەئاسماندا پێش ئەوەی بگەمە شارەکە گلۆپی سووری بەنزین هەڵی کردو دەنگی مەکینەکە گۆڕڕا، یاسای فرۆکەوانیش ئەوکاتە بۆئێمەی قوتابی وابوو، هەرکەس بەنزینی لێبڕایە و بەناچاری بنیشتایەتەوە لەبەعسەکەی بێبەش دەکراو ئەنێرایەوە بۆسعودیە..

بیرم لای داهاتوو بڕوانامەکەم بوو لەوپەڕی حاڵەتی ناچاریدا بووم، چارم نەما کەوتمە قورئان خوێندن و دوعاکردن، سوپاس بۆخوا گەیشتمە سەرمەدرەجی

دیاری کراوو شایەتمانی بەهەقم هێنا، بۆیەیانی کرێکاری بەرپرسی بەنزینی فرۆکەکان وتی: ئەوە چیت کردووە قەترەیەك بەنزینی تیانەمابوو؟ وتم: هەروازبێنە چیم بەسەرهات هەرخوا بەفەزڵ وکەرەمی خۆی پاراستمی و گەیاندمی!

شایانی باسە ساڵی ٢٠٠٧ لەفڕۆکەخانەی ئەستەمبوڵ بینیم کەئەویش سەفەری دەکردوهەندێ قسەم لەگەڵ کرد.

## گرنگی نیەتی خێر:

لەمزگەوتی مامۆستا فاخیر لەکەرکوك رەمەزانی ٢٠١٧ وتارم دا، خەمی کارەبام بوو لەبەر وتارەکەم کە بەداتا شۆ پێشکەشم دەکرد، مامۆستا وتی: خەمت نەبێت موەلیدەیەکی سەد کەیڤیمان هەیە و برادەرێکی موەلیدە فرۆش لەگەڵ خوای خۆیدا نیەتی هێنابوو کە ئەگەر ئەو موەلیدانەی هێناونی ساغی بکاتەوە یەك موەلیدە ببەخشێتە مزگەوت، خوای گەورە بەرەکەتی خستە بازرگانیەکەیەوەو ئەو موەلیدە سەدکەیڤیەی پێشکەش بەمزگەوت کرد!



## لەگەڵ بانگخوازێکدا:

لەبەر ئەوەی کاری ئیسلامی کارێکی پیرۆزە و بۆ خوایە، بۆیە دەبینین زۆر جار کاروکردەوە و سەر گورشتەی چاکی خواناسان کەس پێی نازانێ، هەندێ جاریش لەیاداشتنامەدا کەسێك بۆ مێژوو یان بۆ سوودگەیاندن بەخەڵکی، ڕووداو و هەڵوێستە جوانەکانی ژیان تۆماردەکات..

کاتی خۆی ئەگەر قوتابیەکی هوشیار و بلیمەت نەبوایە لە مەجلیسەکانی شێخ عبدالقادری گەیلانی دا، کەوتارەکانی شێخی بەپەلە دەنووسیەوە، ئەوا کتێبی ( فتح الربانی ) ڕووناکی نەدەبینی و ئەو هەموو قسە خێرە لەکیس دەچوون. بەهەمان شێوە ئەگەر قوتابیەکی شێخ ( منصور عویس ) نەبوایە ئەوا چەند لایەنێکی ژیانی ئەو پیاوە ساڵحە نەدەزانرار و هەروا لەناو دەچوو ...

ئەو قوتابیەش ( شێخ عبدالوهاب الفهد ) ە کە خەڵکی وڵاتی ( کوەیت ) ە و دەڵێت: شێخ منصور یەکێك بوو لەزاناکانی ئەزهەر، لەمیسرەوە هاتە لای ئێمە لە ساڵانی حەفتاکاندا و بوو بە مامۆستای مزگەوتەکەمان.

ئەم زانایە لەگەڵ ئەوەش کە دەست کورت و کەم دەرامەت بوو، ڕێزی زۆری لەقوتابی و میوانەکانی دەگرت و زۆر جار دیاری پێشکەش دەکردن، ڕۆژێك لەخزمەتیا بووم، هەندێ هەنگوینی لە ( میسر) ەوە بۆ هاتبوو ویستی بەشم بدات، جا لەبەر ئەوەی هیچی لەبەردەستا نەبوو کەتێی بکات بۆم، هەمووی دامێ، هەرچەند هەوڵمدا وەری نەگرم، تووڕە بوو زۆری لێکردم کەلەگەڵ خۆم بیبەم.

ڕۆژێ خواحافیزی لێکردین و گەڕایەوە بۆ میسر بۆ بەسەربردنی ئیجازەی ساڵانەی کە مانگێك بوو ... مانگەکە تەواو بوو دیارنەبوو بگەڕێتەوە، چەند مانگێکی تر تێپەڕی و سۆراخێکی نەبوو، بۆیە داوامان لەبەڕێوەبەرایەتی ئەوقاف کرد کە چاوەڕێ بکەن و فەسلی نەکەن لەکارەکەی تا هەواڵ دەزانین ...

هەرچۆنێ بوو فاکسمان کرد بۆ ماڵیان لە میسر، وەڵامیان داینەوە کەباری تەندروستی باش نیە بۆیە نەیتوانیوە بگەڕێتەوە،ئێمەش ناو بەناو ئەحواڵمان دەپرسی و هەر بە ئاواتەوە بووین بگەڕێتەوە لامان و لەخزمەتیا سوود مەندبین.

پاش ساڵێك هاتەوە لامان، کەس دڵی نەهات پرسیاری نەخۆشی یەکەی لێ بکات من نەبێ، کەلێم پرسی لەهۆی ناساغی و دواکەوتن و نەگەڕانەوەی وتی: کاتێك گەڕامەوە گوندەکەی خۆمان لە ( میسر) ئێوارەیەك بانگ کرابووین بۆ نانخواردن لە ماڵێکی ناسیاومان، پاش ئەومیوانداری یە هەستم کرد وەزعم تێکچوو، بۆبەیانی ویستم هەستم بۆ نوێژی بەیانی، هەرچیم کرد نەمتوانی، ئەتووت دیوارێك کەوتووە بەسەرماو جوڵەی لێبڕیووم..ویستم قسەبکەم، قسەم بۆ نەکرا، هەرئەوەنەبێ هاوارم دەکرد تا بێن بەلامەوە بەشێوەیەك کەکەس تێم نەدەگەیشت.

ژن و منداڵەکانم بەپەلە هاتن، کچەکەم و کوڕەکەم هەردووکیان پزیشك بوون، فەحصیان کردم و زانیان تووشی شەلەل بووم، بۆ دڵنیایی زیاتر بردیانم بۆلای باشترین پزیشکی قاهیرە، بەلاَم بێ سوود بوو، هەموو جەختیان کردە سەر ئەوەی کە تووشی شەلەلی هەموو ئەندامەکانم بووم، تەنها سەرم نەبێ ...

دەمبینی ژن و مناڵەکانم دەگریان، منیش لەناخەوە دەگریام بەبێ ئەوەی بێجگە لەخوا کەس پێم بزانێ و ئاگای لەحاڵم بێ.

خزمەتکارێکیان بۆ گرتم خزمەتم بکات و خواردن بکات بە دەممەوە و پاکم بکاتەوە، شەوو ڕۆژێکم بەساڵێك لێدەڕۆیشت، چەند مانگێکم ئاوا بەسەر برد، تەنها هیوام بەخوا بوو کە بێت بەهانامەوە.

شەوێکیان لەخەوما ڕووناکیەکی زۆرم بینی لەپشت دەرگای ژوورەکەوە ئەوەندەی پێنەچوو دەرگاکە کرایەوە و ڕووناکیەکە هاتە ژوورەوە، لەبەر زۆری ڕووناکیەکە نەمدەزانی چی لەپشتەوەیە.

لەپڕ کەسێك هات لەپشت ڕووناکیەکەوە و وتی: ئەوە پێغەمبەری خوایە (ﷺ) هاتووە سەردانت بکات ...ئنجا ئەو پیاوە وتی: ئەوە ( پرتەقاڵێك و مۆزێك و خورمایەك ) خۆشەویست (ﷺ) دەفەرموێت ئەوە دەرمانەکەتە.

منیش نەمتوانی وەری بگرم و بیخۆم، پیاوەکە وتی: من یارمەتیت دەدەم لەخەوڕاپەڕیم و بەدەنگە دەنگی من منالەکانم بەپەلە هاتن بۆلام، هەرچیم کرد دوو ڕۆژ نەمتوانی تێیان بگەیەنم چیم دەوێ.

باش بوو ژنەکەم دوایی تێگەیشت کە هەندێ میوەم دەوێ، میوەیان هێنا، تا باش بوو ئەوسێ جۆرەی تیابوو کە خۆشەویست (ﷺ)فەرمووی، کردیان بەدەممەوە و خواردم،کاتی چێشتەنگاوبوو ماوەیەك خەوتم کە هەستام هاوارم کرد لەخۆشیا، ژنەکەم هات بەپەلە کە بینیمی یەکسەر بورایەوە و کەوت کچەکەشم هات و سەرسام بوو، خوای گەورە بەفەزڵی خۆی بۆی کردم بە شیفا و چاك بوومەوە و ئەندامەکانی لەشم کەوتنەوە جووڵە.

کاتێك کچەکەم تەلەفونی کرد بۆ کوڕە پزیشکەکەم لەعیادەکەی و پێیوت: باوکم چاك بۆتەوە و بەپێی خۆی دەڕوات، بڕوای نەکرد و وتی بەم قسانە کاتم لێ مەگرە، چونکە خەڵکی زۆر سەرەیان گرتووە لەبەردەمی ژوورەکەمدا ... ناچار سوێندی بۆ خوارد، وتی: شتی وا ئەستەمە ببێ! کچەکەم پێی وت: ڕاست دەکەی لە ( منطق) ی عیلمدا ئەستەمە، بەلاّم ئەوەباوکمە لەبەردەممدا وەستاوە ...

بەپەلە عیادەکەی بەجێهێشت و هاتەوەماڵەوە کە منی بینی لەجێی خۆی وشك بوو، قسەی بۆ نەکرا، هەرئەوەندە نەبێ کە وتی:

( سبحان الله العظيم، وهو على كل شيئ قدير ).

ژنان هەلھەلەی خۆشیان لێداو، چاوەکانیش فرمێسکی خۆشیان ڕشت، هەمووان سوپاسی خوایان کرد ... کە چاك بوومەوە هاوسەرەکەم و منالەکانم وتیان: لای ئێمە بمێنەوە و مەگەڕێرەوە بۆ ولاتی کوەیت، منیش وتم: من بانگخوازم و کاری خۆم هەیە دەبێ بچم بەجێی بگەیەنم و تەواوی بکەم و لەقوتابیەکانم دانەبڕێم .

بەڵێ مامۆستا منصور چەند ساڵێك لەلامان مایەوە و ڕۆژانە ڕێنمایی خێری دەکردین ... تا بەیانیەکیان بۆ نوێژ ئامادە نەبوو، ناچار یەکێك پێشنوێژی بۆ کردین.

پاش نوێژەکە مجەوری مزگەوتەکە چوو بەرەو ژوورەکەی و لەدەرگایدا، کەس وەلامی نەدایەوە، پاڵی بەدەرگاکەوەنا، سەیری کرد شێخ منصور ئاوی دەستنوێژ لە ریشە سپیەکەی دەتکێ و هێشتا قۆڵی کراسەکەی دانەداوەتەوە و بەدانیشتنەوە لەسەر کورسیەکەی گیانی پاکی سپاردووە ... جا بەم ئاخر خێرییەوە دوور لەکەس و کاری بەغەریبی لەبەر خوا، بەدەستنوێژەوە لەچاوەڕێی نوێژی بەیانیدا گیانی سپارد و گەڕایەوە بارەگای ئەو خوایەی کەساڵەهابوو لەخزمەت بانگەوازەکەیدا بوو ... (گۆڤاری المجتمع ١٤٣٧/ ٤٤٥) عبدالحمید البلالي.

## متمانە بەخوا!!

بانگخوازێك دەڵێت لەفڕۆکەدابووم تاسەی هەوایی فڕۆکەکەی هێنابووە لەرزین زۆر ترسام وئارەقم کردبۆوەو دەستم لەسەردڵم بوو بەکوڵ دوعام دەکرد، بەتەنیشتمەوە منالێك دانیشتبوو سەرقاڵی ئایپادەکەی بوو هیچی بەخەیاڵدا نەدەهات، لێم پرسی ئەرێ ئەوە تۆناترسیت؟ وتی: نەخێر، فڕۆکەوانەکە

باوکمە! زۆر لەحاڵی خۆم تەریق بوومەوە، خۆزگە ئەوەندەی ئەو متمانەی بەباوکێتی منیش متمانەم بەخوا هەبوایە! ﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى الْعَزِيزِ الرَّحِيمِ (٢١٧) الَّذِي يَرَاكَ حِينَ تَقُومُ (٢١٨)﴾ الشعراء .

## دڵنیا بوون لە خوا




حومەیرای کچی مەودودی دەڵێت: وەفدێك لە فەلەستینەوە هاتن بۆ لای باوکم، پێش گەیشتنیان بە ماوەیەکی کەم زانیمان ئافرەتیشیان لەگەڵدایە، لای ئێمەش پیاوو ئافرەت تێکەڵ نابن، بۆیە بە پەلە ناو باخەکەمان چاککرد بۆ ئافرەتان و باوکم داوای لێکردین کە زۆر خزمەتی ئافرەتەکان بکەین و ڕێزیان لێبگرین.

وەرزەکە وەرزی باران بوو، کە کورسیمان داناو پەردەمان گێڕا هەورێکی ڕەش ئاسمانی داگرتبوو لەوەدا بوو بباریێت، زۆر خەمان بوو بە باوکمان وت: (ئەگەر باران باری بەسەر میوانەکاندا تووشی ئیحراجیەکی زۆر دەبین و بۆ کوێ ڕاکەین!) باوکم زۆر لەسەر خۆ وتی: (ان شاء الله باران ناباریێت) وتمان: (باوکە، وەرە سەیرکە، خەریکە دەباریێت)، باوکم دەنگی بەرز کردەوە وتی: (پێم وتن ان شاء الله باران ناباریێت).

پاش ئەوە بە چاوی خۆمان بینیمان هەورەکە بە ئاسماندا بلاوەی کردو جەوێکی زۆر خۆش دروست بوو، دوای ئەوەی میوانەکان ڕۆیشتن و شتەکانمان کۆکردەوە، هەور جارێکی تر کۆبووەوەو ئەو شەوە تا بەیانی باران باری.

ئنجا دایکم پێی وتین: (هەرگیز موناقەشە لەگەڵ باوکتان و نەنکتاندا مەکەن، گوێ بگرن و پەیڕەوی قسەیان بکەن، هەرچی بڵێن خوا بۆیان دەکات، مەگەر حەزرەت ﷺ نافەرموێت (مِن عباد الله مَنْ إذا أقسم على الله أبَرّه) ( رُبَّ أشعث أغبر لا تُفتح له الأبواب، إذا أقسم على الله صدقه الله).

## مسوڵمانانی حەبەشە

دکتۆرعبدالله موسڵێح لە وتاری(أمةلاتزول)دا وتی: موسوڵمانانی حەبەشە (أثیوبیا)، چەندەها ساڵ گیریان خواردبوو بەدەست دیکتاتۆر هیلاسیلاسیەوەکە بەئاگروئاسن سەرکوتی دەکردن ولەبەردەم کۆنگرسی ئەمریکیشدا بەشانازیەوەباسی هەوڵی لەناوبردنی ئیسلام وموسوڵمانانی کرد، ئەونەماو مەنگستۆی کۆمۆنیست هاتەجێی، بارو وەزعەکە هەروەك خۆی بوو، تا ساڵێکی بێبارانی هات و گاورەکان چوونە لای مەنگستۆو داوایان لێکرد کە ڕێیان بدات بە کۆمەڵ دوعا بکەن بۆ بارانبارین ئەویش ڕێی دان و چەند ڕۆژ دوعایان کردو هیچ نەباری، ئنجا شێخ محمد سعید بەنوێنەری موسوڵمانان چووە لای ناوبراوو داوای لێکرد ڕێیان بدات بەکۆمەڵ نوێژی بارانبارین بکەن، ئەویش ڕێی دان و لەسایەی خواوە پاش ماوەیەکی کەم بارانێکی باش باری، ئەمەش پشتگیری خوابوو بۆ موسوڵمانان و بەمەش بارو وەزعیان گۆڕدراو، ڕێیاندان کەمزگەوت دروست بکەن و مەجلیسی باڵای کاروباری ئیسلامیشیان دامەزرێنن..

***

## بارانێک پاش دوعای حاجییان



شێخ عباس سیسی کە یەکێکە لە برا دێرینەکانی برایانی میسر ولەم ساڵانەی دواییدا وەفاتی کرد، لەیادەوەریەکانیدا دەڵێت: لەساڵی (١٩٤٣)دا کەوتمە نووسینی یادەوەریەکانم و بەیانیەکیان نووسیم: ئەمڕۆ هەستام بۆ نوێژی بەیانیو ڕووم کردە کەعبەی پیرۆز قیبلەی موسوڵمانان، ویستم وەسفێکی کەعبە بکەم هەرچیم کرد هیچم بۆ نەهات چونکە کەعبەم نەدیبوو، هەروەك دەنگێك پێم بڵێ: ئەی باشە بۆ ناچی بۆ حەج و بەچاوی خۆت کەعبە ببینی، بڕیارمدا بچم بۆ حەج و خوای گەورەش ئاسانی کردو هەر ئەو ساڵە گەیشتمە ئاواتی خۆم و حەجم کرد.. کە لەوێ بووم چەند ساڵێك بوو باران نەباری بوو لەوڵاتی سعودیە، بۆیە مەلیك عبدالعزیز ئال سعود داوای لە حاجیان کرد کە نیو ملیۆنێك دەبوون لەسەر کێوی عەرەفە کە نوێژی بارانبارین بکەن، دوای ئەوەی نوێژەکە کرا لە گەڕانەوەماندا بۆ موزدەلیفە بارانێك باری کە دەشت و دەری تێرئاو کردو ئەوەندە زۆر بوو تەنانەت ڕێگاوبانەکانی تێکدا..

***

## نموونەیەک لەکوردستانەوە

سالێکیان کوللەیەکی زۆر هێرش دەهێنن و دائەبارێن بەسەر کشتوکاڵی زۆر ناوچەی کوردستاندا، بەتایبەت دێهاتەکانی قەرەداغ.

لەدێی (بەردیٚ) ی قەرەداغ، خەڵکەکە تەواو شپرزە دەبن ودێنە لای سەعید ناوێکی شێتۆکەو و دەڵێن: کوللەدای بەسەر کشتوکاڵی دێهاتی دەوروبەرداو هیچی نەهێشت و وا بەرەو ناوچەکانی ئێمەش دێن، ئەویش وتی: هیچ کوللەکان خوایان خوارد؟

وتیان نەخێر. وتی: خۆ خوا ماوە؟! وتیان: بەڵیٚ، وتی: دەخوا کەریمە.

ئەوانەی کە ئاگایان لەم مەسەلەیەیە دەڵێن: خوا ئاگادارە کوللە نەگەیشتە کشتوکاڵی ئەم و بەبەرەکەتی ئەو (حسن الظن) ە بەخوا، رزگاری بوو تەنانەت بەروو بوومی لەساڵانیش زیاتر بوو..

## جەنابی شێخ عومەری بیارە:

لەم کوردوستانەی خۆماندا کەسایەتی گەورەو مەزن کاریان کردووە کە هەردەم مایەی شانازین بۆ ئێمەی بانگخوازو ئەرکی سەرشانمانە باسی هەڵوێست وژیاننامەی پڕبەرەکەتیان بکەین، یەکیٚ لەو بۆ خوا سوڵحاوانە جەنابی شێخ عومەری بیارەیە بەرەحمەت بێت.

حاجی ئەحمەد غەفور دەڵێت: جەنابی شێخ عومەر لە برایەکی زویر دەبێت و دەچێتە شاری سنە و چی دۆستان و خزمان تەنانەت مەولەوی تکاو رجای لێدەکەن ناگەڕێتەوە، بەیانیەکیان بەهاوسەرەکەی دەڵێت: خۆت ئامادەبکە دەگەڕێینەوە، ئەویش دەڵیٚ: ئەوهەموو کەسە تەکلیفیان کرد قایل نەبووی، ئێستا

خێرە وا بڕیارت دا بگەڕێیتەوە؟ئەویش وتی: ئەمشەو خۆشەویستمان(د.خ) فەرمانی پێدام بگەڕێمەوە دەرس بەمناڵانی بیارە بڵێم.

پاش ئەوەی گەڕایەوە جاری واهەبوو سێسەد قوتابی زیاتری هەبووە.



سوڵتان عبدالحمیدیش خۆشەویستمان (د.خ) لەخەودا فەرمانی پێدەدات کە کتێب بنێرێت بۆ مەدرەسەکەی بیارە کەکتێبەکان دەگات شێخ عومەر بەپێی پەتی و بەسەری رووت ئەچێت بۆ پێشوازی کتێبەکان کەچەند باری ئێسترbوون. خوای گەورە لەوانیش و لە ئێمەش خۆش ببێت و لەژێر بەیداخی رەسولی نازداردا حەشرمان بکات...ئامین.

## لەبەرەکاتەکانی قورئان



شێخ ئیبراهیم مەشهەدانی زانایەکی بواری قیرائاتی قورئانی خەڵکی موصڵەو ئێستا لەسلێمانی دائەنیشێت وتی: مۆڵەتی حەوت قیرائەتەکەم هەبوو بیستم شێخ موحسین ناوێك لەبەغدا مۆڵەتی ئەو سێ قیرائاتەی تر ئەدات، منیش بەبێ ئەوەی عینوانی بزانم هاتمە بەغداو لەمزگەوتێك نوێژم کرد،دوای نوێژ بەوی تەنیشتم وت: هاتووم بۆلای شێخ موحسینێك ناونیشانی پێنازانیت، ئەوەی سەیرە

وتی: من شێخ موحسینم.وتم: هاتووم لەموسڵەوە بۆ مۆڵەتی ئەو سێ قیرائاتە. وتی: کەی دەتەوێت من لەخزمەتدام. بەوجۆرە خوا شێخ موحسینی هێنایە بەردەستم بەمەرجێك ئەوە مزگەوتی ئەو نەبوو بەقەدەری خوا هاتبوو لەوێ نوێژبکات.

## حافزێکی قورئان

ئەم زاتە کە ناوی ( حافظ علي )یە هەموو قورئانی پیرۆزی ئەزبەرە، کاتی خۆی کە لەتەمەنی گەنجی دا ویستوویەتی لەتورکیا بچێتە ئەڵمانیا، لەو ماوەدا سێ جار لەخەودا بە خزمەت بدیع الزمان مامۆستا سەعیدی نوورسی گەیشتووە و هەر لەخەوەکەدا مامۆستا نوورسی هەر سێ جارەکە پێ ی فەرمووە کە نابێت تۆ بڕۆیت بەڵکو دەبێت بچی خزمەتی قورئان بکەیت، ئینجا کاتێك ڕۆشتووە حکومەت گرتوویەتی و بەبەندکراوی ناردوویەتی بۆ ئیسپارتە جا لەوێ بەخزمەت مامۆستا سەعیدی نوورسی گەیشتووە، دوای ئەوە دەستی کردووە بە خزمەتکردن و بڵاوکردنەوەی ( پەیامەکانی نوور ).



## نوورسی و یارمەتی پەروەردگار

١- نوورسی بەرەحمەت بێت لە بارەی ئەزموونی خۆیەوە لەم بوارەدا دەڵێت:
من تا ئێستاش سەرسامم چۆن توانیم پاش چەند ڕۆژێکی کەم هەڵبێم لەدەست ڕووسەکان، نازانم چۆن توانیم بەپێ ئەو هەموو ڕێگایە ببڕم لەماوەیەکی کەمدا کە بە ساڵێك نابڕێت!! بەمەرجێ زمانی ڕووسیشم نەدەزانی، ڕزگارم بوو لە دیلی بە شێوەیەکی سەیری سەر سوڕهێنەر بەفەزڵ و یارمەتی خوا کە فریایی منی داماوو بێدەسەڵات کەوت و، گەیشتمەوە ئەستەنبوڵ لە ڕێی وارسۆ و ڤییەناوە.

٢- نوورسی زۆر گرنگی دەدا بە نوێژەکانی و حەزی دەکرد هەرکەبانگی دا نوێژەکەی بکات، جارێك لەگەڵ هاوەڵانیدا پێنج خولەکی مابوو بگاتە ناو شار بانگی دا، داوای لە هاوەڵانی کرد یەکسەر نوێژەکەیان بکەن و دوای ئەخەن تادەگەنە ناو شار..

جارێك کەلەپچەی لەدەستا دەبێت و دوو پۆلیس لەگەڵیا دەبن دەیبەن بۆ شاری بەتلیس، لەڕێگا بانگیدا، مامۆستا داوای لێکردن کەلەپچەکەی بکەنەوە بۆ ئەوەی نوێژەکەی بکات، پۆلیسەکانیش بە قسەیان نەکرد، پاش تۆزێك بینیان کەلەبچەکەی کرایەوەو هەڵیدایە بەردەمیان و نوێژەکەی کرد!! پۆلیسەکان سەریان سوڕماو زانیان ئەوە کەرامات بوو خواپێی دا، بە مامۆستایان وت: تا ئێستا ئێمە پاسەوانی تۆ بووین ئیتر ئێمەخزمەتکارتین!!

جارێك لێیان پرسی چۆن ئەو کەلەپچەیە کرایەوە؟؟ وتی: منیش نازانم، بەڵام دیارە کەرامەتی نوێژ بوو!

٣- چەندجار لەکاتی بەندیدا ژەهریان بۆ کردە ناوخواردنەوە بە تایبەت لە بەندیخانەی ئەفیون، خوای گەورە پاراستی.(سایتی قدوة.کوم) وتارێکی محمد موسى الشريف لەبارەی نوورسی یەوە..

٤- لە کاتی شۆڕشی ئیتحادو تەرەقیدا بەسەر خەلافەتی ئیسلامیدا، نوورسی و پیرەمێرد کە لەو کاتەدا لە تورکیا بوو، دەگیرێن و لە بەندیخانە توندیان دەکەن، هەردووکیان بڕوا ناکەن بە ئاسانی ڕزگاریان بێت، چونکە لەو باروزروفە شێواوەدا بە سەدان کەس هەڵدەواسران و دەکوژران، دیارە نوورسی کارێکی مەزنی لەسەر شان بوو کە ئەویش پاراستنی ئیمان بوو،خوای گەورە ئیرادەی وابوو کە بیهێڵێتەوە بۆ ڕوو بەڕووبونەوەی ئەتاتورك و دەستەودایرە فاسیدەکەی، شەوێك نوورسی خەو بە کاك ئەحمەدی شێخەوە دەبینێ کەمژدەی ڕزگاربوونی ئەداتێ ودڵنیای دەکات، ئەویش بەیانی خەوەکە بۆ پیرەمێرد دەگێڕێتەوەو پاش ماوەیەك بە فەزڵی خوا ڕزگاریان دەبێت.

پیرەمێرد ئەم بەسەرهاتەی بە چەند دێڕێك هۆنراوە بۆ تۆمارکردووین لە دیوانەکەیدا لاپەڕە (١١٢) کە دەڵێت:

کاك ئەحمەدەکەی خۆشەویستی خوا
زۆر کـەس بـەسـایـەی تـۆوە نان ئەخوا
لەوانە زیاتر من تۆم خۆش ئەوێ
هەر تۆی سەربەرزی قەومەکەت ئەوێ
کە لە زیندانیان تێك خزاندبووین
ســـێدارەیان بۆ داچــەقــانـدبـووین
تۆ چووبـــــوویتە لای بدیع الزمان
مژدەت دابـوویە بـە ژیـان و مـــان
فەرموبووت ئێوە نامرن ئەمێنن
تـــاسـەر ئـازادی گـــەلـتان ئـەبینن

خۆ مـن بـاوەڕم بـەوە کـردووە

بـەوەسـیـەت نـاوی ئــەوەم بــردووە

بـــەڵام وا ئـــەمـــرم بـــەو ئـــاواتەوە

بـشمـرم گـۆڕم دەنـگ ئـــەداتـــەوە

## صلاح الدین و پاراستنی پەروەردگار

چەندەها جار صلاح الدین تووشی مەوقیفی خەتەرناك بووەو بە هەموو حسابێکی بەشەری ئەبوایە تیابچوایە کەچی خواپاراستی تابمینیٚ بۆ فەتحی قودس، لەم بارەیەوە خۆی دەڵێت: (لقد أشرفنا علی الهلاك غیر مرة وما أنجانا الا الله لأمر یریده هو سبحانه)..

نەخۆش دەکەوت وبە ئازارەو لە جێگادا بۆی دەکەوت، کاتیٚ دەچوو سوپاکەی بەسەر بکاتەوەوسواری ئەسپەکەی دەبوو ئازاری نەدەما..

***

## دکتۆرێک لە نیوە شەودا

بانگخوازێکی میسری دەڵێت: جەندرمەکانی حکومەت شەوێك ئەدەن بەسەر ماڵی بانگخوازێکداو ڕاپێچی دەکەن بۆ بەندیخانە، دیارە هەرچیش گیرا مەگەر خوا بزانێت کەی وچۆن ڕزگاری دەبێت؟؟!!

ئەو شەوە منداڵە بچووکەکەی زۆر نەخۆش دەبێت و تایەکی قورسی لێدێت، هاوسەرەکەی بەو نیوە شەوە لەبەرهەژاری و بێکەسی دەستی بەکەسدا ناگات، سەعات دوانزەی شەو لە دەرگاکەیان دەدرێت، کە دەیکاتەوە دکتۆرێکە سەلام دەکات و دەڵێت: کوا نەخۆشەکەتان؟؟ ئەویش منداڵەکەی بۆ دێنێت، فەحسی دەکات و هەندێ دەرمانیشی دەداتێ، چاوەڕێ دەکات هەقی فەحسەکەی بداتێ، ژنەکە دەڵێت: بەخوا هیچمان نیە بتدەینێ و، مێردەکەشم گیراوە..

ئەڵێ: ئەی تۆ تەلەفونت نەکرد؟ ئەمە شوقەقەی ژمارە چەندە؟

دوایی بۆی دەردەکەوێ دراوسێکەیان نەخۆشیان هەبووەو تەلەفونیان بۆ کردووەو ئەم بە قەدەری خوا شوقەکەی لێتێك چووە بۆ ئەوەی چارەسەری منداڵەکەی بۆ بکات! دکتۆرەکە ئەوەندە پیاو دەبێت لەبەرخوا مانگانەی بۆ دەبڕێتەوە تا مێردەکەی بەردەبێت! جا ژنەکە هەر کاتێ هیچیان نەبوایە بۆ خۆشی بە مێردەکەی دەوت: ناشیەن بتبەن بەندت بکەن و خوا دەروومان لێبکاتەوە

**﴿أَلَيْسَ اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ وَيُخَوِّفُونَكَ بِالَّذِينَ مِنْ دُونِهِ وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ وَمَنْ يَهْدِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ مُضِلٍ أَلَيْسَ اللَّهُ بِعَزِيزٍ ذِي انْتِقَامٍ﴾ الزمر:٣٧.**

***

## شۆفێری تەکسیەک

دەوڵەمەندێکی هەولێری هەمووساڵێك پارەی زەکاتەکەی دەکات بەخانوویەك و دەیدات بەهەژارێك، ئەمساڵ ۲۰۱۷هەندێ پارە ئەدا بەچەند هەژارێك و شەیتان ئەچێتە بن کلێشەی کە زرووفەکە باش نیەو پێویست ناکا خانوو بۆکەس بکات و لەجیاتی ئەوە پارە بەسەر هەندێ هەژاری تردا دابەش بکات کافیە!

شەوێ خەو بەخۆشەویستەوە دەبینێ دروودی خوای لەسەر کەلەگەڵ هاوەڵاندا دانیشتووەو بەم دەفەرموێ: بڕۆ لەماڵی ئێمە بەتانیەك بهێنە، ئەچێ لەماڵیان بەتانیەك دەهێنێ و هەموو سەحابە سبحان الله یان کرد کەئەوەیان بینی، ئنجا فەرمووی: بڕۆ لەو ماڵەی ئەودیو بیدە بەو دوومناڵەدا.کەچووکوڕوکچێکی مناڵی دوانەبوون ودایپۆشین.

بۆبەیانی کەچوو بۆنوێژ شۆفێری تەکسیەکی بینی کەپێشتر ئەوی لەخەیاڵدا بووخانووی بۆبکات، وتی: فریام کەوە وەزعمان زۆر خراپە لەخانوویەکدا کرێچی پیرەژنێکم کە موەلیدە بێت نایەڵێت موبەریدە دابگرسێنین چونکە بەش ناکاو هەڵدەستێتەوە ودوومناڵمان هەیەوئەمشەو من ودایکیان هیناومانن وبردوومانن لەگەرمادا خەویان لێنەدەکەوت، ناچارم بچمە دەرەوەی شار دووهۆدەی هەرزان بگرم!دەوڵەمەندەکەش سەردانیان دەکات و دەڵێت: خەمت نەبێت، مناڵەکانت دوانەن و کوڕوکچن دەڵێت: بەڵێ.

کەسەردانیان دەکاو دەیانبینێ ڕێك ئەوە بووە کەلەخەوەکەدا بینیونی! دەوڵەمەندەکە دەڵێت:چیت کردووە وا خەوێکی وام دیوە پێتەوە؟ وتی: ئەمشەو تابەیانی لەخوا پاڕامەوە دەرگایەکمان لێبکاتەوە.ئیتر خانوویەکی لەسەر فەرمانی خۆشەویست بۆدروست دەکاو رزگاری دەکات لەو وەزعە. جا بەندەش لەوە سەیرترم لایە، دڵنیا بن لەو بەسەرهاتانە زۆرن و بۆ پەند وەرگرتن ئەوەشم

بۆتۆمارکردن لەدەمی ( مامۆستا فاتیح شارستێنی )یەوە.

﴿ أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاءَ الْأَرْضِ أَئِلَهٌ مَعَ اللَّهِ قَلِيلًا مَا تَذَكَّرُونَ ﴾ النمل: ٦٢.

## بەسەرهاتێکی پڕ لە پەندو عیبرەت!



سوعاد نصر ئەکتەرێکی بەناوبانگی میسریەوپاش چەند فلیم وکاری شانۆ لەیادی لەدایکبوونی ٥٤ یدا شەوەکەی لەخەویا ئەو پێڵاوی سەرفەرشەی لەماڵدا لەپێی دەکات لێی دەکەوێت، باوکی کە پێشترمردووە لەخەوەکەیا پێڵاوەکەی ئەداتەوەو بەیەکەوە ئەچنە ژوورێکی بچوکەوەو حەوت رۆژ لەگەڵیا دەمێنێتەوەو ئەم داوای لێدەکات ژوورەکەی بۆ گەورە بێت.جا شەوی داهاتوو سەعات دەی شەو ئەم خەوە بۆ شێخ سەید حەمدی ئەگێڕێتەوەو ئەویش بەوە بۆی تەفسیردەکات کەموسیبەتێك دەبێت وهانی ئەدات لەسەر تەوبە، ئەمیش دەڵێت: من قورئان و پێغەمبەرم خۆش دەوێت و ئەمەوێت ژیانم بگۆڕم! بۆسبەینێ ئەچێتە خەستەخانەیەکی قاهیرە بۆ ئەوەی چەوری زیادەی بۆلابدەن، بەهۆی هەڵەی تەخدیرەوە تا ساڵێك بێهۆش دەبێت و لە ٢٠٠٧ دا دەمرێت.

بەڕاستی ئەم بەسەرهاتە گەلێك پەندوئامۆژگاری تیایە:

١- خەڵکی هەموو خێریان تیایەو ئەوەتا هونەرمەندێکە حەزدەکات ژیانی بگۆڕێت و قورئان و پێغەمبەری خۆش دەوێت.

٢- خوا کە زانایە بەغەیب و شەهادە ئەوەندە میهرەبانە بەوخەوە ئاگاداری دەکاتەوە کەمردنت نزیکە فریای خۆت بکەوە.

٣- مردن لەناکاودێت و هەموونەوانەی لەسەرقەبرانن بەتەمای سبەینێ بوون وەك من وتۆوپێی نەگەیشتن.



## پشت بەخوا ببەستن:

قورئان (٤٤) جار وشەی پشت بەستن بەخوای هێناوە بۆنموونە:

﴿ وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا ﴾ الطلاق:٣.

﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى الْعَزِيزِ الرَّحِيمِ (٢١٧) الَّذِي يَرَاكَ حِينَ تَقُومُ (٢١٨) وَتَقَلُّبَكَ فِي السَّاجِدِينَ (٢١٩) إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾ الشعراء.

مەسەلەی پشت بەخوابەستن ئەکەوێتە سەر متمانەی ئەوکەسە بەخوا، ئەگەر مرۆڤ بەچاکی و بەڕاستی خوا بناسێت و گەورەیی ودەسەڵاتی بێپایانی خوا بخاتە بەرچاوی زیاتر دڵنیا ئەبێت لەپشت بەستن بەخواو لەهیچ شتێك ناترسێت..بۆنموونە ( ولله المثل الاعلی)ئەگەر مێروولەیەك پەنا بەتۆ بگرێت و تۆش مەبەستت بێت و پەنای بدەیت، ئایا ئەگەر چل مێروولەش بێن بۆی و بیانەوێت زیانی پێبگەیەنن هەقە بترسێت؟؟ دیارە نەخێر چونکە تۆ زۆر زۆر بەئاسانی ئەتوانی بیپارێزیت.

## نزای نزاکەران!

دڵنیابن خوا غافڵ نیە ئاگاداری نزای نزاکارانە ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴾ البقرة: ١٨٦.

ئافرەتێك لەبالیسان مێردەکەی مردووەو چەند منالێکی هەیەو کوڕێکی نوقسانە!شەوێك زۆردەپاڕێتەوە لەخوا کە هەرچۆنێك بێت سەقفی خانووەکەی تێبکات! شەو لەخەویدا پیاوباشێکی سپی رەنگی جل سپی ئەبینێت لەحەوشەو پێی دەڵێت: تۆ بۆئەوەندە خەمی ئەوخانووەتە، حەوزێکیشت بۆ ئەکەین، ئەڵێ: حەوزم ناوێت تەنها سەقفەکەیم بۆ تێبکرێت هیچم ناوێت. ئەڵێت: ئەویشت بۆ دەکەین، کاتێك ژنەکە ئەیەوێت هەنگاوبنێت بەرەو لای دیارنامێنێت.

بۆبەیانی برای خۆشەویستم حاجی ئازاد کە پێشتر ناوی ئەو ماڵەی پێوترابوو کەموحتاجن، خۆی و هاوسەری لەهەولێرەوە ئەچن بۆ ئەو ماڵەو ئەیدۆزنەوە و کەسەیری وەزعە دەکات بەیارمەتی خێرخوازان خانووەکەی بۆ تەواودەکات. ئەوەی سەیرە دواجار کەئەچێتەوە بۆ سەردانیان سەیردەکات حەوزێکیشیان لە حەوشەکەدا دروست کردووە، ئەڵێ ئەو حەوزە چیە؟، ئەڵێن:بلۆك و مەواد مابۆوە حەزمان کرد ئەو حەوزەی پێدروست بکەین. ئنجا کەژنەکە خەوەکەی بۆ کاك حاجی گێڕایەوە زۆردڵی خۆش بوو کەخوا ئاوا مژدەی پێداوەو ئەو رەمزەی پێداوەوئاواش هاتە دی!

***

## بەڵێنەکانی خوا دێنەدی ئەوەتا بەچاوی خۆتان ببینن!

حەزرەتی ئیبراهیم سەلامی خوای لێبێت دوعای کرد:

﴿ رَبَّنَا إِنِّي أَسْكَنتُ مِنْ ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِنْدَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُوا الصَّلَاةَ فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ وَارْزُقْهُمْ مِنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ﴾ ابراهيم:٣٧. ئەی پەروەردگاری ئێمە، من هەندێك لەمنداڵەکانم نیشتەجێ کردووە بەفەرمانی تۆ لەشیوودۆڵێکی قاقڕی بێ مووچەو مەزرا، لەلای ماڵەکەی تۆ کە راوی مەلان و هەڵکەندنی داران وگیایان وشەڕوشۆڕت تیایدا حەرامکردووە، ئەی پەروەردگاری ئێمە تاکونوێژێ بکەن، جا دڵانێکی خەڵکیان بۆ راکێشە تا بۆلایان بێن، لەمیوەجات وبەروبوو بەهرەمەندیان بکە، بەڵکو شوکرانە بژێری بکەن.

قورئان ئەم دوعایەی تۆمارکردووە، کە چەندهەزارساڵ پێش ئێستا کراوەوتەنها خوا دەیزانێت، ئنجا قبوڵبوونی ئەو دوعایە موعجیزەیە، ناوچەیەکی گەرمی بێ بارانی وشکی بیابانی لەهەرچوارقوڕنەی دونیاوە لەدۆڵو شیوی زۆرزۆر دوورەوە لەهەزاران کیلۆمەترەوە موسڵمانان دێن بەرەو ماڵی خواو بەڵێنەکەی خوادێتە دی کەهەزاران ساڵ پێش ئێستا داویەتی بەئیبراهیم ﴿ وَأَذِّنْ فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِنْ كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ ﴾ الحج:٢٧. جا بەردەوام هاتنە دی ئەو پەیمانە بەدرێژایی هەزاران ساڵ موعجیزەیەوتەنها لەدەست خوادێت، جاوەك ئەوە هاتەدی پەیمانەکانی تری خواش بەهەمان شێوە دێنەدی، دڵنیابن!

***

## لەمردنە سەیرەکان:

- مامۆستا عبدالخالقی رووناکی لەهەولێر دەڵێت: لەم ساڵانەی رابردوودا لەعومرە لەتەوافی ویداعدا پیاوێکی خەڵکی سولەیمانی دەگریاو دەیووت: خوایە وانەهاتووم برۆمەوە! منداڵەکانیشی دەیانویست بەزۆر بیبەنەوەو پێیان دەوت: پاصەکەو جەماعەتەکەمان چاوەڕێی ئێمەن و دەبێت زوو برۆین، بەهەرحاڵ کەبردیانەوە لەبەردەم دەرگای ئوتێلەکەیاندا گیانی سپاردو خوا ئاواتەکەی هێنایە دی..

- کاك تاریقی دراوسێم وتی: ١٩٨٩/٤/٤ باوکم سەعات شەشی بەیانی تەلەفۆنی بۆهەموو خوشك وبراکانم کرد کەبچین بۆلای، دووڕۆژی مابوو بۆ رەمەزان، بریاری دابوو ئەو رەمەزانە هەمووی لەمزگەوتی گەورە نوێژبکات و ماڵیان لای خەستەخانەی جمهوریەکەبوولای نیقابەی جاران.

کەچووینەلای لەسەرقەرەوێڵەیەك شانی دایابوو چای دەخواردەوە و زۆری حەزلێبوو، داوای چایەکی تری کردو وتی: نەك لەودونیا چای لێنەبێت.هەندێ ئامۆژگاری کردین و وتی: خەوم دیوە کە خۆرهەڵات دەمرم...وتم: باوکە خەوی چی؟ ئەگەر ناساغی با بتبەین بۆخەستەخانە،وتی: هیچم نیە وساغ و تەندروست.. خواشایەتە هەرئەوەندە خۆر هەڵات، لەزمان کەوت، بردمان بۆخەستەخانە دکتۆر نیهاد ئەبتەر بینی:وتی: جەڵتەی دەماخەو، دوای دووسەعات کۆچی دوایی کرد.

## هەموو ناونیشانەکە بڵێ!!

ساڵی ٥٦٥ی کۆچی نورەدین زنکی لە کۆڕی فەرموودەخوێندنەوەبوو، فەرموودەیەك دێتە پێشەوەکەهەر لەخۆشەویستەوە دروودی خوای لەسەر هاتووەو بەزەردەخەنەوە باسدەکرێت و وەردەگیرێت،کەچی نورەدین گرژو مۆن بوو،

لێیان پرسی بۆ ئاوا بێتاقەتیت، وتی: شەرم دەکەم لەخوا پێبکەنم و موسڵمانان لەدمیاط ی میسر خاچپەرستان ئابڵوقەیان داون. بۆ شەوێ ئیمامەکە خەودەبینێت بەخۆشەویستەوە کەپێی دەفەرموێت: مژدەبدە بەنورەدین کەخوا ئابڵوقەکەی لەسەر شاری دمیاط هەڵگرت، ئیمامەکەش دەڵێت: ناونیشانێکم بدەرێ تابڕوام پێبکات: ئەویش دەفەرموێت:بڵێ بەناونیشانی سوژدەکەی تەل حاریم کەتیایا وتی: خوا دینەکەی خۆت سەربخە و نوورەدین سەرمەخە، نوردەینی سەگ چیە تۆ سەری بخەیت!

لەسەحەرا کە ئیمامەکە دێت بۆمزگەوت نورەدین دەبینێت بەسواری ئەسپەکەیەوەیەتی و دێت بەرەو مزگەوت، خۆش و چۆنی لەگەڵ دەکات و دەڵێت: خۆشەویست مژدەی بۆناردوی کە موسڵمانانی دمیاط ئابڵوقەکەیان لەسەرنەما،منیش داوای ناونیشانم لێکرد، فەرمووی:بەناونیشانی ئەو سوژدەکەی تەل حاریم کەتیایا وتوتە: خوا دینەکەی خۆت سەربخە و نوورەدین سەرمەخە، نوردەین چیە تۆ سەری بخەیت!حەزم نەکرد وشەی سەگەکە بڵێم،نورەدین وتی: ناونیشانەکە بەتەواوی بڵێ!ناچار وشەی سەگەکەشم وت: ئنجا دابەزی وسوژدەی شوکری بۆخوابرد!

ئیمامەکە ئەڵێت:بەرواری ئەو شەوەم لای خۆم تۆمارکرد، دواتر کەهەواڵمان پێگەیشت رێك لەوشەوەدا موسڵمانان ئابڵوقەکەیان لەسەر نەمابوو (لا ١٣٧/مختصر كتاب الروضتين في أخبار الدولتين /أبي شامة).

***

## بەسەرهاتێکی راستەقینە

دکتۆر حوسام موافی پزیشکە لەخەستەخانەی قصر العینی لەمیصر دەڵێت:داوام لە زانایەکی گەورە کرد کە باشترین پەرستش چیە بیکەم تاخوا لیم رازی بێت؟ وتی: دڵنەوایی خەڵك بەتایبەت کەتۆ پزیشکیت و مامەڵە لەگەڵ نەخۆشدا ئەکەیت. بۆسبەینێ کە لە خەستەخانە دەرچووم وخەریکبوو بگەمە سەرشەقامی میحوەر کە بەنیو سەعات لەبەر قەرەباڵغی لێی دەرناچیت، تەلەفونێکم بۆهات، کەسێك وتی: دکتۆر گیان باوکم لەخەستەخانە لاتانە خۆزگە سەردانت بکردایەو دڵنەوایت بکردایە..

گەڕانەوەکەم زەحمەت بوو، بەڵام کە وتی: دڵنەوایی ئامۆژگاریی زاناکەم بیرکەوتەوەو لەبەر خوا گەڕامەوە خەستەخانەو سەردانی نەخۆشەکەم کردو دڵنەوایم کرد، لەوەدابووم و لەپڕ حاڵەتێکم بۆهات زانیم جەڵتەیە خێرا کارمەندەکانم بانگکردو رێنماییم کردن چیم بۆبکەن، زۆرلام سەیربوو خۆمن هەموو فحوساتێکم کردووە ئەم جەڵتەیە چیە لەناکاو بۆم هات، خوای گەورە بەمیهرەبانی خۆی بەو کارە چاکە پاراستمی و هەرزوو پاداشتی دامەوە بکەوتمایەتە ئەو قەرەباڵغی ترافیکەوە چی رزگاری دەکردم جەڵتەکەم بۆ بهاتایە، بەخوا هەرچی بکەیت بۆخوا بەزایە ناچێت چونکە ئەتبینێ و پێزانە ﴿ **وَمَا تَفْعَلُوا مِنْ خَيْرٍ يَعْلَمْهُ اللَّهُ وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى وَاتَّقُونِ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ** ﴾ البقرة:١٩٧. الله أكبر خوایە ئاواتمان رازی بوونی تۆیە، هاوکاریمان بکە چاکە بکەین.



## کاک ڕێبین ساڵح دەڵێت:

ڕەمەزانی ساڵی ( ٢٠١٤) لەسەفەری عومرە بووین، ڕۆژێك لەگەڵ برایەك چووینە یەکێك لەکتێبخانەکانی شاری مەککەی پیرۆز، یەکێکمان جلی کوردیمان لەبەردابوو، لەکاتی گەڕانمان بەناو کتێبخانەکەدا کارمەندی کتێبخانەکە ئێمەی بەو جلانەوە بینی قسەی لەگەڵ کردین، لەقسەکانیدا پرسیاری کردو وتی ئێوە کوردن؟ ئێمەش وتمان بەڵێ، پاشان وتی: ئێوە گەلێکی باشن، ئێمەش پرسیمان: بۆچی؟ چۆن ئەزانی ئێمە گەلێکی باشین؟

لەوەڵامدا بەسەرهاتێکی بۆ گێڕاینەوەو وتی: ڕۆژێك کەسێك هاتۆتە کتێبخانەکەمان،لەیەکترناسیندا ووتویەتی (من پێش نوێژو وتار خوێنم) لەیەکێك لەمزگەوتەکانی کوردستان.. دوای ئەوەی ئەو کتێبانەی دیاری کرد کە دەیەویست بیانکرێت، نرخەکەی گەیشتە (٦٠٠) ڕیاڵی سعودی، بەڵام ئەو ئیمامە وتی تەنها (٣٠٠) ڕیاڵم پێیە، لەبەرئەوە لەناچاریدا داوای کرد بەشێك لەکتێبەکانی بۆ جیابکەینەوەو تەنیا بەبڕی (٣٠٠) ڕیاڵ کتێب بکڕێتو ئەوانی تر بگەڕێنێتەوە، لەوکاتەدا دەیەوێت کتێبەکان دابنێتەوە کەسێك لەوێ دەبێتو ئاگاداری ئەوەیە کە ئەو ئیمامە لەبەرئەوەی بڕی پێویست پارەی پێنییە ناچارە بەشێك لەکتێبەکان نەکڕێت، پرسیار لەکتێبفرۆشەکە دەکاتو دەڵێت: ئایا ئەو بەڕێزە چەندی پێویستە تا هەموو کتێبەکان بکڕێت، ئەمیش لەوەڵامدا دەڵێت (٣٠٠) ڕیاڵ، ئەویش (٣٠٠) ڕیاڵی پێدەداتو دەڵێت بانگی بکە با کتێبەکان هەڵبگرێتو داینەنێتەوە، کتێبفرۆشەکە وتی: منیش بانگی ئیمامەکەم کردو وتم کتێبەکان دامەنێرەوە..

ئەویش وتی: بۆچی خۆ من پێموتی تەنها (٣٠٠) ڕیاڵم پێیەو ئەمەوێ تەنها بەو بڕە کتێب بکڕم، منیش پێموت ئێستا کەسێك لێرەبوو ئاگاداری ئەوەبوو کە

نرخی کتێبەکانت (٦٠٠) ڕیاڵەو تۆش تەنها (٣٠٠) ڕیاڵت پێیە، ئەو (٣٠٠) ڕیاڵی داناوەو پێی وتم کە پێت بڵێم هەموو کتێبەکان هەڵبگریتو هیچیان دانەنێیتەوە، کتێبفرۆشەکە وتی لەوکاتەدا ئیمامەکە دەستی کرد بەگریانو بەدەم گریانەوە ئایەتی: ﴿(مَن ذَالَّذي يُقرِضُ اللهَ قَرضاً حَسَناً فَيُضاعِفَهُ لَهُ أَضعافاً كَثيراً)﴾ دەووتەوە کتێبفرۆشەکە وتی لێم پرسی، چی بووە، بۆچی ئەگریت؟ ئیمامەکەش وتی: من ئێستا لەحەوشەی مەککەوە هاتووم بۆ ئەم کتێبخانەیەو (٦٠٠) ڕیاڵم پێبوو، بەڵام لەوێ لەگەڵ چەند کەسێکدا کە **حافظ** قورئان بوون قسەم کردوە، پاش هەندێك قسەکردن لەگەڵیاندا پرسیاری ئەوەم لێکردوون کە چەند پارەیان پێیە، بەهەردووکیان نزیکەی (١٥) ڕیاڵیان پێبووە، منیش (٣٠٠) ڕیاڵم دا بەوان پاشان هاتم بۆ ئێرە، لەماوەیەکی زۆر کەمدا خوای گەورە قەرەبووی بۆ کردمەوە.



## سوننەتی خوایە لەبوونەوەردا چاکە بەزایە ناچێت!

شەوێکی ساردوسەرماوباران لەویلایەتی فیلادیلفیا لەئەمەریکا ژن و پیاوێکی پیر خۆیان ئەکەن بە ئوتێلێکداو لە پرسگە داوای ژوورێك دەکەن بۆشەوێك لەبەرئەوەی بەو سەرماوبارانە نایەنەوێت سەفەرەکەیان بکەن، فەرمانبەری پرسگەکەش دەڵێت: ببورن نەلای ئێمەو نەلەئوتێلەکانی تر جێگا نیە چونکە سێ کۆنفرانس هەیە و هەموویان گیراون، بەڵام دڵی پێیان ئەسوتێت ودەڵێت من حەزدەکەم لەژوورەکەی من بخەون، وتیان ئەی تۆ؟ وتی: من لەم سەرکورسیەی خۆم سەرخەوێك ئەشکێنم.

بۆبەیانی کەهاتن برۆن دیاربوو فەرمانبەرەکە بەنووستنی لەسەر کورسیەکە ماندووبووبوو، ویستیان پارەبدەن، وتی: پارە وەرناگرم، ئێوەمیوانی من بوون و ئنجا ژوورەکەش ناتوانم پارەکەی داخلی حساب بکەم چونکە بۆکرێ نیەو ناشمەوێت پارەیەکم دەست بکەوێت لەپشت خاوەنەکەیەوە، کابرای پیریش لەبەردەم ئەم جوامێریەدا هەرئەوەندەی بۆکرا داوای ژمارەی مۆبایلەکەی لێکرد.
دوای دووساڵ پەیوەندی پێوەکردو خۆی پێناساندو وتی: من ولیام ولدرۆف م یەکەم ئوتێلم لە لەندەن دروست کرد کە یەکەمە لەزنجیرە ئوتێلێك لەزۆر وڵاتداو سەر بەهیلتۆنی جیهانین، حەزدەکەم لەسەر ئەو هەڵوێستە مەردانەیەی ئەوشەوەت لەگەڵ خۆم وهاوسەرمدا ببیتە یەکەم بەڕێوەبەری ئوتێلەکانم.
فەرمانبەرەکەش کەناوی جۆرج بۆلدت بوو بەخۆشیەوە قبوڵی کرد وشایانی باسە لەم ساڵانەی دواییدا لە رەئس ئەخەیمەش لەوڵاتانی کەنداوئەم ئوتێلەیان کردوە کە ئەوە وێنەکەیەتی..



## لەدەست خوا بۆ کوێ دەرئەچن؟؟

مامۆستا شێرزادم لەدوورەوە ئەناسی پێش ٣ ساڵ رۆژێك تەلەفونی بۆکردم بەهۆی نووسینەکانمەوە کە دەگەیشتنە بەرێزیان وفەرمووی:من تۆم خۆش دەوێت لەبەرخوا، وتم: دەی کەوایە کۆبوونەوەیەك بۆ زانایان رێکبخەن و دێمە هەولێر، ئەوەبوو بەهاوکاری رێکخراوەکەی دکتۆر وشیاری رەحمەتی خولێکی یەکرۆژیان رێکخست لە هۆڵێك و بەیانی تا عەسر بەندە سێ وتارم بۆدان وباسی ئەزموونی خۆمم بۆکردن.

جارێکی تریش پێش مانگێك بەخزمەتی دکتۆری رەحمەتی گەیشتم کەهاتبوو بۆکۆبوونەوەی ئینستیوتی بانگخوازان کە جەنابیان سەرباقی سەرقاڵی زۆریان ئەندامێکی کارا بوو لەلقی هەولێرمان.

ئەوەی کەسەرنجی راکێشام لەم موسیبەتەدا کۆمێنتی برایەك بوو کەنووسیبووی: پێش چەند مانگێك لەخەویا بینیبووی کە دکتۆر شەهید ئەکرێت وهەرجارێك بینیبێتی ئەو خەوەی بیرکەوتۆتەوە، تا دوێنێ کەخەوەکەبووە راست و

هەواڵی شەهیدبوونی دکتۆری بیست. هەر دوێنێ شەو لەخەودا بینیەوەو تێرباوەشی پیاکردبوو خواحافیزی لێکرد.

ئنجا منی بەندەی هەژاری خوا دەڵێم: خوایەك کە ئێستاو رابردوو داهاتوو هەمووی لای کەشفە، ئەی تاوانباری دەست رەش بۆکوێ دەرئەچی لەدەست خوا، بۆ قیامەتی خۆتت فرۆشت بۆدونیای کەسانی تر، لەدەست خوا خۆت و ئاغاکانت بۆکوێ دەرئەچن؟؟

## روداوێکی راستەقینە

مامۆستا سامان سید مامە ئەڵێت:

کورێك بە ناوی ( ح ) کۆتایی ٢٠١٧ تەلەفۆنی بۆ ( مامۆستا نەوزاد گەردی) کرد کە پیش نویژو وتارخوێنی مزگەوتی ( عمر بندیان )ە کە مامۆستای شەهیدی مینبەر ( دکتور وشیار) لەوێ وتاربێژبوو..

وتی: مامۆستا خەونێکم بینیوە دەمەوێ بۆت باس بکەم..

لەخەونم مامۆستای شەهید هاتوچۆی دەکرد و زۆر مشەوەش بو منیش وتم خێرە مامۆستا بۆ ئەوها مشەوەشی وتی ( ح ) چۆن مشەوەش نەبم ئەم گەنجە دەبینی وتم بەڵێ وتی کێشەی هەیە لەبەرچی بۆی حەل ناکەن ئەوە قوتابی من بووە خۆشمدەوێ..

( ح ) دەڵێ بەخەبەر هاتم.

م نەوزاد وتی ( ح ) تۆ ئەو گەنجە دەناسی وتی نەبەخوا نایناسم مەگەر وەصفت بۆ بکەم کە لەخەونەکە بینیومە

م نەوزاد: دەی باشە وەصفی بکە،ئەویش بەجوانی وەصفی کرد



م نەوزاد: پاش گەڕان و تەعقیب کردن ئەو گەنجەمان دیتەوە و وتمان بێ زەحمەت تۆ هیچ کێشەت هەیە؟ گەنجەکە باسی کردکە خێزانەکەی لەماڵ زیز بوەو ( تۆراوە) کێشەی هەیە خەریکە بگاتە تەلاق " سوپاس بۆ خوا دوای هەوڵ و ماندو بون دوای پانزە رۆژ کوڕەو کچە ئاشت بونەوە

م نەوزاد: لە گەنجەکەم پرسی تۆ کێیت و چیت کردوە م شهید وشیار بەخەون ئێمەی ئاگادار کردەوە لە کاتێك تۆ ناناسم تاوەکو کێشەت بۆحەل بکەین

گەنجەکە: واللە مامۆستا خێزانم تۆرابو دڵم زۆر توندبوو هیچ ئومێدم نەمابو شەوێك ئەوەندە گریام بە دیار رەسمەکانی شهید وشیارو بیری ئەوکاتانەم کرد کە قورئانی پێ دەگوتم و لە دڵی خۆم وتم ئێستا لە ژیاندا بوایە ئەو کێشەی بۆ حەل دەکردم و پاشان قورئانم بە دەنگی ئەو لێداو بە گریانەوە گوێم لە دەنگی ئەو گرت لە ماڵێکی چۆڵ و بێ هاوسەرین و دڵ بەغەم هێشتا کۆسپی وشیارەکەم تەواونەبو خێزانیشم تۆرا هەم دڵم چۆڵەو هەم ماڵیشم چۆڵ سەرم خستە سەر سەرین و بە قوڵپی گریانەوە بە دەمی بە دوعاوە خەوتم.

م نەوزاد: دەی ئەزیزم م وشیار تۆی لەیاد نەکردوە منی راسپارد تا کێشەکەت بۆ حەل بکەم

هەزار رەحمەتت لێبێ دکتۆری شەهید

تەنها لەبەر حەزەر ناوی کەسەکان نەنوسراون ئەگینا من خۆم قسەم لەگەڵ باوك و مامی کچەکە کرد کاتێك کە تۆرابوو لەماڵی باوکی بوو..

## لەقەدەرە سەیرەکان:

وتاربێژو بانگخواز محمد الصاوی ئەڵێت:

لەئەسکەندەریەوە سەعات ١٠ی شەو هاتم بۆ قاهیرە سەعات ٢ی شەو گەیشتمە ئەوێ بۆئەوەی فریای فڕۆکەخانە بکەوم ونوێژی بەیانیشم نەفەوتێ، داوام لە برادەرێکم کردبوو کەدەرگای مزگەوتەکە لەوکاتەدا بکاتەوەکەنزیك بوو لەفڕۆکەخانەوە تا لەوێ شەونوێژبکەم و بخەوم تاکاتی نوێژی بەیانی و بە ئیسراحەتیش بگەم بەگەشتەکەمدا، کەچوومە ناومزگەوتەکە پیاوێك بەکوڵ دوعای دەکردو دەگریا چوومەلایەوەو وتم: برام وەزعت چیە؟وتی: خێزانم بەیانی سەعات ٩ نەشتەرگەری بۆدەکرێت و پانزەهەزارو چوارسەدجونەیهی تێدەچێت ومنیش نیمە.وتم: خوا کەریمەو بەردەوام بە لەپاڕانەوەکەتدا..

من نووستم و بانگبێژ بۆ نوێژ هەڵیساندم، پێشنوێژی مزگەوتەکە داوای لێکردم پێشنوێژیەکەیان بۆبکەم، وتم: من ماندووم خۆت بیکە،وتی: حەزدەکەم جەنابت پێشنوێژیەکەمان بۆبکەیت ئەگەر سورەتی کورتیش بخوێنی قەیناکە.پێش نوێژیەکەم کردو کەتەواوبووم پیاوێکی پاڵتۆلەبەری دەوڵەمەند هات و سڵاوی لێکردم و وتی: مامۆستا من تازە شوقەم کڕیووە لەقاتی سێی ئەم عیمارەیە کە گوێم لەقورئانخوێندنەکەت بوولەبڵندگۆکانەوە دابەزیم، من موتابەعەی وتارەکانت ئەکەم وسوودمەندبووم لێت، من کارگەی پلاستیکم هەیەو بڕی ١٥٤٠٠ جونەیه زەکاتم هەیە حەزدەکەم تۆ بیدەی بەکەسێکی موستەحەق، منیش چاوم گێڕا وکابرام دۆزیەوەو بانگم کردو وتم: تۆ چەندت پێویست بوو؟ وتی: ١٥٤٠٠ جونەیه،وتم: دەئەوەتا خوا وەڵامی دایتەوەو بۆی ناردیت.

ئەو گریاو من و دەوڵەمەندەکەش گریاین.

ئنجا کابرای دەوڵەمەند وتی: بەخوا یەك هەفتەیە ئەو پارەیەم داناوە کەهەقی خوایە، ژنەکەم هەموورۆژێك ئەیوت زوو بیبەخشە،منیش ئەمووت: حەزدەکەم هەمووی بدەمە کەسێکی موستەحەق کە لەکێشەیەك رزگاری بکات.تاخواش ئێمە لەکێشەکانمان ررزگاربکات، وابەقەدەری خوا بوو بەنسیبی ئەم برادەرە، جابەڕاستی، خوا زانایەو ئاگاداری هەموو بوونەوەرەکەیەتی و مسقاڵە زەڕەیەکی لێون نابێت، هەقە هەردەم ئەم دوعایەش بخوێنین تا ئەو راستیەئیمانیە بیری‌خۆمان بخەینەوە:

(اللهمَّ أنت ربِّي لا إلهَ إلَّا أنتَ عليك توكلتُ وأنت ربُّ العرشِ العظيمِ، ما شاء اللهُ كان وما لم يشأْ لم يكنْ ولا حولَ ولا قوةَ إلَّا باللهِ أعلمُ أنَّ اللهَ على كلِّ شيءٍ قديرٌ وأنَّ اللهَ قد أحاط بكلِّ شيءٍ علمًا وأحصَى كلَّ شيءٍ عددًا، اللهمَّ إني أعوذُ بك من شرِّ نفسي ومن شرِّ الشيطانِ وشَرَكِه، ومن شرِّ كلِّ دابةٍ أنتَ أخِذٌ بناصيتِها إنَّ ربِّي على صِراطٍ مستقيمٍ) الراوي: المحدث: الفيروزآبادي | المصدر: سفر السعادة

الصفحة أو الرقم | ٣١٠ :خلاصة حكم المحدث: صحيح



## هیدایەتێکی زۆر سەیر!

بانگخواز نوعمان عەلی خان لەئەمەریکاوە ئەڵێت: پێنج ساڵێك ئەبوو نەچووبووم بۆمزگەوتی شاری فۆرت وۆرس: دەعوەتیان کردم وچووم وتارێکم دا لەسەر دوعا، دوای وتارەکە گەنجێکی میسری هات: وتی: منیش دوعام کردو خوا گیرای کرد، وتم: دوعاکەت چیبوو؟ وتی:دوعام کرد جەنابت رۆبەرت دافیلا ببینی، وتم: خۆتی؟ وتی: نەخێر هاوەڵمە وچیرۆکێکی سەیری هەیە..چوین بۆسەردانی و ئەمەش بەسەرهاتەکەیەتی:رۆبەت لەخێزانێکی جوتیاربوو بەهۆی ناتەواوی جیناتیەوە تووشی ئیفلیجی بوو تەنها سەری ئەجولا، لەخانەی چاودێری دانرا خزمەت بکرێت، کەتەنها ئەم تەمەنی سی ساڵێك ئەبوو ئەوانی تر هەموو زۆر پیربوون.کەسوکاری کۆمپیوتەرێکیان بۆهێنابوو کەبەدەنگی ئەم ئیشی ئەکرد و بەئەنتەرنێتدا ئەگەڕا.

برادەرێکی لەتەنیشتەوەبوو ئەویش ئیفلیج بووو،وەك ئەم مەسیحی بوو، پێویستی بە چاندنی جگەریش بوو، یەکێك پەیدابوو پارچەیەك جگەری بداتێ و بەداخەوە برادەرەکەی لە نەشتەرگەریدا دەرنەچوو،خوشکەکەی ملوانکەیەکی براکەی بۆهێنا کەخاچێك بوو وە بەلای دیوارەکەی ئەمدا بۆی هەڵواسی بۆیادگار. شەوێکیان رۆبەرت لەخەویا پیاوێکی بینی فەرمووی:من محمدم وئاماژەی بۆ خاچەکە کردو وتی: خوا پێغەمبەرانی نەناردووە تالە جیاتی ئەو بپەرسترێن، خوا پێغەمبەرانی ناردووە تا تەنها خۆی بپەرسترێت، وەعیساش بەندەیەکی خوابووەو بەبازاڕدا رۆیشتووەو خواردنیشی خواردووە.

رۆبەرت خەبەری بۆوە لەگوگڵ گەڕا بەدوای محمدا وئیسلامی ناسی و موسڵمانبوو، لە سکایپەوە کەسێکی میسری دەستکەوت فێری عەرەبی کردو

ئنجا فێری قورئان بوو وە دەسوورەتی لەبەرکرد.ئنجا بەقەدەری خوا ڕێی لەوتارەکانی من دەکەوێت لە یوتیوب و هەموویان سەیردەکات.

میسریەك کە کاری صیانە بوو هەرچەند موسڵمان بوو بەڵام مزگەوت دووربوو لێیەوە بۆیە بۆلایەنی ڕۆحی خۆی سەردانی کەنیسەی ئەکرد، ڕۆژێك بەلای ژوورەکەی ڕۆبەرتدا ئەڕوات گوێی لەسوورەتی والعصر دەبێت، ئەڵێ: ڕۆبەرت ئەوە گوێ لەچی دەگریت؟ ئەڵێ گوێ لەهیچ ناگرم خۆم ئەیخوێنم وموسڵمانبووم، وەگوێش لە وتارەکانی نوعمان عەلی خانیش ئەگرم و خۆزگە بمبینیایە، میسریەکە ئەمەزۆرکاری تێدەکات و تەوبە دەکات و زۆردوعای بۆدەکات کە ڕۆبەرت من ببینێت، سبحان الله خوا ڕێکی خست بچمە ئەومزگەوتەو ئنجا بەهۆی ئەومیسریەوە بچم بۆلای ڕۆبەرت.




ڕۆبەرت حەزی کردبوو بێت بۆنوێژی هەینی بەوکورسیەی بردبوویان زۆر ئازاری پشتی گەیشتبوو ئەبوایە شەش مانگ نەچێتە سەرکورسی، سێ مانگی تەواوکردبوو کەمن چووم بۆلای و وتی: سێ مانگی تر باش ببم دێمەوە

بۆمزگەوت چونکە بۆ یەکەمجار لەمزگەوتا هەستم بەئارامی کرد لەژیانمدا، زۆر قسەمان کرد وشەش حەوت وتارم دا لەسەر قسەکانی کەبەڕاستی هەموویان پەندوعیبرەتن بۆئێمەی لەش ساغ کەبەداخەوە وەکوپێویست هەست بەنیعمەتە زۆرەکانی خوا ناکەین....ئەوەش وێنەی رۆبەرت و مامۆستا نوعامانەو وێنەی شارەکەشێتی. .

## دکتۆر ماجد الشیخ!

دکتۆر ماجد دکتۆری ئیستشاری نەخۆشیەکانی پێستە لەمیسر لەپەیجی خۆی لەفەیس بوك دەڵێت: لەگەڵ دایکم چووین بۆسەرخۆشی ناسیاوێکمان، لەدەرگای شوقەیەکمان دا، پیرێژنێك لەودیو دەرگاکەوەوتی: واهاتم ئێوەکێن، وتم: هاتووین سەرخۆشی بکەین.

کەدەرگاکەی کردەوە تومەز عیمارەکەمان لێتێکچووەو ناسیاوەکەمان نیە،وتی: بەخوا باش بوو هاتن من تەنهام وتووشی حەساسیەت بووم، زۆرلەخوا پاڕامەوە یەکێکم بۆ بنێرێت بینێرم بۆ دەرمانخانە دەرمانم بۆ بهێنێت،منیش وتم: واخوامنی بۆناردی بەهەڵە لەدەرگای تۆ بدەین ومن دکتۆری پێستم، نیو سەعات لای دانیشتین و فەحسم کردو دەرمانیشم بۆبرد، بەڕاستی لەگەورەیی دوعا تێگەیشتم و بەعەمەلی ئەم ئایەتەم بینی ﴿ **أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاءَ الْأَرْضِ أَئِلَهٌ مَعَ اللَّهِ قَلِيلًا مَا تَذَكَّرُونَ** ﴾ النمل:٦٢ .

جامن وەك ئەندازیار عوسمان دەڵێم: بەملیۆنەها نموونە هەیە لەم بارەیەوە خۆزگەم بەوەی دۆستی خوایە!ئەم بەسەرهاتانەش کە وەڵامی خوایە بۆ بەندەکانی بەڵگەیەکی گەورەیە لەسەر زانایی و ئاگالێبوونی بێپایانی خوا. ئەوەش وێنەی دکتۆر ماجدە لە عیادەکەی:



## دوعای خێربکە بۆ بڕواداران!

وتراوە ئەگەر شتێك گۆشتی پێنەگرم بۆ گۆشتی پێکەم بکەم.

هەموو هەقە دوعا بۆ بڕواداری پێش خۆمان بکەین ودڵمان هیچی تیانەبێت بەرامبەربڕوادارانی سەردەم ﴿ وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ ﴾ الحشر: ١٠.

لەم رۆژانەدا برادەرێك کۆمێنتێکی نووسیبوو بۆ دکتۆر عبدالواحید،گوایە بڕوات خەریکی دکتۆریەکەی بێت و باسی ئیسلام نەکات کەبەهێندەی مەلایەکی لێنازانێت، بۆبەیانی کۆمێنتێکی تری نووسی وتبووی: کێ تەلەفونی دکتۆری لایە بمداتێ ئەچمە خزمەت دکتۆرو باوەشی پیادەکەم چونکە ئەمشەو لەخەوما پێغەمبەری خوام بینی دەستی دکتۆری گرتبوو فەرمووی: ئەمە ئیسلام سەردەخات.

یەکێکی تریش ناهەقی بەرامبەر دکتۆر دەووت،تاخوا پێویستی خستە دکتۆرو نەشتەرگەری بۆکردو پارەی لێوەرنەگرتبوو، ئنجا بەخۆیا چووەوەو زانی ئەم هەڵەتێگەیشتووە لەو دکتۆرە بانگخوازە..

جا من ئەڵێم باشە ئەکرێت هەموو خەوببینن یان بچنە بەردەستی دکتۆر نەشتەرگەریان بۆ بکات، بۆ لەبەرخوا دەمیان ناگرن و واز لەبانگخوازان ناهێنن کاری خۆیان بکەن، ئاخر نازانن گوناهباردەبن کەهەڵیان گرن ودایان نێن بەناهەق؟؟

## فەسڵی کۆتایی:

دکتۆر محمد راتب نابلوسی ئەڵێت: ئێمە لەژیاندا لە٩٠٪ی رووداوەکان فەسڵی کۆتاییان ئەبینین و ئەوشتانەی کە هەموو فەسڵەکانی دەبینین زۆرکەمن بۆیە تێیان ناگەین وخضریشمان دەست ناکەوێت بۆمان تەفسیر بکات.

بازرگانێك لەدیمەشق گوێی لەتەقە دەبێت سەری دێنێتە دەرەوە بزانێت چیە، فیشەکێکی بەردەکەوێت و تووشی ئیفلیجی دەبێت، کەئەمەم بیست لەبەرئەوەی ئەوەلیاتی مەسەلەکەم نەئەزانی تێی نەگەیشتم، تا دوای بیست رۆژێك برادەرێکم وتی: ئەو بازرگانە برایەکی خانوویەکی دەبێت و کرێیەکەی ئەم بۆی وەردەگرێت، کەبراکەی دەمرێت دەستی بەسەرا دەگرێت و نایدات بەبرازاکانی، ئەوانیش لای زانایەك شکاتی لێدەکەن، ئەویش دەڵێت: حەواڵەی خوای بکەن..

کەئەمەم بیست لە عەدلی خوا تێگەیشتم کەئاوا هەرلەدونیادا هەقی ئەو منالە بێباوکانەی لێسەند.

## لەژێر چاودێری خۆماندای:

شێخی وتاربێژان عبدالحمید کشك داوایان لێکرد خوێنی سەید قوتب حەڵاڵ بکات، ئەویش نەك هەرنەیکرد بەڵکو بەباشە باسی برایانی کرد، بۆیە هەرچەند نابینا بوو راپێچی زیندانیان کردو لە ژوورێکی نسرمی رەق و تەقی ژێر زەویدا بەتەنها بەندیان کرد، ئەویش کاتێك جبەکەی داخست وخەوت: ئەبوبەکری بینی لای قەبری خۆشەویستەوە وەستابوو، پێی فەرموو: خۆشەویست دروودی خوای لەسەر ئەفەرموێت: خەمی نەبێت لەژێر چاودێری خۆماندایە!




خوای گەورە نیعمەتی پێ بەخشیم کاتێك چاوەکانی لێ سەندمەوە تاکو زۆردارەکانی پێ نەبینم.

بەم تێگەیشتنەوە ئەم بانگخوازە مەزنە توانی رووبەڕووی ستەمکاران ببێتەوەو بڵێت:سوپاس بۆخوا کەنیعمەتی نابینایی پێبەخشیم تا ستەمکاران نەبینم.

## کاک ئەحمەدەکەم!

ساڵی ١٩٦٤ کاک ئەحمەدی موفتی زادە ئەبێتە بەرپرسی کۆمیتەی حیزبی دیموکراتی کوردوستان لەتاران، پاش ماوەیەکی کەم لەگەڵ ١٢٠ چالاکوانی تری سیاسی کورد ئەگیرێن و لەزینداندا شەش مانگ ئەمێنێتەوە، لەم بەندکردنەدا بیرکردنەوەی دەگۆڕێت، بەتایبەت کە لەخەویدا منالێکی حەوت هەشت ساڵان بووەو دەستی خستۆتە سەرشانی خۆشەویستمان درودی خوای لەسەر کە قورئانێکی بەدەستەوەبووەو ویستویەتی کاک ئەحمەد باشتر فێری قورئان بکات و

چەند ئایەتێکی پێدەفەرموێت و خەبەری ئەبێتەوەو تێدەگات کەخۆشەویست لە قورئانخوێندنی رازی نیە، بۆیە ئەکەوێتە دیراسەی قورئان وبڕیارئەدات ئازادکرا قورئان بکاتە پەیامی رزگاربوونی گەلەکەی و واز لەشتەکانی تر بهێنێت.(ئەم خەوە کاك ئەحمەدی رەحمەتی بۆمامۆستا بورهانی ئەمینی گێڕاویەتیەوە ومامۆستا صلاح الدین لەسەرەتای ژیانی کاك ئەحمەدا باسی کردووە).

## رۆژی خوا:

یەکێك لەرۆژەکانی خوا ئەو رۆژەیە کەتیایا تۆڵە لەستەمکاران دەسێنێت، وەك رۆژی لەناوبردنی فیرعەون کەخوا داوادەکات لە موسا سەلامی خوای لێبێت کە ئەو رۆژە بێنێتەوە یادی بەنی ئیسرائیل بۆئەوەی سوپاسگوزاربن و هەرگیز ستەم نەکەن. ﴿ وَذَكِّرْهُمْ بِأَيَّامِ اللَّهِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾ ابراهیم:٥.

رۆژەکانی خوا دووبارەدەبنەوە بۆستەمکاران، وەك رۆژی لەناوبردنی بەرمەکیەکان!!

هارونە رەشید شیری هاوسەری یەحیای بەرمەکی خواردبوو، زۆرتێکەڵ بوو لەگەڵیاندا و پلەوپایەی باشی دانێ! بەیانیەکیان هارونە رەشید کەوتە گیانیان و سەرکوتی کردن و یەحیاو کوڕەکەشی بەند کرد، زۆر تەفسیرکراوە بۆ هۆکاری لەناوبردنی بەرمەکیەکان، بەڵام لەراستیدا کەس هەقیقەتی مەسەلەکە نازانێت و هارونە رەشید بەکەسی نەوتووە، تەنانەت کەلێی پرسراوە لەوبارەیەوە وتوویەتی: ئەگەردەستی راستم بەوە بزانێت ئەیبڕمەوە!

رۆژێك کوڕی یەحیا لەبەندیخانەدا بەباوکی دەڵێت: بۆ وامان بەسەرهات؟ ئەویش وتی: کوڕم دوعای ستەملێکراوێکە کەلەنیوەی شەودا دوعای لێکردوین و ئێمەش لەپرخەی خەودا بووین!

ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کەخواستەم لەکەس قبوڵناکات وغافڵ نیە لەستەمی ستەمکاران ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ اللَّهَ غَافِلًا عَمَّا يَعْمَلُ الظَّالِمُونَ ﴾ ابراهيم:٤٢ .

## منالی بێباوک ودایک:

ناصر دۆسەری شاعیر لە رەئس تەنورە کەمینایەکی سعودیە دەڵێت:بیست ساڵ هاوسەرگیریم کرد منالّم نەئەبوو بۆیە هاوسەرەکانم جیا ئەبوونەوە، پاشان لەهاوسەری شەشەمم کوڕوکچێکم بوو، ئنجا ئیبراهیمم بوو، لەخەستەخانەوە ناردیان بەدوامداو وتیان ئاو لەسەری منالّەکەتدا کۆبۆتەوەو سەری ئاوساوەو ئەبێت نەشتەرگەری بۆبکرێت، پاش ئەوەی نەشتەرگەری بۆکراو برایە ژووری چاودێری ولەپشت شوشەوە منالّەکەمان ئەبینی، ئێوارەیەك چووم نوێژبکەم، کەهاتمەوە هاوسەرەکەم دیارنەبوو، بە سستەرەکەم وت: هاوسەرەکەم بۆکوێ چووە؟، وتی:ئەوەتا لەولاوە، تومەزیشتی لەمن بوو لەولاوە شیری ئەدا بەمنالّێکی تازەلەدایکبووی بێ دایك و باوك،کەحالّەتێکی رەقبوون و تەشەنوجی ماسولکەی لەگەڵدا بوو وەسیەکانیشی تەواو نەبوون.

هەموو رۆژێك ئەچوین لەبەرخوا شیری ئەدا بەومنالّە، رۆژێك لەوێ نەمابوو ناردبوویان بۆخانەی منالّە بێباوکەکان، چوین و وەرمان گرت کەلای خۆمان بەخێوی بکەین، پاش ماوەیەك ئیبراهیمیشم لەسەر بەرپرسیارێتی خۆم لەخەستەخانە دەرهێنا، تالاوی دنیامان چەشت بەدەست ئیبراهیم ومنالّەکەی ترەوە کەناوی خالیدبوو، شەوو رۆژ ئەگریان و هەراسان بووبووین.هاوسەرەکەم وازی لەخوێندن هێنا لەبەرهەردوکیان.

دکتۆرەکان وتیان ئیبراهیم چاکیش بێت: نابیستێ ونابینێت وناتوانێت قسەبکات چونکە ئەوئاوە فشاری لەسەرمێشکی دروستکردووە، دوای حەوت

مانگ بەدەنگی تەلەفزیۆن ئیبراهیم داچڵەکی و چووم بەلایەوە چەپڵەیەکم لێدا هەستی پێکرد،وتم سوپاس بۆخوا دەبیستێت، ئنجا بردمە بەرهەتاو چاوی داخست وتم:سوپاس بۆخوا ئەبینێت، پاشان وتی: بابە!وتم:سوپاس بۆخواقسەدەکات.. خوای گەورە بەهۆی ئەومناڵە بێباوك ودایکەوە شیفای ئیبراهیمی داو بەرەکەت کەوتە ماڵ وحاڵمانەوەو ئێستا گەورەبوون و لەپۆلی شەشی سەرەتایین.چووم بۆلای دکتۆر کیفاح سینان زۆرلای سەیربوو ئیبراهیم چاکبووە لەکاتێکدا ئەوبڕوای نەئەکردوەك پزیشکێك کەچاك ببێت ودوایی وتی:دیارە بەبەرەکەتی ئەو مناڵە بێباوکە چاکبووە.






## لەخاتوو مەدینەوە!

لەتەق تەق لەماڵی برای خۆشەویستم مامۆستا هەڤاڵ ساڵی ٢٠١٧ ئافرەتێك بەناوی مەدینە کەزانیبووی ئێمە دەچین ئەویش هات وحەزی کردبوو بمانبینێت، بەهەرحاڵ بەسەرهاتی خۆی باسکرد !

مەدینەخان وتی: لەتەمەنی بیست ساڵیدا سێ کوڕم هەبوو مێردەکەم ئەنفال کرا، بەبێوەژن کۆشی منالەکانم بەخێوکرد،کرێکاریم دەکرد لەزەرعاتداو هەنجیرم ئەچنیەوە، ڕۆژێك سەردانی ماڵی خوشك و براکانم کرد لە کەرکوك وتیان: تۆش وەك ئێمە وەرە کۆڵە مس بەرە کاسپیەکی باشە دوو سێ جار کۆڵم برد، ڕۆژێکیان لە خاڵی پشکنینەکە یەکێ منی بانگ کرد بەعەرەبی، منیش بەخوشکەکەم وت: بەخوا تازە تووش بووم. کەچوومە پێشەوە بەکوردی وتی: من هەقم نیە بەسەر ئەو دوانەوە بەڵام نەتبینمەوە جارێکی تر، منیش لەترسا وتم: تۆبەبێت ئیتر نایەمەوە بێرەدا.

شەوێش خەوم بینی پیاوباشێکی ناوچەکەمان کە وەفاتی کردووە هاتە خەوم و زللەیەکی دا لەپەنا گوێم و وتی: ئیتر ئەو کارە نەکەیت، خوا رزقت ئەدات.

(ئەو خوشکە بەرێزە یەکێ بوو لەجوانەکانی تەق تەق ولێی قەومابوو،دیارە خوا ویستویەتی بیپارێزێت و لەورێ وبانە تووشی بەڵایەك نەبێت ).

پاش ماوەیەك خوا بۆی ئاسان دەکات مووچەی ئەنفالی مێردەکەی وەردەگرێت و لە دائیرەی کشتوکاڵیش دائەمەزرێت. پاش چەند ساڵێك کورێکی دەبێتە پێشمەرگەو دووەمیان ئەبێتە پۆلیس و سێیەمیشیان ئەبێتە ئاسایش..

دایکی تائەمرێت ئەم خزمەتی ئەکات، ئنجا خەوئەبینێت کە کورە گەورەکەی ئەمرێت، پاش ماوەیەك کورەگەورەکەی بەکارەساتی سەیارە مرد کەچەند مانگێك بوو برازایەکی خۆی بۆهێنابوو، لەبەرئەوەی منالی نەبوو برازاکەی شووی کردەوە، ئنجا خەوی بینی کوڕی دووەمی ئەمرێت ئەویش بەجەلْتەی دڵ مردو سێ منالی لەدوای خۆی بەجێهێشتووەو دایکیان دانیشتووە بەدیاریانەوەو، مەدینەخان و کوڕی سێیەمی بەقەرزوقۆڵە خانوویەکی باشیان بۆکردوون.

ئنجا کوڕی سێیەمی وا منالێکی بووەو گورچیلەیەکی تەواو نیەو بەرێی هەولێرەوەن بۆعیلاج. ئەم ئافرەتە تادواپلە خۆڕاگرە و وتی: یەکجارتەلەفونم بۆمامۆستا وشیارکردووە ئەویش کاتێك گوێم لەوتارێکی بوو داوام لێکرد دوعام بۆبکات، لەوسەعاتەی شەهید کرامن لەخەودابینیم خەبەرم بۆوە خەوم لێنەکەوتەوە کەبەیانی هەواڵەکەم بیست ئەوەندە بۆی گریام وتم:هەقە خەڵك بێن سەرخۆشی لەمنیش بکەن و پێنج فەرزە دوعا لەبکوژەکانی ئەکەم.

ئەم ئافرەتە دەخیلەیەکی دانابوو رۆژانەشتێکی کەمی پاشەکەوت ئەکرد بۆعەمرە خوا بۆی ئاسان کرد وعەمرەشی کرد.بەڕاستی من زۆر سوودم لە ئارامگریەکەی وەرگرت!

برادەرێکیش بەناوی کاك هەڵۆ نامەیەکی نارد وتی: مەدینەخان سەرباقی حاڵی خۆی زۆربەدەم منالی بێدایك و باوکەوەبووە، تەنانەت کەدایکی ئەمان مردووە دەستی هێناوە بەسەریانا وەك دایك ودوعای خێری بۆکردوون.

## رەئیسی بانگبێژەکانی مەدینە!

مستەفانوعمان ساڵی ١٣٥٣ی کۆچی لەدایکبووە لەمەدینە و بڕوانامەی سەرەتایی هەبووەو ٥٦ ساڵ لەشوێنەکەی بیلال بانگی داوە، بانگێك کەزۆربەی جار دوای بانگەکە فرمێسك لەچاوانی هاتووە.پێنج منداڵی هەیە یەکێکیان دکتۆرا دەخوێنێ لەزانستی ئیسلامیداو یەکێکیان بەڕێوەبەری گشتیە لە مەرکەزی دیراسات ولێکۆڵینەوەی مەدینەو راوێژکاری ئەمیری مەدینەیەو لەمزگەوتی قوباش بانگ ئەدات.



بانگبێژەکانی مەدینە بە مستەفایان دەوت رەئیسی بانگبێژان.

ساڵی ٢٠١٣دووڕۆژ پێش ئەوەی وەفات بکات لە تەمەنی ٨١ ساڵیدا چووە لای پزیشکەکەی پشکنینی بۆکردو وتی: تەندروستیت باشە،من سەردانی کەسوکارم دەکەم لەمیسرو دوای جەژن دێمەوە هەرچیت بوو لەخزمەتدام، ئەویش پێی وت: ناکرێت دووڕۆژ چاوەڕێ بکەیت تائامادی ناشتنەکەم بیت،دکتۆر زۆر لای سەیر بوو ناشتنی چی!دیاربوو دڵی خەبەری دابوو.

ئێوارەی پانزەی رەمەزان سێ کوڕو دووکچەکەی بانگ کردو باوەشی پیاکردن و یەك یەك وەك خواحافیزیان لێبکات،کەبانگی ئێوارەی دا وتی: من ئەوەی دەیلێم بەدواما بیلێنەوە، وتی: أشهد أن لاالـهالاالله وأشهد أن محمدا رسول الله، ئەوانیش بەدوایا وتیانەوەو ئەمەش دوا وشەی شێخ مستەفا نوعمان بوو جەڵتە لێی داو کۆچی دوایی کردو لە بەقیع لای هاوەڵانەوە ناشتیان.

## نەقیب عەبدول مەجید:

ئەمڕۆ ٥-٤-٢٠١٨ لەکتێبخانەی سارا مامۆستا مەلا وشیاری جافەرانم بینی، جەنابیان وتیان، لەم ساڵانەدا لەعومرەبووم، عومرەکارێکی برادەرم لەخەویا خۆشەویستمانی بینیبوودرووودی خوای لەسەر، فەرمووبووی: پێی مەڵێن مەلا وشیار من ناوم ناوە نەقیب عەبدول مەجید..

جا من نازانم هۆکاری ئەوناونانە چیە، ڕەنگە خۆشەویستمان چۆن دوانزە نەقیبی هەڵبژارد بۆ موسڵمانانی مەدینە کەسەرەوکاریان بکەن، ئەمیش نەقیبێك بێت وەك ئەوان بۆ موسڵمانانی کوردزمان، یان ئەگەر نەقیبە دونیایە سەربازیەکەش بێت ئەوەش پلەو پۆستێکە کە هەرخزمەت ئەکات. جابۆیە لەمەودوا من لەجیاتی ناوەکەی خۆی پێی ئەڵێم:نەقیب عەبدول مەجید..

ناوبراو لەهەشتاکاندا لەتاو سەربازی ئەچێتە دێکانی قەرەداخ کەخۆشی خەڵکی جافەرانە، بەرپرسێك زۆری بۆدێنێ گوایە ئەبێت چەکێکیان لێبکڕێت بە سێسەد دیناری سویسری ئەورۆژەو ئەمیش چەك هەڵگرێت، وەگەرنا تا سبەی ئەیکوژێت!! ئەمیش ئەڵێت:پارەم نیە ئەگەر ئەمکوژن مەیخەنە سبەی هەرئەمڕۆ بمکوژن! بەرپرسەکە ئەڵێت: بۆگاڵتەت لێدێت؟؟بەهەرحاڵ دوای دووسێ ڕۆژ ئەو بەرپرسە جەڵتەیەك لێی داو خوا بەخۆیەوە سەرقاڵی کردو لەکۆڵ ئەم بوەوە.. ﴿ **وَلَا تَحْسَبَنَّ اللَّهَ غَافِلًا عَمَّا يَعْمَلُ الظَّالِمُونَ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ الْأَبْصَارُ** ﴾ **ابراهیم**:٤٢.

## لەحەج تۆم بینی:

شەوی ٤لەسەر ٥ی مانگی چوار ٢٠١٨ وتارێکم بۆکۆمەڵێك خوشکی بەڕێزدا لەبەکرەجۆ، یەکێکیان وتی: من کارگوزارم لەخەستەخانە زۆرخزمەتی

نەخۆشیێکم کرد کە کەسی وای نەبوو، دۆستێکم لەحەج هاتەوە سەردانم کردو بۆبەخێرهاتنەوە، کەچی وتی: هەقە من بەخێرهاتنەوەی تۆ بکەم و دەستت ماچ بکەم من تۆم لەحەج بینی وهاتیتە بەرچاوم و قسەشم لەگەڵ کردی وەرە بزانم تۆ چیت کردووە بۆخوا.. دیارە خوا ئەوخێروخزمەتانەی لێوەرگرتووەو بەحەجێك بۆی نووسراوەو ئەوەی ئەوژنەش بینیویەتی مژدەیەکە بۆی و موبەشیراتە تازیاتر خزمەت بکات..





## مامۆستا هەڤاڵ لەتەقتەقەوە

ئەم بەسەرهاتەتان بۆ دەگێڕێتەوەو ئەڵێت:

دوێنێ لەشاری هەولێر لەخزمەت مامۆستا مەلا ساڵح بوم، کەخەڵکی گوندی داربەڕولەی نزیك شاری کۆیەیە،لەخاڵوانمە چونکە لەگەڵ باپیرم لەدایکەوە ئامۆزان، بەسەرهاتێکی زۆرخۆشی خۆی بۆگێڕامەوە، منیش حەزدەکەم بۆئێوەی خۆشەویستی باس بکەم.

فەرمووی: ساڵی حەفتاکان بۆیەکەم جار بوومە مەلا لەگوندی (تیکالۆ)ی نزیك شاری هەولێر، پێشنوێژیم بۆدەکردن و وتارم بۆدەدان،هەموو نوێژەکان زۆر بەچالاکیو گورجوگۆڵی دەچوم بۆ مزگەوت و بانگ دان،مام حاجییەکیشی لێبوو لەبانگ هاریکاری دەکردم، تەنها نوێژی بەیانیان نەبێ نەدەچوم بۆ مزگەوت نەمن و نەکەسی تری ئاواییەکە نەدەچوین، جامەلا نەچێ ئەوان چۆن بچن؟

شەوێکیان لەخەوما کەسێکی نورانیو جوان لەدەرەوەی ئاوای بەرەوڕوم هات گوتیان ئەوە پێغەمبەرە، بۆیە منیش بەڕاکردن بەرەو ڕوی ڕۆیشتم سڵاوم لێکردو بەڵام ئەو زۆر بەتوڕەیی وەڵامی دامەوە و فەرموی: مەلاساڵح ئەوە بۆناچی بۆنوێژی بەیانیان؟

پاشان دووپەنجەی لەچاوم نزیك کردەوە زۆربەتوڕەیی وتی: سوێند بەخوا ئەگەر ڕۆژێکی تر لەنوێژی بەیانیان دوا بکەوی بەدوپەنجەیە هەردوو چاوت دەردەکەم.

لەترسا لەخەوەکەم ڕاپەڕیم، نزیك نوێژی بەیانی بوو، هاتمە سەرسەکۆیەکە خەریکی دەستنوێژ هەڵگرتن بووم لەم کاتەدا گوێم لێبوو ئەم مام حاجییەی هاریکاری دەکردم لەبانگ دان بانگی دەکردم مەلا مەلا..

منیش وتم: بەڵێ مام حاجی. وتی: هەڵساوی؟

وتم: بەڵێ.. وتی:خێرا وەرە بۆمزگەوت منیش وایێش تۆ دەڕۆم کورە زوو وەرە باچاومان دەرنەکەن.

کەوای وت تەزویەك بەلەشما هات زانیم مام حاجیش هەمان خەوی بینیوە..

وینەی مەلا صالح.



**وریاکردنەوەبەردەوامە:**

﴿ وَلَا يَزَالُ الَّذِينَ كَفَرُوا تُصِيبُهُمْ بِمَا صَنَعُوا قَارِعَةٌ أَوْ تَحُلُّ قَرِيبًا مِنْ دَارِهِمْ حَتَّى يَأْتِيَ وَعْدُ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لَا يُخْلِفُ الْمِيعَادَ ﴾ الرعد:٣١.

کافران بەهۆی کار و ئاکارێك کە دەیکەن هەمیشە بەڵایەکی ناگەهانی و لەناکاوی سەخت بەسەریان دێ، یان بەڵایەکی ناگەهانی و لەناکاوی سەخت دێتە پەنایماڵیان (و دەیانترسێنێ)بۆئەوەی بەئاگابێنەوە تا ئەو کاتە کە وەعدە و بەڵێنی خواد دێتەجێ (کە قیامەتە. ئەو کاتە سەزای ئەسڵی و جەزای سەرمەدی و ئەبەدیان دەدرێتەوە) بێگومان خودا خیلافی وەعدە ناکا.

جا خوای گەورە کە حەزناکات بەندەکانی کافربن و قایل نابێت بەوە (ولا یرضى لعباده الكفر ) وە وریایان ئەکاتەوە سابەڵکو بگەڕێنەوە، ئەوا بێگومان بڕوادارانیش ئاگادارئەکاتەوە ئەوە هیچ قورئان و فەرموودە ڕۆڵی سەرەکی ئەبینن و موسڵمانانیش بۆیەکتری وەك ئاوێنەن(وتواصوا بالحق وتواصوا بالصبر)، بەڵام زیاد لەوەش جاری واهەیە بەهۆی خەوو موبەشیراتێکەوە بڕواداریش ئاگادارئەکرێتەوە..

بۆنموونە مامۆستا هەڤاڵ لەبارەی خۆیەوە ئەڵێت: لە تەقتەق نزیکەی هەشتا منالّی بێباوك و چەند ماڵێکی هەژار مانگانە هاوکاریان بۆ وەردەگرین لە خێرخوازەکان، جاهەرکەسەو بەپێی توانای خۆی چەند بتوانێت ئەیدا،منیش زۆرماندووبووم لەدڵی خۆمدا وتم: ئیتر وازدێنم..

بۆبەیانی لەبازاڕبووم ژنێك هات بۆلام و وتی: مامۆستا ئەمشەو لەخەوما جەنابتم بینی رووگەش و نوورانی لەگەڵ پیاوێکی نوورانیدا بووی، پیاوە نوورانیەکە وتی: من فریشتەم و من روویم نوورانی کردووە چونکە هاوکاری منالّی بێباوك ئەکات.. ئیتر ئەم موبەشیراتە وای لێکردم کۆڵ نەدەم ودەست پێبکەمەوەو گوێ نەدەمە ماندووبوون..

**برای خۆشەویستم مامۆستا تاریق هەمەوەندی** (ئەندامی دامەزرێنەری پەیمانگای بانگخوازان) دەڵێت: لە قۆناغی ئامادەیی بووم، مزگەوتێکی نزیك هەبوو کەبانگی ئەدا ئەچووم نوێژم دەکرد، هاوەڵێکم هەبوو بەناوی بەکر کتێبەکانی مارکس و سەرانی شیوعی دەخوێندەوەو زۆرشارەزابوو، گومانی لەدڵما دروست دەکرد، منیش نەمئەزانی کوردی بخوێنمەوەو ئەوساش چەند نامیلکەیەکی مامۆستا حەبیب هەبوو، ئەوە زۆر بێتاقەتی کردبووم،

شەوێکیان خۆشەویستم بینی (د.خ) گەنج بوو، لەسەرکورسیەك دانیشتبوو بانگی کردم و فەرمووی:وەرە دانیشە، منیش چووم دانیشتم دەستم خستە سەر رانی، فەرمووی: کێشەت چیە؟ وتم: ئەو بەکرەی هاوڕێم شێتی کردوم و دڵی پڕکردووم لەگومان و ناتوانم وەڵامی بدەمەوەو نازانم چیبکەم. سەعاتم لەدەستا بوو سەیری کاتەکەم کرد سەعات و نیوێك قسەی بۆکردم و دەستی هێنا بەسەردڵماو فەرمووی: مەترسە ئیتر ئەو رادەکا لەتۆ..لەو رۆژەوەوە بەکر رای دەکرد لێم و موناقەشەشمان هەبوایە وەڵامم ئەدایەوە ورزگارم بوو.

بەکر پانزە ساڵ چوو بۆ ئەڵمانیاو هاتەوە خوا هیدایەتی دابوو، ئێستا دێت بۆ مزگەوت و نوێژدەکا.

**مامۆستا تاریق هەمەوەندی دەڵێت**: سەرەتای نەوەدەکان چوومە لای باپیرەم لەکەلارو وتم: لەگەڵ چەند هاوەڵێکمدا ئەمانەوێت مزگەوتێك دروست بکەین، باپیریشم وتی: خانویەکم بۆ پەیدابکەن من ئەم خانووەی خۆمتان بۆ چۆڵدەکەم کە سێ لای شەقام بوو.هەرچۆنێك بێت لە رێی خێرخوازانەوە پارەیەکمان پەیداکردوخانویەکمان بۆکڕی و ماڵی باپیرمان کرد بەمزگەوت، ئەهلی گەڕەك پێیان ناخۆش بوو یەك پیرنەدەهات بۆ مزگەوت و ئێمەش نزیکەی ٥٠٠ قوتابی لاومان ناونووس کرد بۆ وانە پێوتنیان.

لەیەکەم بەیەکادانی بزووتنەوەویەکێتی دا مزگەوتەکەی ئێمەیان داگیرکردو ماڵێکیان تێخست، ئێمەش هیچ دەسەڵاتمان نەبوو، من زۆر خەفەتم خوارد، تەنانەت تووشی قورحەی مەعیدەش بووم لەخەفەتا.

شەوێکیان لەخەوما رەسولی نازدار بێتاقەت بوو سەردانی ماڵی باپیرمی کردو فەرمووی بابچین بۆ مزگەوتەکە، چوین و فەرمووی بانگ بدە، وتم: بانگی چی

کەس نایەت، فەرمووی: بانگ بدە..بانگم داو خەبەرم بۆوە..رۆژێك ئەو پیاوەی خرابووە ماڵەکەوە هاتەلام و وتی: بەردەوام تووشی زیانی مادی ئەبم وتکاتان لێدەکەم خانوویەکم بۆبگرن و پارەی چەند مانگێکم بۆبدەن مزگەوتەکە چۆڵ ئەکەم ئەوەتەی چووینەتە ناوی وەزعمان خراپە، ئێمەش خانوومان بۆگرت وچۆڵیان کردو مزگەوتەکەمان وەرگرتەوە.ئەوسا ناومان نابوو مزگەوتی عوسمانی کوڕی عەفان و ئێستا ناوەکەی بووە بەمزگەوتی موسلیم.

سوپاس بۆخوا هەرجارێك دەچم واهەست دەکەم بە تەئسیری خەوەکە کە پێغەمبەری خوای لێیە.

ئێستا کەسانێك دێن نوێژی تیادەکەن کە نازناوی یەکێکیان رووسیەو یەکێکیان شیوعیە و خوا هیدایەتی داون.




***

## دکتۆر نیاز رۆژبەیانی:

دکتۆر لەوتارێکیدا ئەڵێت: نۆزدە بیست ساڵێك لەمەوبەر ماڵم لەهەولێربوو ئەم بەسەرهاتەم بینی، کابرایەك و زاواکەی هاوەڵی ئێرانیەك بوون بەناوی بازرگانیەوە مەوعیدێکیان بۆدانا هات و لەشوێنێکی چۆڵەوانی دایانە بەرفیشەك وپارەکەیان برد، ئەویش هاتبووە دەست و یەك فیشەکی نابۆوە بەقوڵی یەکێ لەدزەکانەوە، بەهەرحاڵ وازیان لێنەهێنابوو تا گیانی سپاردو شاردیانەوە، کوژراوەکە لەسەرەمەرگا وتبووی: خوا تۆڵەی منتان لێبکاتەوە.

دیارە لەنێوان خواو دوعای ستەملێکراودا پەردەنیە.. ئەوەبوو کابرای دزی قوڵ بریندار چووبووە خەستەخانە بۆچارەسەر، وتبوویان ئەوە جێی فیشەکە ئەبێ راپۆرتی پۆلیس بهێنی بەهەرحاڵ رێکەوتن کەئەوی تریان بڵێ دەمەقاڵێمان بووەو من فیشەکم لێداوە، ئەمیش عەفوی بکاو بەو فێڵە بیشارنەوە تاوانەکەیان، بەقەدەری خوا تائەم بەزم بازارەبوو بەخوێن لێرۆیشتن و چارە نەکردن کابرا مرد، ئەمی تریان گرت و وتیان: تۆکوشتوتە، ئەویش زۆری بۆهات و دانی نا بەتاوانەکەیانداو لاشەی ئێرانیەکەیان دەرهێنایەوەو سزای هەتاهەتایی بۆدەرکرا.. ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ اللَّهَ غَافِلًا عَمَّا يَعْمَلُ الظَّالِمُونَ ﴾.. ابراهیم.



## بەحسابەکەدا بچنەوە:

حاجی ئەیوب لەهەولێر شەریکەکەی بەبێ ئاگاداری ئەم دوکانێك ئەدات بەیەزیدیەك و دەیکا بەدوکانی مەی فرۆشتن، ئەویش زۆری پێناخۆش بوو ویستی لێی بسەنێتەوە، کابراش نەینەدایەوە و وتی:مەسرەفم تیاکردووە، حاجی ئەیوبیش چووە لای گەورەی یەزیدیەکان ئەویش وتی: وازی لێبێنن بۆخۆی کاسبی دەکات، بەهەرحاڵ پاش مفاوەزاتێکی زۆر کابرای یەزیدی وەزعەکەی ئیستیغلال کردو دوانزە دەفتەری سەند تا چۆڵی کرد.

پاش ماوەیەك لە سەفقەیەکدا تەلەفونیان بۆ حاجی ئەیوب کرد کە یانزە دەفتەرو چل گەڵای قازانج کردووە ئەویش پێی وتن: بەحسابەکەدا بچنەوە زیاترە ودوانزە دەفتەرە، پاش ئەوەی بەحسابەکەدا چوونەوە وتیان: راست ئەکەیت بەشی تۆ دوانزە دەفتەرە.(دڵنیابوو کە خوا هەقی بۆدەکاتەوە قورئان دەفەرمونێت: ﴿ قُلْ إِنَّ رَبِّي يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ لَهُ وَمَا أَنْفَقْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُ وَهُوَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ ﴾ السبأ:٣٩.

## شیفالای خوایە:

دکتۆر خالید جوبەیر کە پزیشکەو نەشتەرگەری دڵ دەکات لە سعودیە و بانگخوازە دەڵێت: برادەرێکی خواناسم کە ئەهلی رۆژوو شەونوێژە بۆی گێرامەوەو وتی: پار رەمەزان لە رووداوێکی ئۆتۆمبیلدا زۆر بەخراپی قاچم شکاو چوومە خەستەخانەی مەدینەوپزیشکەکان وتیان: ئەبێ قاچت ببڕینەوە، زۆر داوای لێبوردنم لە خوا کردو زۆر پاڕامەوە ( من لزِمَ الاستغفارَ جعلَ اللَّهُ لهُ من كلِّ ضيقٍ مخرجًا ومن كلِّ هم فرجًا ورزقَه من حيثُ لا يحتسِبُ ) الراوي عبدالله بن عباس -المصدر :الأحكام الصغرى صحيح الإسناد.

شەو لە خەودا حەزرەت (د.خ) پێی فەرمووم: قاچت مەبڕەوە، بەئیزنی خوا چاك دەبێت وبە پێی خۆت دەڕۆیت.وتم: تۆ کێیت؟ وتی: من (محمد) م پێغەمبەری خوا.

بۆبەیانی دکتۆر وتی: ها چی دەڵێیت؟ وتم:لەسەرخوا نایبڕمەوە.

سبحان الله دوای سێ ڕۆژ بە فڕۆکە بردیانم بۆ خەستەخانەی عەسکەری و دکتۆر موسەدید پێنج نەشتەرگەری بۆکردم و لەسایەی خواوە چاك بووم.

خوای گەورە دەفەرمویێت: ﴿ **وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجاً وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْراً** ﴾ الطلاق:٣.

هەرکەس لەخوا بترسێ دەرووی لێدەکاتەوەولە شوێنێکەوە بژێوی بۆ دەنێرێ کە بەخەیاڵیدا نایە و،هەرکێ خۆی بەخوا بسپێرێ، ئەوی بەسە، خوا بەمەبەستی خۆی دەگاو هەرچی بویێ دەیکا، دیارە خوا بۆ هەرشتێ ئەندازەیەکی داناوە.



# گەوهەری بەنرخی ئیسلام

دکتۆر مستەفا مەحمود دەڵێ: ساڵی ١٩٦٨ لە شاری ریباتی مەغریب ئافرەتێکی فەڕەنسیم بینی تەمەنی شەست ساڵێك دەبوو، باسی خۆی بۆ کردم و وتی: سی ساڵێك لەمەوبەر لەگەڵ کۆمەڵێك هاوەڵمدا هاتین بۆ مەغریب بۆ گەشتیاری، شەوێك لە ئوتێل لەخەوما پیاوێکی نورانی جل سپیم بینی هەستم کرد کە پێغەمبەری خوایەو قورئانێکی دامێ، کەخەبەرم بۆوە زۆر سەرسام بووم و بۆ هاوەڵەکانم گێڕایەوە، کردیانم بەکێوا، وتیان:ئەوە خەیالاتەو لەبیرخۆتی بەرەوە، سەردانی چەند رۆژهەلاتناسێکی بیانیم کردو گەیشتمە ئەو قەناعەتەی کەئەو خەوە ئاماژەیە بۆ ئەوەی دیراسەی ئیسلام بکەم.

هاوەڵەکانم ویستیان بگەڕێمەوە لەگەڵیان ،نەگەڕامەوەو دیراسەی ئیسلامم کردو موسڵمانبووم وبڕیارمدا لەمەغریب بژیم، پاش پانزە ساڵێك لە حەمام خۆم دەشت هەستم بەشتێ کرد لەسنگمدا چوومە لای پزیشك وتی: بەداخەوە شێرپەنجەیە لەمەمکتداو بلاویش بۆتەوە بۆسنگت و ماسولکەکانت و لە قۆناغەکانی دوایدایەو ناتوانین هیچت بۆ بکەین.

هاتمەوە نەخۆش و ناساغ لەشوقەکەمدا دەژیام،پاش ماوەیەك هەندێ لەهاوەڵە دێرینەکانم هاتنەوە مەغریب و سەردانیان کردم، کەمنیان بەو حاڵەوە بینی وتیان: وەرەوە لەگەڵمان لای ئێمە پزیشکی باشتر هەیەو چارەسەرت دەکەن.چی هەوڵیان لەگەڵدام نەچوومەوە.

شەو بەرماڵم داخست وکەوتمە نوێژکردن بەجۆرێك کە هەموو خانەکانی جەستەم لەنوێژدابوون، زۆرگریام وزۆر پاڕامەوە و وتم: خوایە تەنها تۆ شك دەبەم وەرە بەهانامەوە، ئەوەتا هاوەڵەکانم گاڵتەم پێدەکەن و بەدەروێشێکی سەرگەردان و نەفامم دەزانن.

هەر لەسەر بەرماڵەکە خەوم لێکەوت کە بۆ نوێژی بەیانی خەبەرم بۆوە، هەستم بەچاکی کردو دەستم دا لە سنگم هیچی تیانەمابوو، بەیانی چوومەوە لای پزیشکەکەم فەحسی کردم وسەری سوڕما کەچۆن ئەو نەخۆشیە لەجەستەمدا نەماوە.

دکتۆر مستەفا دەڵێت: خۆم نەمبینیایە رەنگ بوو بڕوام نەکردایە، سبحان الله بەڕاستی خوا هادی یە و خوا کافیەو خوا شافی یە..ئافرەتەکە پێی وتم: خوای گەورە گەوهەرێکی بەنرخی داونەتێ کەئیسلامەو ئێوە قەدری نازانن.



## دوعاو نوێژی پێویستی:

کاك ئەحمەدی شێخ ئەڵێت:" چەندجار بۆ کاری گرنگ (صلاة الحاجة)م کردووە، بەشی زۆری خوای مەزن قبوڵی کردوون. سوپاس بۆ خوا، هەموو کاتێ باوەڕم بەوە بەهێز بووە کە (صلاة الحاجة)م قبووڵ ئەکرێ ".

جا بۆ ئەم مەبەستە، خۆی ڕووداوێك ئەگێڕێتەوەو ئەفەرموێ:

" پیاوێك هەبوو لە شارەزوور ناوی مام قادر بوو، لەوەختی گەرمادا کاری بێڵکاری بوو تا نوێژی عەسر، بەهۆی ئەوەوە هەردوو چاوی کوێر بوون. ئەویش گورج سوار ئەبێ‌و لەگەڵ (معروف) ناوی کوڕیدا هات بۆ شاری سلێمانی، مەعروفی کوڕی هاتە لام وتی: باوکم کوێر بووە، منیش زۆر دڵم بۆی سووتاو، لەشەودا (صلاة الحاجة)م بۆ کرد. سبەینێ لەگەڵ شەبەقدا ڕۆیشتم بۆ مزگەوت، لە دەرگای مزگەوتدا چاوم بە مام قادر کەوت و پێم وت: کەفارەتی گوناهت بێ. خەم مەخۆ إن شاءالله هەتا من مابم نەفەقەی تۆ ئەدەم.. ئەویش وتی: یا شێخ مژدەبێ ئیمشەو چاوم چاك بوەوە. منیش بە بیستنی ئەم مژدەیە گەلێ سوپاسی خوام کردو، دوعاو دروودم بۆ گیانی پاکی پڕ بەرەکەتی پێغەمبەر نارد(ص)"(مەکتووباتی کاك ئەحمەدی شێخ/ ل١٠٤ / بەرگی دووەم).

## دکتۆری بانگخوازی سوری محمد راتب نابلسی دەڵێت:

لە تەاوفدا لە کاتی حەجدا پاڕامەوە لەخواو وتم: خوایە گیان شەرەفمەندت کردوم بەخزمەتکردنی پەیامەکەت و خەڵکی، ئەگەر بەڕاستی بۆ تۆم کردووە خۆم و کارەکەم بپارێزە، ئەگەر واش نیم بەفەزڵی خۆت پێش مردنم چاکم بکە.



بەڕاستی خوای پەروەردگارمان (حفیظ) ە، داوابکەن بتانپارێزێت لەو فیتنەیەی کە تووشی هەمووان دەبێت و کەسیش ناتوانێت فریات بکەوێت مەگەر ڕەحمی خوا، کەسێك دەناسم ٢٥ ساڵ لەسەر ڕێی ئیمان بوو، کەوتە داوی ئافرەتێکەوەو وازی لە نوێژەکانیشی هێناو عاقیبەت شەڕ بوو، قورئان بەخۆشەویستمان دەفەرموێت (د.خ) ﴿ وَمَنْ يُرِدِ اللَّهُ فِتْنَتَهُ فَلَنْ تَمْلِكَ لَهُ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا ﴾ المائدة: ٤١.

بەڕاستی خوای گەورە(حفیظ) ەو ئەمەش بەئاشکرا لەژیانماندا دەیبینین، پیاوێك سوێندی بۆ خواردم کە لەکاتی شۆفێریدا خەوی لێکەوتووەو خەویشی بینیوەو خوا بۆ خۆی پاراستوویەتی، ئەگەر ئەو نەبوایە بەهەموو حسابێکی بەشەری ئەبوایە تیابچووایە.دیارە ئەم پیاوە ئەجەلەکەی ماویەتی و تا ئەشگاتە ئەجەلەکەی فریشتەکان بە ئەمری خوا بەردەوام دەیپارێزن ﴿ لَهُ مُعَقِّبَاتٌ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ يَحْفَظُونَهُ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ ﴾ الرعد: ١١.

(بەندەش کاك جەمال مەجیدی برای خۆشەویستم بۆی گێڕامە کە لە هەشتاکاندا لە بصرەوە هاتبۆوە بۆ سلێمانی و خەوی لێکەوتبووبۆ ماوەیەك وخوا پاراستبووی لە وەرگەڕان وتیاچوون ).

## ئیشەکانی خواسەیرن!



عەلی طنطاوی ساڵی ١٩٠٩ لە سوریا لەدایك بووە.

ساڵی ١٩٣١ بووە بە مامۆستا .ساڵی ١٩٣٣ لیسانسی لە حقوقدا وەرگرت.ساڵی ١٩٣٦ هاتە عێراق و بووە مودەڕیس لەسانەوی مەرکەزی بەغدا.

لەساڵی ١٩٤٠ کە لەشام مامۆستا بوو، لەوتارێکدا هێرشی کردە سەر فەڕەنسیەکان و وتی: لەفەڕەنسیەکان مەترسن، هیچیان لەبارانیەو ئاگریان هیچ ناسوتێنێ و فیشەکیان کەس ناکوژێت، ئەگەر خێریان تیابوایە ئەڵمانیا پێی نەئەنایە خاکیانەوە.

بەهۆی ئەم وتارەوە نەیانهێشت مامۆستایەتی بکا بۆیە بووە قازی بۆماوەی بیست و پێنج ساڵێك، ساڵی ١٩٦٣ چووە شاری( ریاض ) و بووە مامۆستا لەزانکۆ.

٣٥ ساڵ لەمەککە بوو، لەساڵی ١٩٣٠ یەوە یەکەم بێژەری عەرەبە کە لە رادیۆوە قسەی کردووەو تاساڵی ١٩٨٠ وتاری پێشکەش کردووە لەرادیۆو تەلەفیزیۆندا.

پێنج کچی هەبوو بەنانیان شووی کرد بە عصام العطار بانگخوازی سوری کە چووە ئەڵمانیا موخابەراتی سوری لەوێ شەهیدیان کرد.

شێخ عەلی نووسەرو ئەدیبێکی گەورەیەو ژمارەیەکی زۆر پەڕاوی هەیە کە سوودێکی زۆری گەیاندووە بەموسڵمانان.

شێخ عەلی دەڵێت: کە قازی بووم شەوێکیان لەگەڵ برادەرانمدا لەجێیەك دانیشتبووین، زۆر هەستم بەدڵتەنگی دەکرد، خەریك بوو بخنکێم، بۆیە بەجێم هێشتن و لەرێگا کەتاریك بوو گوێم لە گریانی ژنێك بوو، چوومەلای و لێم پرسی بۆ دەگریت؟ وتی: مێردەکەم تەلاقی داوم و نایەڵێ منداڵەکانم ببینم و کەسیشم نیە.

منیش پێم وت: بچۆ بۆلای قازی شکاتی لێبکە. ئەویش وتی: منی داماو بەچی دەگەمە لای قازی..

جا شێخ عەلی دەگریاو وتی: نەیزانی کەئەو بێدەسەڵاتەو داماوەو ناگاتە لای قازی خوا قازی ئەهێنێ بۆ لای ئەو. ساڵی ١٩٩٩ لەمەککە گیانی سپاردو هەر لەوێش بەخاکیان سپارد.

## لەدایکبوونی شەعراوی

شێخ صابر لە مزگەوتی دێکەیان لە (دوقادوس) لە نوێژی بەیانیدا (متولی) خوشکەزای نەدی، دڵی ترسا کە ئاخۆ بۆ دواکەوتبێ، زۆری نەخایاند بەپەلە (متولی) پەیدا بوو فریای نوێژی بە کۆمەڵ کەوت.

شێخ صابر لێی پرسی: بۆچی دواکەوتیت؟

متولی وتی: خاڵە گیان هاوسەرەکەم لە ژان و ژوور و منداڵ بوون دایە.

شێخ صابر وتی: خەوێکم پێتانەوە دی، لە خەوما جوجەڵەیەکم دی لەسەر مینبەر، پرسیارم کرد: ئەمە کێیە؟ وتیان: ئەوە کوڕی متولی شەعراوییە.

بۆیە زانیم کە ژنەکەت کوڕی دەبێت و، ئەشبێتە زانا.

متولی زۆر دڵی بەم خەوە خۆش بوو (بەتایبەت کە خاڵی پیاوێکی زۆر ساڵح و بۆخوا سوڵحاو بوو).

کە گەڕایەوە ماڵەوە مژدە یان دایە کە کوڕی بووە، لە خۆشیا هاواری کرد، خەوەکە هاتە دی، خەوەکە هاتەدی.

وتیان ناوی دەنێی چی؟ وتی ناوی دەنێم ئەمین.

براژنەکەی منداڵێکی هەبوو زۆری خۆشدەویست ناوی (محمد) بوو، (ئەمین) ی هەڵگرت و بردی ناوی تۆمار بکات، کە پرسیاریان لێکرد ناوی چییە؟ وتی: ناوی (محمد) ە، بەم شێوەیە ناوی (محمد) ی بەنسیب بوو. تا ماوەیەکی زۆر لەدێکەیاندا بە (ئەمین) بانگیان دەکرد و لە تەسکەرەشدا ناوی (محمد) بوو.

## شێخ صالح مەغامسی

بانگخوازێکی سعودیەو ئیمام و خەتیبی مزگەوتی قوبایە لە مەدینە لە کەناڵی نور دبی لە بەرنامەی (أهل القران) دا دەڵێت: لە لوبنان عەمەلیاتی کراوەی دڵیان بۆ کردم،پاش ٢٤ کاتژمێر کە هاتمەوە هۆش خۆم لە ژووری چاودێری چڕدا (العناية المركزة)، دکتۆرەکان و یاریدەدەرەکانیان هاتن کە چواردە کەس بوون بە تایبەت دکتۆر ئادەم سۆدانی، بە دەم چاویانا هەستم دەکرد حاڵەتەکە باش نیە، چونکەجیهازەکان لە ژوور سەرم بوون ومن هیچم نەئەدی، دکتۆر پێی وتم: شێخ صالح بە ڕاستی پێت بڵێم خوێنی کۆبووەوە هەیە لە ناو دڵتدا و ئەبێ عەمەلیاتەکەت بۆ بکەینەوە، منیش ناچار شایەتمانم هێنا و هەرچەند دەترسام بەسەر ئیشارەتم کرد کە ڕازیم، ویستیان جیهازەکانم لێ بکەنەوە، دکتۆر کەمامەی بەست بەدەمیەوە بچێت بۆ ژووری عەمەلیات و منیش بەرن، پەرستارێکی لوبنانی

ئافرەت کە لەلای چەپمەوە بوو، خوا خستیە دڵیەوەو پێی وتم: یا شێخ صلوات بدە لەسەر خۆشەویستﷺ چارەسەر دەبێت، منیش وتم: اللهم صلی علی سیدنا محمد وعلی الە وصحبە وسلم، خوا ئاگادارە لە چەند خولەکێکدا خوێنەکە دابەزی و نەماو ئیشاراتی جیهازەکان گۆڕان، دکتۆر ئادەم هاتەوەو وتی: یا شێخ ئەوەی کەویستمان بۆت بکەین خوای گەورە بۆی کردیت.



(شیخ صالح مغامسی لە پیش عملیاتی گەورەی دلی و لەکاتی عملیاتەکە)

خۆشەویستمان(د.خ)کاتی خۆی بە ئوبەی فەرموو: بەصلوات هەم و غەمت نامێنیّ و کێشەکانت چارەسەر دەبن.

ئەمەش بوو بەدەرس بۆم کە لەخۆمەوە حوکم نەدەم بەسەر ئافرەتێکدا کە باڵاپۆش نەبێ، کەبڕوا ناکەی هیچ لەبارەی ئیسلام و خواوە بزانێ، من ئیمام و وتاربێژم ئەوەم بەخەیاڵدا نەهات ئەو ئافرەتە بیری خستمەوە خوا پاداشتی بداتەوە کەبەزەیی بەحاڵمدا هاتەوەو خوای گەورەش بەوە رزگاری کردم.

# نوێـژی بـارانبـارین

لە جەزائیر سەرۆکی ئەوکاتە (هواری بۆمدین)، بەنداوی (غرین) ی کردەوە و، لە وتارەکەیدا وتی:

سوپاس بۆ خوا، بەنداوی (غرین) مان دروستکرد، ئەم بەنداوە ئەوەندە مەتر سێجا ئاو دەگرێت، دەتوانن زەرعاتی لەبەردابکەن باران بباریێت یان نا، عیبارەتەکەیم لا جوان نەبوو، بە وەزیری دەرەوەیانم وت: بە سەرۆك بلێ: قسەکەی هەڵەیە، لە ناحیەی شەرعیش و زانستیشەوە، ئەگەر باران نەباریێت بەنداوەکەش ئاوی تیا نابێت. خوا کردی پاش چەند هەفتەیەك بێبارانی دەستی پێکرد، بۆیە ناچار بوون، نوێژی باران بارین بکەن، هی واهەبوو گاڵتەی بە وەزعەکە دەهات، نوێژی چی و بارانی چی!

لە مزگەوتی گەورە لەگەڵ وەزیری ئەوقاف دا چاوەڕێی سەرۆکمان دەکرد بێت و نوێژەکە بکەین، پاش ماوەیەك سەرۆك بۆمدین هات و پێش ئەوەی دانیشێت، بە وەزیری ئەوقافم وت: بە سەرۆك بلێ دوو ركات نوێژی تەحیەتول مەسجید بکات، خۆت دەزانی ئێمە هاتوین، دەست لە خوا پان دەکەینەوە و سواڵی لێدەکەین. وەزیری ئەوقاف چوو پێی وت و دوو ركات نوێژەکەی کرد، دوایی نوێژی بارانبارینەکەشمان کردو، بێدەنگ دانیشتین، زۆری پێچوو، بە یەکێك لەوانەی تەنیشتم وت: تاکەی وادانیشین، بابڕۆینەوە ماڵەوە؟ وتی: بێدەنگ بە، بێدەنگ بە!

وتم: بۆ چی بووە؟!

وتی: ئەی نازانی لەدەرەوە باران دەباریێت.

وتم: بەڕاستە، وتی: بەڵێ.. چوون چەتر بێنن بۆ سەرۆك تا تەڕنەبێت.

وتم: سوپاس بۆ خوا، سوپاس بۆ خوا، شەرت بێ لەم مزگەوتە تا دوای نوێژی ئێوارە دەرناچم، وەك شوكرێك بۆخوا كەسرتی كردین و دوژمنانمان پێخۆش نەبوو، بە دوعای موسڵمانان بارانەكە باری!

## خـوا تۆڵـەسـێنە:

لە ٢٠١٢/٥/٢ كە لە عومرە بووم و لەلای (باب السلام) عومرەكارانی خۆمان كۆبووبوونەوە دوای نوێژی بەیانی و منیش هەندێ قسەم بۆ كردن لەسەر خۆشەویستی حەزرەت و گەورەیی ئەو زاتە موبارەكە (ﷺ). دوای وتارەكە یەكێك لە ئامادەبوان هاتەلام و وتی: مامۆستا من خەڵكی دێی (ق. م) لەلای سەیدسادق، لە كاتی شەڕی بزووتنەوە و یەكێتیدا، یەكێتی سەیتەرەیەكیان لای دێیەكەی ئێمە دانابوو، ڕۆژێك لە مزگەوتەكەماندا كۆیان كردینەوە، لەوكاتەدا گەنجێكی دوور لە خوا بە پێڵاوەكانیەوە هاتە سەر فەرشەكان، یەكێ لە ئەهلی مزگەوت وتی: فلان هیچ نەبێ پێڵاوەكانت دابكەنە، ئاخر ئەمە مزگەوتە، ئەویش بەوپەڕی نالەباریی و لەخۆبایی بوونەوە وتی: پێڵاوەكانی من لە مزگەوتەكە پاكترە، پەنا بەخوا هی وا هەیە تەواو شوڵی لێ هەڵئەكێشێ، ئەمە زیادەڕۆییە كە هەق نەبوو بیكات..

سبحان الله دوای دوو سێ ڕۆژ لوغمێك لەوناوە دانرابوو لەو هەموو خەڵكەدا بەودا تەقیەوە و قاچێكی پەڕاند و قاچەكەی تریشی كۆڵەوار كرد، چەند مانگ لە ئیمێرجنسی سلێمانی بوو. ئاشكرایە ئەوە تۆڵەی خوایە بۆ هەركەسێ كە زیادەڕۆیی بكا و سنووری ئەدەب ببەزێنێ بەرامبەر پیرۆزییەكان.



وێنەی نوسەر لە کاتی وتاردان لە مزگەوتی پێغەمبەر لە مدینە

## پاڕانەوە لەخودا:

دکتۆر عبدالمحسن الأحمد (کە پزیشکێکی بانگخوازی سعودیە) دەڵێت: لە خەستەخانە ژن و پیاوێکم بینی کە منداڵەکەیان تووشی ئیلتیهابات بووبوو بەهۆیەوە گورچیلەکانی باش کاریان نەدەکرد و لەشی ئاوسابوو چیمان ئاو ئەدایە و چیمان ئاو تێدەکرد میزی نەدەکرد، دەبوایە بە پەلە غەسلی گورچیلەی بۆ بکرێت، ساڵەی عەمەلیات ئامادەبوو، لەوەدابوو منداڵەکە بەرن تا لەژێر نەشتەرگەریدا بۆری لە ڕانیەوە بۆ دابنێن، چونکە دکتۆرەکان چەند هەوڵیان دابوو لەبەر ئاوساوی لەشی دەمارەکەیان نەئەدۆزیەوە. منیش کە دایك و باوکیم بینی چاویان

سوور بووبوو لە گریاندا وتم: نوێژی ئیستیخارەتان کردووە، وتیان: نەخێر وا ئێستا دەیبەن بۆ عەمەلیات، وتم: خێرا بڕۆن ئیستیخارە بکەن و بەکوڵ و دڵ دوعا بکەن، پیاوەکە چووە شوێنی نوێژی پیاوان و ژنەکەش چوو بۆ شوێنی نوێژی ژنان، دیارە زۆر پاڕابوونەوە، کات سەعات دوو و نیوی عەسر بوو، لە ساڵەی عەمەلیاتەوە تەلەفۆنیان کرد کێشی مناڵەکە چەندە، کە پێیان ڕاگەیاندن وتیان: سۆندەمان بۆ ئەو تەمەنە نییە دەبێت لە خەستەخانەی عەسکەرییەوە بۆی بێنین بۆیە عەمەلیات و غەسلەکە دەکەوێتە سبەینێ، ئێوارە لە ماڵەوە سەعات هەشت و نیو تەلەفۆنیان بۆ کردم سوپاس بۆ خوا مناڵەکە میزی کرد و بەمەش خوای گەورە ڕزگاری کرد لە عەمەلیات و غەسلەکە.

جا بۆیە تەنها خوایە کە دێ بەهانای بەندەکانیەوە، هەر خوایە کە پەنای بێ پەنایانە، جا ڕەنگە یەکێ بلێت: بۆ لەکاتی بێ ئومێدبووندا لە هەموو هۆکارێکی دنیایی، خوای گەورە وەڵام ئەداتەوە، دیارە خوای گەورە دەیەوێت کە بۆ بەندەکەی بسەلمێنێ کە ئەگەر هەموو دەرگاکانیش داخران دەرگای ڕەحمەتی خوا دەمێنێ، کە هیچ شتێك نییە خوا دەستەوسان بکات: ﴿ **أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَكَانُوا أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعْجِزَهُ مِن شَيْءٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ إِنَّهُ كَانَ عَلِيماً قَدِيراً** ﴾ فاطر: ٤٤. بەڵێ لەم جۆرە دەنگوباسانە زۆرن:

برادەرێك بەناوی دکتۆر کاروان چەند ساڵێك لەمەوبەر لە سەید سادق دکتۆر بوو، دەگێڕێتەوە کە مناڵێکیان دەهێنا بۆلای نەخۆشی دڵی هەبوو، دایك و باوکەکەشی هەژار و نەداربوون، پێی وتن کە بیبەن بۆ سلێمانی عەمەلیاتی دەویست کە ئەویش چەند دەفتەری تێدەچوو. پاش ماوەیەك دەیانبینێتەوە لە سلێمانی، ئەحواڵی کوڕە بچووکەکەیان لێ دەپرسێت، باوکەکەی دەڵێت سوپاس

بۆ خوا باش بووه، وتی: عەمەلیاتەکەتان بۆ کرد؟، وتی: نەخێر، شەوێکیان لە خەوما کورەکەمیان لێوەرگرتم و عەمەلیاتیان بۆ کرد و دایانەوە دەستم، کە خەبەرم بووەوە سەیرم کرد منداڵەکە لە خەوێکی قورسدایە، گوێم نەدایە، وتم: هیچ نییە، دیارە خەوێکم دیوە و هیچی تر. پاش دوو سێ ڕۆژ دایکی دەیبات دەیشوا سەیردەکات جێگای تەقەڵی عەمەلیات بەسەر سنگیەوەیەتی، زانیم کە خوا بە فەزڵ و کەرەمی خۆی بەسەری کردووینەتەوە و هەر ئەوە کە پەنای بێ پەنایانە..

## لە پەڕاوی لە خزمەت قورئاندا:

دوو ڕووداوی ترم باس کردووە، کە بۆ خۆمیان گێڕاوەتەوە، یەکێکیان باوکی کاك (ڕەجا حەمە عەلی) لە هەڵەبجە کە بەهەمان شێوە لە شەستەکاندا عەمەلیاتیان بۆ کردبوو، یەکێکی تریشیان کاك عبدالظاهر باهیر کە ئەوکاتەی لە بەغدا عەسکەر بوو بە هەمان شێوە عەمەلیاتی گورچیلەیان بۆ کردبوو لە خەویا و جێگەی تەقەڵەکانیشی دیاربوون، ناوبراو ئێستا لە کەرکوك دائەنیشێ. ئافرەتێکیش لەم ساڵانەی دواییدا لە چەمچەماڵ ئینزیلاقی فەقەراتی دەبێت و هاتوچۆی دکتۆرێك دەکات لە کەرکوك، پاش ماوەیەکی زۆر شەوێك لە خەویا دکتۆرەکەی عەمەلیاتی فەقەراتی بۆ دەکات و بەیانی هەست دەکات ئازاری نەماوە و چاك بووە، ڕۆژنامەی هاوڵاتی چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئافرەتەکە کرد و پاشان چوونە لای دکتۆرەکەش، ئەوەی سەیرە دکتۆرەکە وتی: بەڵێ لەو شەوەدا لە خەوما چووم عەمەلیاتم بۆ ئەو ژنە کرد.

ئەمانە بۆ ئەوە ناڵێین کە نەچین بەرەو دکتۆر و دەرمان و بەتەما بین کە لە خەودا چارەسەرمان بکەن، نەخێر بەڵکو دەبێت هەموو هۆکارێك بگرینەبەر و لە

دڵیشەوە پشت بەخوا ببەستین و ئیمان یەقین بێت کە تەنها خوا شیفادەرە، کاتێ حەزرەت (ﷺ) دەچوو بۆلای نەخۆشێك ئەم دوعایەی بۆ دەکرد: (اذهِبِ البأسَ ربَّ الناسِ، اشفِ وأنتَ الشافي، لا شفاءَ إلا شفاؤك، شفاء لا يغادر سَقَمًا) مسلم.. داوابکەن، بپاڕێنەوە، خوا پەروەردگاری ئاسمانەکانە و پەروەردگاری زەویشە. کاتێ داوادەکەن داوا لە خوایەك دەکەن کە نزیکە (قریب) نەك هەر نزیك چونکە هی وا هەیە نزیکە لێت و گوێت پێنادات، نایە بە هاناتەوەو گرنگ نیت بەلایەوە، بەڵام خوای پەروەردگار وا نیە (قریب مجیب) ە، نزیکە و وەڵامدەرەوەی بەندەکانیەتی.. ﴿ وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ هُوَ أَنْشَأَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَاسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُجِيبٌ ﴾ هود:٦١.

باشترین وەڵامدانەوە و بەهاناوە هاتن لای خوایە، ئەوەتا سەیرکەن چۆن دێت بەهانای حەزرەتی نوحەوە ﴿ وَلَقَدْ نَادَانَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ الْمُجِيبُونَ (٧٥) وَنَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ مِنَ الْكَرْبِ الْعَظِيمِ (٧٦)﴾ الصافات.. خوای گەورە شەرم دەکات لەوەی کە بەندەیەکی دەست بەرزبکاتەوە و بپاڕێتەوە و بە دەستی بەتاڵ بیگێڕێتەوە، جا یا کارەکەی بۆ دەکات، یان بەلا و موسیبەتێکی لەسەر لا دەبات. حەرزەت (ﷺ) دەفەرموێت: (إن الله حيٌّ كريم يستحي من عبده أن يرفع إليه يديه ثم لا يضع فيها خيرا) حاکم ریوایەتی کردووە لەنەسەوە. ئیمام ئەحمەد دەپاڕایەوە و دەیوت: پەروەردگارا هەوەك چۆن ڕووت پاراستووم لە سوجدە بردن بۆ غەیری تۆ، ئاواش ڕووم بپارێزە لە داواکردن لە غەیری تۆ.

***

## شێخ عبدالقادر دەهمان

بانگخوازێکەو دەڵێت: برادەرێکم بۆی گێرامەوەو وتی: لە بەریتانیا بووم دەمویست بگەڕێمەوە، مەوعیدی تەیارەکەم لێتێکچوو فریای تەیارەکە نەکەوتم، رەحلەیەکی ترم حیجزکردو بەداخ و خەمێکی زۆرەوە گەڕامەوە ئوتێل. کەگەشتمەوە ئوتێلەکە بەرپرسی پرسگەکە وتی: لەخەستەخانەوە کەسێك تەلەفونی کردووەو موسڵمانێکیان دەوێت.

لەبەرخوا چووین بۆ لای بەرێوەبەری خەستەخانەکەو خۆمان پێناساند، ئەویش وتی نەخۆشێکمان لایە ئەیەوێت موسڵمان ببێت. کەچوینە لای نەخۆشەکە تەمەنی چل و پێنج ساڵێك دەبوو لەسەردەستما موسڵمان بوو، هەندێ باسی ئیسلاممان بۆکردو خۆی شت و دەستنوێژی شت، سەرگوزەشتەی خۆی بۆگێڕامەوەو وتی: من سەربازبووم لە کەتیبەیەکی بەریتانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان و لە ولاتێکی رۆژهەلاتی ئاسیابووم، کتێبێکم لەبارەی ئیسلامەوە دەستکەوت، خوێندمەوەو پانزە ساڵ بە ئاواتی ئەوەوە بووم موسڵمان ببم، کەگەڕامەوە بەریتانیاو چەند بەناو موسڵمانی خراپم بینی ساردبوومەوەو وتم موسڵمان نابم، بەلام دوێنێ شەو لەخەوما کەسێکم بینی کە پێغەمبەری ئیسلام بوو پێی وتم: (سەیرکردنی حاڵی خەڵك سەرقاڵی کردیت لەوەی خۆت رزگاربکەیت و شوێن ئاینەکەم بکەویت).

بۆیە کەلەخەو هەستام وتم: ئەبێ بەزوویی موسڵمان ببم، وا خوا ئێوەی بۆناردم.

ئەم پیاوە لای ماینەوە دوای دووسەعاتێك باری تەندروستی خراپتر بوو، ئێمەش دڵمان نەهات بەجێی بهێڵین، تاوەفاتی کردو بردمان شتمان وکفنمان کردو لە قەبرسانی موسڵمانانداناشتمان.

## حاجی عەبدولا:

خەلکی پێنجوین بوو دۆستێکی خۆشەویستم بوو، من و خێزانم سەردانمان دەکردوو رێزو خۆشەویستی لە نێوانماندا هەبوو. ئەم حاجی یە قورحەی گەدەی هەبوو، هەموو رەمەزانێك بەیانیان پارشێوی دەکردو تا ئێوارە ئازاری زۆر هەراسانی نەکردایە نەیدەشکاند، ناوبراو ئەچێ بۆ حەج لە هەشتاکاندا، لەمزگەوتی رەسولی نازدار خەوی لێدەکەوێت و لەخەویا حەزرەت (ﷺ) پارچەیەك نانی تیری بەدەمی موبارەکی تەڕدەکات و ئەیدا بەحاجی عبداللە و ئەویش دەیخوات و، پاشان کە خەبەری دەبێتەوە بە فەزڵی خوا بەیەکجاری ئازاری گەدەی نامێنێ و خوا شیفای ئەدات.

حاجی برایەکی هەبوو بەناوی کاك عومەر سەدو هەشتا پلە پێچەوانەی ئەم بوو، بێ دینی تەواو بوو، بەلام خۆی و هاوسەرەکەی زۆر خزمەتی دایکی دەکردو دایکیشی هەمیشە دوعای هیدایەت و سەرفرازی بۆ دەکرد.

کاك عومەر بە جۆرێك تووشی ئازاری پشت بوو کە نەیدەتوانی راست بێتەوەو نەیدەتوانی پانتۆڵ لەپێبکات، شەرواڵی لەپێدەکردو دەچوو بۆ دوکانەکەی لە قەیسەری نەقیب لە سلێمانی، شەوێك لە خەویا پێی دەڵێن:ئا پاڵ کەوە و پێیەك دەنێن بە پشتیاو دەڵێن: دەی هەستە، کە ئەیەوێ هەستێ خەبەری دەبێتەوە، ئازاری نەماوە، یەکسەر بەژنەکەی دەڵێت: بەرماڵم بۆ بێنە با رووبکەمە خوا ئیتر تەواو، لەوساوە بۆتە خواناسێکی باش و بەردەوام گوێ لە قورئان دەگرێت لە دوکانەکەیدا.

***

## دۆزینەوەی سەیارە

دکتۆر عبد المحسن الاحمد دەڵێت: لە (ریاض) برادەرێك بە ناوی تورکی ئۆتۆمبیلێکی مۆدێل تازە دەکرێت و زۆر دڵی پێ خۆش دەبێت، کەچی بە داخەوە لێی ئەدزن، ئەمیش برادەرێکی دڵسۆزی دینداری دەبێت کە هەواڵەکە دەبیستێت زۆر خەمبار دەبێت، ئەوەندەی برادەرەکەی خۆش دەوێت ئامادە ئەبێ ئۆتۆمبیلێکی بۆ بکرێتەوە، بەڵام ئەزانێ کە لێی وەرناگرێ.

بۆیە بڕیار دەدات کە خێر و چاکەیەك بکا و بکەوێتە گەڕان بۆی، خۆی دەڵێت: ڕۆژی هەینی بوو، هەرچەند زۆر ماندوو بووم، چووم لەبەر خوا سەردانی پورێکی کەفتەکارم کرد کە ماڵیان دووربوو، ئنجا پاڕامەوە لە خواو وتم: خوایەکە تۆ هیچ شتێکت لێ ون نابێت، هەروەك لوقمانی حەکیم بە کوڕەکەی دەڵێت: ﴿ يَا بُنَيَّ إِنَّهَا إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِي صَخْرَةٍ أَوْ فِي السَّمَاوَاتِ أَوْ فِي الْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴾ لقمان:١٦.

واتە: کوڕی خۆم ئەگەر دەنکە خەرتەلەیەك لەناو بەردا بێت، یان لە ئاسمانەکان بێت (ئوتومبێلەکە لە نێوان ئەستێرەکان دا هات و چۆ بکات) یان لەسەر زەوی بێت، ئێ خۆ شاری (ریاض) بچوکترە لە گۆی زەوی، خوا دەستی دەیگاتێ و ئاگادارێتی، خوایە یارمەتیم بدە ئەو سەیارەیە بدۆزمەوە، لەم دوعا و خەیاڵاتانەدا بووم و سەیارەیەکی بچووکم پێ یوو لێم دەخوڕی، خۆشم نازانم چۆن لەجیاتی ئەوەی بەلای ڕاست دا بڕۆم بەلای چەپا ڕۆشتم دیار بوو قەدەری خوا بوو، یەك دوو تاسە هاتە ڕێم سوکم کردەوە کە سەیری قەراخ جادەکەم کرد ئوتومبێلێك لەنێوان دوو ئوتومبێلی تردا ڕاگیرا بوو لە سەیارەی برادەرەکەم دەچوو، تەلەفونم بۆ برادەرەکەم کرد و وتم: ژمارەی ئوتومبێلەکەت چەند بوو؟ کە ژمارەکەی پێوتم هەمان ژمارەی ئەو سەیارەیە بوو کە ڕاگیرا بوو یەکسەر

لەسەر جادەکە سوجدەی شوکرم برد، وتم: وەرە سەیارەکەتم دۆزیەوە، بڕوای نەکرد وەیزانی سوعبەتی لەگەڵ دەکەم، دوایی هات و لە فەزڵی خواوە دەستی کەوتەوە. ﴿ وَلِلّهِ الأَسماءُ الحُسنى فَادعُوهُ بِها.. ﴾ الاعراف: ١٨٠.

## چوار ئــەزمــوون

زۆر جار لەم لاو ئەولاوە ئەزموونی کەسانێکی زۆرم بۆ گواستوونەتەوە، جا نەك بمرم پێم باشە چوار ئەزموون کە بەندە پیایانا تێپەڕیوە بۆتان تۆماربکەم، بەڵکو سوودی لێوەرگرن:

### یەکەم: خوا رزگاری کردین:

لە کۆتایی ساڵانی هەشتاکاندا هاوسەرەکەم لە قوتابخانەی گزنگی سەرەتایی لە گەڕەکی رزگاری شاری سلێمانی مامۆستا بوو ئەو سەردەمە باڵاپۆش کەم بوو کە بەعسیش نەبوایە وەك ئیسلامیەك حسابی بۆدەکراو خەتەر بوو، رۆژێك بەڕێوەبەری پەروەردەی ئەو کاتەو رەفیق حیزبیەك کە (جابی پاصی حکومی بوو بەهۆی حیزبەوە زل کرابوو) سەردانی ئەو قوتابخانەیە دەکەن و کۆبوونەوە لەگەڵ مامۆستاکاندا دەکەن، بەهەرحاڵ خێزانم کە باڵاپۆشەو سەر بەوان نیەو مامۆستایە هەڕەشەی لێدەکەن و رەفیق حیزبیەکە دەڵێت: ئەگەر نەیەیتە ڕیزەوە دەتبەین بۆ ئەمن و خۆمان دەزانین چیت لێدەکەین، بەهەرحاڵ ئەوانەی لەو سەردەمەدا ژیابن ئەزانن هەڕەشەی بەعسیەکان ئاسان نەبوو چونکە چیان بوویستایە دەیانکرد، بۆیە خێزانەکەم ئەو رۆژە زۆر لەخوا دەپاڕێتەوەکە بێت بەهانایەوەو لە شەڕی ئەو ستەمکارانە لای بدات. دوعاکەی خۆشەویست ئەکات کەلەکوڕی ئەبوجەهلی کردبوو ،وتی:خوایە سەگێك لەسەگەکانتی بۆ بنێرە.

بەیانی سەعات هەشت کە دەچێت بۆ قوتابخانە لەرێگا لای ساحە ترایيەکەی جاران (کە ئێستا گەلەری رەند) ەکەسێك دەبینێ لەسەر شۆستەکە کوژراوەو خێرخوا بەتانیەکی پیاداوە. کە دەگاتە قوتابخانە دەڵێن ئەزانی ئەوە کێیە کوژراوە، وتی: نەخێر. وتیان ئەوە رەفیق حیزبیەکەی دوێنێ بوو!!

خوایە لێت بەزیاد بێت هەزاران هەزار سوپاس بۆتۆ کە پشتی زاڵمان ئەشکێنی و ئەیانکەیتە پەندو عیبرەت بۆ هەموو ئەوانەی سەرسەختی پیشەیانە. لەفەرموودەی قودسیدا هاتووە (**من آذى لي وليا فقد آذنته بالمحاربة**). واتە: هەرچی ئازاری دۆستێکی من بدات خۆم دەجەنگم لەگەڵیدا.

## دووەم: دۆزینەوەی سەیارەکەم:

ساڵی ١٩٩١ سەرەتای راپەرینەکە سەیارەیەکی کۆرۆنای سپی مۆدێل ١٩٧٩م هەبوو، ئەندازیاربووم لە خۆجێیەتی سلێمانی، ئەو کاتانە دوعام دەکردو دەموت خوایە حەزدەکەم دەستی تۆ، دەسەڵاتی تۆ ببینم، تاوەك بانگخوازێك باشتر بتناسم و باشتر بانگەوازت بۆ بکەم!!

ئەوسەردەمە پاشا گەردانی بوو سەیارە دزین زۆربوو، پۆلیس و ئاسایش و حکومەت سەقامگیرنەبوبوون وەك خۆیان دەڵێن حکومەت ساوابوو! (کەبەداخەوە تا ئێستاش پاش زیاترلە ٢٧ساڵ هەمووگیانی گەندەڵییە و گەورەنەبووە!!).

لەوماوەیەدا چەندجار خەوم دی سەیارەکەم ئەدزرێت، منیش تەواو حەزرەرم وەرگرتبوو نەم ئەوێرا لەزۆر شوێن بەجێی بهێڵم، رۆژێکی هاوین سەعات دوو چووم بۆ پرسەیەك لەمزگەوتی (حاجی ساڵح بۆسکانی) لە تووی مەلیك لەسلێمانی. بیرم کردەوە سەیارەکەم لەبەر ماڵی یەکێ لە برادەرەکانم دابنێم

لەوناوە، بەلام لەبەر ئەوەی هاوین بوو نەمویست عەزیەتی کەس بدەم، بەقەدەری خوا تاهاتمە دەرەوە لەمزگەوت سەیارەکەم دزرابوو.

کاك وشیار رەسولّ بەسەیارەکەیەوە زۆر عەزیەتی کێشاو گەڕا لەگەلّما، مانگێك و پێنج رۆژ گەڕاین دیارنەبوو، کاك وشیار دەیوت: دوعام کردووە خۆم بیدۆزمەوە. ناوبەناو خەوم ئەدی ئەیدۆزمەوە، ئاخرجاریان بە هاوسەرەکەم وت: زۆر سەیرە خەوم دی ئەدزرێ دزرا، کەچی خەوئەبینم ئەیدۆزمەوە بۆ دیارنیە؟!

ئەو رۆژە سەعات دووی دوای نیوەڕۆ بەسەیارەکەی لە جادەی قەناتەوە دێتو، لەلای دوکانێکی فولکەی دەستەکەوە سەیارەیەکی کرۆنای سپی دەبینێت، کاتێك دەگاتە لای باخچەی گشتی ئەلّێ بۆ نەگەڕێمەوە خۆ ئەوسەیارەیە زۆر لە سەیارە دزراوەکە دەچێت تا لە فولکەی حەسیب سالّح پێچدەکاتەوەو دەگەڕێتەوە لای فولکەی دەستەکە سەیارەکە دەجولّێت و ئەمیش دوای دەکەوێت، سەیارەکە لە مالّێك بەرامبەر مزگەوتی شێخ فەرید دەوەستێت، کاك وشیار بەجێیان دێلّێ و هات بەدوامدا کە ئەوسا مالّمان لە رزگاری بوو، کاتێك چوومە لای مالّەکە بینیم سەیارەکەی خۆمەو لەدەرگامدا..

کابرایەك هاتە دەرەوە کە مامۆستا بوو وە پێشمەرگەبوو، تومەز ئەم سەیارەیەی لە دزەکە کڕیوەتەوە بە دووهەزارو پێنج سەد دیناری سویسری کە خۆی بایی چواردە هەزاری سویسری بوو، گوایە وتبووی ئەوە سەیارەی ئەمنی کەرکوکە گرتومانەو مەیهێنەرە ناو شار، جا ئەو رۆژە ئەو برادەرە لەو مالّە خزمەیان دەعوەت بوون تا سەیارەکە بفرۆشێت بە کەسێکی خەلّکی رانیە.

ئەوەی لە هەمووی سەیرتربوو ئەوەیە کە چەند رۆژێك پێشتر خێزانم لەسەرجادەی رزگاری سەیارەیەك بەلایدا تێدەپەڕێت لە سەیارەکەی ئێمە دەچێت، دلّی دا ئەچلّکێ و دوعا دەکات خوایە ئەگەر سەیارەکەماوە شتێکم پیشان بدە

ئەگەر نەشماوە با ئیتر مێشکمانی پێوە مەشغوڵ نەکەین، شەو لەخەویا لە هەمان شوێندا دەبێ و سەیارەکە بەلایدا تێدەپەڕێت، لەخەوەکەدا هاوار دەکاو دەڵێ خەڵکینە ئەوە سەیارەکەمانە، دیقەت ئەدا کە دەعامیەی دواوەی کە ستیلە و تەریشەیەکی ڕەشی پێوەیە بۆیەی سپی کراوە، بەدەم خۆیەوە ئەڵێت: ئەم دزەی ئێمە زۆر بێ عەقڵە خۆ ئەمە سۆپەر نیە دەعامیەکەی سپی بێت، بۆچی بۆیەی سپی کردووە، خوا شایەتە کە سەیارەکەم بینی بەنج بووم، دەزانن بۆ؟ چونکە تەریشە ڕەشەکەی دەعامیەکەی و دوو پۆستاڵی ئەم لاو ئەلاشی بۆیەی سپی کرا بوو هەروەها ڕەقەمەکەشی گۆڕدرابوو. کە هاتمەوە ماڵەوە بۆیەی ڕەشم لێدایەوە.

بەڕاستی هەروەك چۆن حەزرەتی ئیبراهیم داوای کرد زیندووبوونەوە ببینێ و بینی، منیش هەروا بەچاوی خۆم لەمانگێك و پێنج ڕۆژ خەفەت و گەڕاندا دەسەڵاتی خوام بینی، ئەوسەعاتە خوا چۆن کاك وشیاری ناردو ئاوا دۆزرایەوە، ئەگەر وانەبوایە هەر ئەوسەعاتە دەفرۆشراو ڕەنگە بیانبردایە بۆ ڕانیە یان ئاودیویان بکردایە بۆ ئێران یان هەڵیان بووەشانایە و چاومان پێی نەدەکەوتەوە.

## سێیەم: خوایە بۆم قەرەبوو بکەرەوە

لە ساڵی دوو هەزار و چوار دا تووشی زیانێکی ماددی گەورەبووم، بەڵام بەفەزڵی خواوە خۆم لەبەر تاقیکردنەوەکەدا گرت و لەسەر نووسین و بانگەوازکردن بەردەوام بووم و هەمیشە دوعاکەی ئوم سەلەمەم دەخوێد: (اللهم عندك احتسبت مصيبتى فأجرنى فيها وأبدلنى منها خيرا). خوایە پاداشتم بدەرەوە لەسەر موسیبەتەکەم و بۆم قەرەبوو بکەرەوە بە باشتر، سوپاس بۆ خوا پاش چەند ساڵێك هاتمەوە تایم و خوا بۆی بژاردمەوە.

ئوم سەلەمە ئەو ئافرەتە بڕوادارەیە کەویستی لەگەڵ مێردەکەی و منالەکەیدا لە مەککەوە کۆچ بکات بۆ مەدینە، خزمانی هاتن و نەیانهێشت لەگەڵ مێردەکەیدا بڕوات، خزمانی مێردەکەشی لە داخا وتیان دەکەواتە ئەبێ کوڕەکەیمان بدەنەوە مادام کچەکەتان دەبەنەوە، بەو جۆرە یەك ساڵ ئوم سەلەمە هەموو ڕۆژێك دەهاتە قەراغ شاری مەککەو دەگریا بۆ مێردەکەی کە کۆچی کردبوو بۆ مەدینە و دەگریا بۆ کوڕەکەی کەماڵە خەزورانی لێیان سەندبوو، پاش ساڵەکە بەزەییان پیا هاتەوەو منالەکەیان دایەوەو ڕێیان دا کۆچ بکات.

عوسمانی کوڕی تەڵحە هەرچەند کافربوو کە بینی بەتەنیا بەتەمایە کۆچ بکات، کەئەوەش ئەستەم بوو بۆ ئافرەتێك بەتاقی تەنها، وتی من دەتگەیەنم، پیاوانە بەچەند شەوو ڕۆژ گەیاندیە قەراغ شاری مەدینەو خۆی گەڕایەوە، پاشان موسڵمانیش بوو.

هاوەڵان دەڵێن: هیچ شك نابەین مایەی هیدایەتی عوسمان بووبێت مەگەر ئەو پیاوەتیەی کە لەگەڵ ئوم سەلەمە کردی وخوا بەوە جەزای دایەوە. جاکە ئوم سەلەمە مێردەکەی کۆچی دوایی کرد خۆشەویست فەرمووی ئەو دوعایە بکە، ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لە ئەبو سەلەمە چاکتر کێیە تا خوا بۆم قەرەبوو بکاتەوە، کەچی ئەوەبوو خوا خستیە دڵی پێغەمبەرەوە کە بیخوازێت و بەوەش بوو بەیەکێ لە دایکانی ئیمانداران.

## چوارەم: دوعاکەم گیرابوو

بەندە ساڵی ١٩٨١ کۆلێژی ئەندازیاریم تەواوکردو چووم بۆ خزمەتی سەربازی لەسەربازگەی خان بەنی سەعد لای بەغدا، عەریفێکمان لەسەر بوو مەشقی پێدەکردین ئیزعاجی کردبووم، ڕۆژێکیان زۆر بێزاربووم دوای مەشق

کردنەکە نوێژی نیوەڕۆو عەسرو ئێوارەو خەوتنان و بەیانی ڕۆژی دوایی لە سوجدەدا لە خوا پاڕامەوە ئەو نالەبارەم لە کۆڵ بکاتەوە، خوا شایەتە کە بەیانی چوین بۆ ساحەی تەدریب و ئەو لەسەرمان وەستابوو، ئەفسەرێك لە دوورەوە بانگی کردو وتی: تۆ بڕۆ سەر ئەو جەماعەتەی ترو عەریفەکەی ئەوان هاتە لای ئێمە، کەبەوەش ڕزگارم بوو، زانیم کە دوعاکەم وەرگیراوە، سوپاس بۆ خوا کە ئاگای لە خەتەرەی ناو دڵەکانەو هەموو کاروباری ئەم بوونەوەرە بەدەست ئەوە.

## وردەنانی چۆلەکەکان

کاك جەلال دۆست و ناسیاومە لە مزگەوتی بەختیاری سولەیمانی بۆی گێڕامەوە، کە بەیانیان دەچێ بۆ دوکانەکەی لە گەڵ دەستیا هەندی نان دەباو وردی دەکات لەڕێی خۆیدا لەژێر درەختەکانی ڕێگەکەیدا دایدەنێت بۆچۆلەکەکان. ڕۆژێکیان لەساڵی٢٠١١ دەچن بۆ سەیران بەماڵ و منداڵەوە، سەیارەکانیان لە شوێنێکدا دائەنێن کە تەسك بوو، سەیارەی یەکەم لە پێشەوە و دووەمیشیان کە کرۆلا بوو لە دوایەوە، کاتێك ئێوارە هەڵدەستن بگەڕێنەوە و سەیرانچی ئەو ناوە چۆڵدەکەن و تاریك دادێ و مێشوولە زۆر دەبێت، سلف لە سەیارەی کرۆلاکە ئەدەن کە بەردەمی سەیارەکەی تریشی گرتووە ئیش ناکات، دەستیشیان بە کەسا ناگات..

کاك جەلال دەڵێت: لە دڵی خۆما کەوتمە پاڕانەوەو وتم:خوایە من لەبەر تۆ بەیانیان نان ئەدەم بە چۆلەکەکان لەبەر ئەو کارەم هەرچەند کەمیش بێت وەرە بە هانامانەوە، خوا ئاگادارە بە کوڕەکەم وت: بڕۆ سلف بە لە سەیارەکە.

وتی: ئاخر ئیش ناکات.

وتم: تۆ برۆ پشت بەخوا، خوا ئاگادارە سلفی لێدا ئیشی کرد، یەکسەر سوجدەی شوکرم برد بۆ خوا، سەیارەکە ئیشی کرد تا بەرماڵەوەو ئنجا لە ئیش کەوتەوە.

## حاجی رەوشەن:

لەهەڵەبجەی شەهید ئافرەتێك بەناوی رەوشەن لە هەشتاکاندا مێردەکەی دەمرێت و سێ چوار منالی سەروپێچکەی بەسەردا دەکەوێت،هەموو ژیانی خۆی دەکا بە قوربانی گەورەکردنی ئەو منالە بێباوکانە، هەموویان بە هەر حاڵێك بێت پێدەگەیەنێت،لەو باروزروفەدا کە ئەوانەی باوکیان هەبوو بەزەحمەت دەژیان جاوەرە یەکێك باوکی نەبێت.

رەوشەن چووە حەج و ساڵی ٢٠١٢ ش چوو بۆ عومرە،هەمیشە دەیووت خۆمن دەزانم سەرپەرشتیاری منالی بێباوك لە بەهەشتا هاوەڵی پێغەمبەرە(د. خ) بەڵام حەزدەکەم لە مەدینە لای رەسول اللە بمرم،سبحان اللە کاروانەکەیان لەپێشا چوونە مەککەو دواتر چوونە مەدینە،کاتێ رۆژوویان شکاند بەبێ ئەوەی هیچی بێت لەمەدینە وەفاتی کرد و ئاواتەکەی هاتە دی..

## حسێن عەبدەلی:

لە پێشبڕکێی نێودەوڵەتی قورئان لەدوبەی ساڵی ٢٠١٣ کوڕێك بەناوی حسێن عەدنان عەبدەلی بەشداری کرد کە تەمەنی ٣٠ ساڵ بوو، مامی لەگەڵی هاتبوو،مامۆستای قورئانخوێن شێرزاد عبدالرحمان ئیمتحانی کرد، کەبووە مایەی سەرسامبوونی هەموو ئامادەبووان.

مامی وتی: کاتێك حسێن لەدایك بوو ساڵی ١٩٨٣ لە فەلوجە، هەستیان کرد جووڵەی نیەو ناگری، بردیانە لای دکتۆر کمال الطویل و چەند دکتۆرێکی پسپۆڕو هەموو وتیان حسێن شەلەلی دەماغی هەیەو ئەگەر لەداهاتووشدا ناوی خۆی فێربێت موعجیزەیە. ئیتر باوکی و کەسو کاری بێ ئومێد دەبن لە دکتۆرو دەرمان هەموو هیوایان قابی رەحمەتی خوادەبێت.

شەوێکیان خۆشەویست لەخەودا بەباوکی دەڵێت: ئەوە بۆ بێتاقەتی؟؟ ئەویش دەڵێت: حسێن شەلەلی دەماخێتی و دکتۆر ئیزنی داوین. ئەویش دەفەرموێت: ئادەی بۆم بهێنە. باوکی لەخەوەکەدا دەزانێ خەوەو دەترسێت خەبەری بێتەوە، بەخێرایی حسێن دەباتە بەردەستی، ئەویش دەستی موبارەکی دەهێنێ بەسنگیاو هەندێ دوعای بۆ دەکاو دەفەرموێت: حسێن چاکیش دەبێت و (شـأن) ێکیشی دەبێت.

دوای ئەم خەوە وردە وردە حسێن جووڵەی تێکەوت و گەورەبوو، ئەمانیش کەم کەم شتیان فێردەکرد، هەموو رۆژێك بەومناڵیە قورئانی دەگرت بەدەستەوەو

ئەمەندە پەڕەکانی هەڵدەدایەوەو سەیری دەکرد قورئانەکە ئەدرا بەدەستیەوەو کەدەشنوست قورئانەکە بەسەر سنگیەوە بوو.

لەتەمەنی پێنج ساڵ و نیودا لە نوێژی هەینیدا وتاربێژ ئایەتێك دەخوێنێ و دەڵێ (سورەتی بەقەرە ئایەتی ١٠٠) ئەمیش لەلاوە دەڵێت: باوکە ئەو ئایەتە سوورەتی (ئال عیمرانە ئایەتی ١٠٠)، باوکیشی دەڵێت: چوزانیت؟؟ دەڵێ: هەموویم لەبەرە.

مامۆستا شێرزاد کۆمەڵێك پرسیاری لێدەکات وئەویش کەوەك کۆمپیوتەر هەمووی لەمێشکیدا خەزنەو یەکسەر وەڵام ئەداتەوە وئەمەش هەمووئامادەبوانی سەرسام کرد.

## مامۆستامەلاعومەر

مامۆستا مەلا عومەر ئەندامی لیژنەی فەتوایە لە چەمچەماڵ بۆی گێڕامەوەو وتی: ساڵی ٢٠٠٣ ناساغ بووم چووم بۆ لای دکتۆر ( محمد غضبان ) لە بەغدا، پاش پشکنین دکتۆر وتی: بۆرییەکی دڵت گیراوەو دەبێت قەستەرەت بۆ بکەین، منیش وتم: باشە بەڵام جارێ ناوم دەرچووە ئەچم بۆ حەج،وتی:حەجی چی؟ تۆ ئەبێت زۆر ئاگات لەخۆت بێت و حەجیش قەرەباڵغیەو زەحمەتە.

وتم: ئاخر ئەو حەجەش بۆ خۆی بەشێکە لە چارەسەر.

لەحەج داوام کرد لەدوو حاجی بیانی کە بە ڕەنگ و ڕوویاندا ساڵح دیاربوون، دەست بخەنە سەردڵم و دوعام بۆ بکەن،ئەوانیش دەستیان خستە سەر دڵم و دوعایان بۆکردم،کەهاتمەوە لەحەج چوومەوە بۆ لای دکتۆر،پاش دووبارەکردنەوەی پشکنینەکان وتی: پێویستت بە قەستەرە نیە.

دووساڵیش لەمەوبەر(٢٠١١) بێاقەت بووم، هاتم بۆلای دکتۆرێکی سلێمانی و پشکنینی بۆکردم و بڕیاری دا کە قەستەرەم بۆ بکات،کاتێ بۆی کردم وتی: تۆ پێشتر بۆرییەکی دڵت گیرابوو پێم نالێی بەچی بەربووە؟؟وتم: ئەوە وازی لێبێنە.

پاریش هەستم بە ناڕەحەتی کردەوە،کەچووم بۆ عومرە بەهەمان شێوەی جاری یەکەم داوام کرد لە دوو حاجی کە دەستیان بخەنە سەردڵم و دوعام بۆ بکەن،خوا ئاگادارە پاش دوعاکانیان وەزعم باش بوو.

## مەلا خالیدو سەرگوزەشتەکانی

مەلا خالید لە سلێمانی دائەنیشێ وبە ئەسڵ شارباژێڕیە بۆی گێڕامەوە:

١- لە نەوەدەکاندا لە سلێمانی ئیشی حەواڵەی دەکرد کاتێك حسابی خۆیان دەکەن و بە دەفتەردا دەچنەوە هەرچی لێی ورد دەبنەوە چل دەفتەر دۆلارێك دیار نابێت، ئەمەش خەفەتێکی گەورەبوو چونکە زۆربەی پارەی ئەم و ئەو بوو،شەوێك برادەرێکی باوکی کە کەسێکی چاکە دێتە خەوی وپێی دەڵێت: بۆ وا بێتاقەتی؟؟ ئەویش دەڵێت: بڕێکی زۆر پارەمان دیارنیە، دەڵێت: خەم مەخۆ سبەینێ لە دەفتەرەکەتدا ئەیدۆزیتەوە، ناوبراو دەڵێت: خوا ئاگادارە بەیانی کە بەدەفتەرەکەدا چوینەوە پارەکەمان دۆزییەوە کە چیمان پێکردووەو لای کێیە و حسابەکەمان بۆ ڕاست بووەوە.

٢- منداڵبووم دووپشك پێوەی دام زۆرئازارم هەبوو، باوکم دەستی پیاهێناو هەندێ دوعای بەسەرا خوێند ئازارم شکاو چاك بووم.

٣- ماڵمان لە شارباژێری ئەو دیو بوو لای شانەدەری،زەمانی شۆڕش (کاك وەهاب) سەرکردەی یەکێتی پارتیەکی گرتبوو،قەرار بوو بیکوژێت،باوکیشم هات بۆلای لەگەڵ چەندکەسێکدا بۆ بەردانی،کاك وەهاب وتی: تۆم نەدیوە لەم

ناوچەیە، باوکم وتی: ماڵمان لەشاربازێڕی ئەو دیوە، وتی: فەرموو لەخزمەتدام، باوکم وتی: فلاّنتان گرتووە بڕیارە بیکوژن،هاتووم بەریبدەی،وتی: جا شتی وا چۆن دەبێت؟ وتی: ئێمەش تەکلیف دەکەین کە ببێت، وتی: باشە کاك حاجی بالەبەرخاتری تۆ ئازادبێت!!

٤- باوکم بۆهەرکارێك بیووتایە بڕۆ تەوەکول بەخوا بیکە بۆم دەکرا،لە ساڵانی نەوەدەکاندا لەکەرکوك مامەڵەی تەسریحی سەربازیان دەکرد بۆ هەرکەس بچوایە،باوکم وتی: بڕۆ پشت بەخوا بۆت دەکرێت،کەچووم زۆر قەرەباڵغ بوو ئەو رۆژە هیچ و چوینە ئوتێل، شەو لەخەوما لەسەرەدا وەستابووین کەگەیشتە ئێمە ئەفسەرێك لەئێمەوە جیای کردەوەو وتی: تەواو ئیتر بۆکەسی ناکەین، منیش پێم وت: گەورەم ئێمە کەسێکی هەژارین وهاتووین بەڵکو بۆمان بکەن، وتی: دەبڕۆنەوە سەرەکە، من و ئامۆزاکەم چووینەوە ناو سەرەکە،بەیانی کەچووین سبحان اللـە کە سەرە گەیشتە ئێمە ئەفسەرێك وتی: تەواو ئیتر بۆکەسی ناکەین، منیش وتم: ئاخر ئێمە هەژارین وهاتووین بەڵکو یارمەتیمان بدەی، هەردووکمانی خستەوە سەرەکەو بۆمان کرا.

٥- سوڵحێکی عەشایەری بوو بە تووشمەوە،دایکم بەڕەحمەت بێت چووە خەوی خوشکەکەمەوەو وتبووی با ئەو کارە نەکات عەیبار دەبێت،بۆ شەوی دواتریش هەمان خەوی بینیەوە، ناچار تازە چووبوومە ناوی نەئەکرا بێمە دەرەوە، کەچی سبحان الله تیایا عەیباربووم.

***

## هەستە ئاو بخۆرەوە

﴿ أَلا إِنَّ أَوْلِيَاء اللّهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ، الَّذِينَ آمَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ، لَهُمُ الْبُشْرَى فِي الْحَياةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ لاَ تَبْدِيلَ لِكَلِمَاتِ اللّهِ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴾ يونس: ٦٤.

دۆستانی خوا ناترسن و خەمناخۆن، کە ئەوانەش بڕواداره پارێزکارەکانن. دۆستانی خوا مژدەیان پێدەدرێ لە ژیانی دونیادا، بەوەی کە خەوی خێری مژدەبەخش دەبینن، یان پێیانەوە دەبینرێت و، لە ئاخیرەتیشدا بەهەشتی بەرین جێیانە و پەیمانی خوا دێتە دی، بەڕاستی ئەوەیە سەرکەوتن و سەرفرازی مەزن. کەئەوەش تەفسیری پێغەمبەرە (د.خ) هەروەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە:

( سألتُ رسولَ اللهِ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّمَ عن قولهِ تعالى: { لَهُمُ الْبُشْرَى فِي الحَيَاةِ الدُّنيَا } قال: هي الرؤيا الصالحةُ يراها المؤمنُ أو تُرى لهُ ) –الراوي :عبادة بن الصامت :- سنن الترمذي حسن.

مامۆستا موسای بیارەیی وتی: شەوی ٣١/٣٠ی /٢٠١٣/١٠ زەختم بەرزبوو تا یەك ونیوی شەو نەخەوتم، لە هیلاکیدا چاوم چووە خەو پیاوێکی چوارشانە کەچەند جاری تر لە خەوا بینیومە وا ئەزانم شێخ عومەری بیارەی رەحمەتی بێت، هاتە خەوم و پێی وتم: هەستە ئاو بخۆرەوە چاك دەبیت،منیش هەستام و چوار پەرداخ ئاوم خواردەوەو سوپاس بۆ خوا چاك بووم.

## دکتۆر محمد راتب نابلوسی دەڵێت:

هەرچیمان بەسەردێت حیکمەتی تیایە هەرچەند رەنگە لەدونیادا لە حیکمەتەکەی تێنەگەین بەڵام لەقیامەتدا کەهەمووشتەکان ئاشکرا دەبن وبە (عين اليقين)هەمووشتەکان دەبینین ئەوسا دوا شت کە دەیڵێین سوپاس وستایشی خوای

دانای کارسازی میهرەبانە: ﴿ دَعْوَاهُمْ فِيهَا سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَامٌ وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾ یونس: ١٠.

دوای یەکێ لەوانەکانم کەسێك وتی: هەرچەند من ناناسی بەلاّم خوا بەدەرسەکانی تۆ هیدایەتی دام.من کە لەفەرەنسا بڕوانامەی بەرزی زانستی کۆمپیوتەرم بەدەستهێناوە، پیاوکوشتن نەبێت هەرچی خراپەکردوومەو هاوسەرەکەشم بەهەمان شێوە بوو.

کە گەڕاینەوە شام خزمێکم هێنامی بۆ وانەیەکت، هیچ حاڵی نەبووم تۆ تەفسیری قورئانت دەکردو منیش خەیاڵم لای گوناه کردن بوو. بەقەدەری خوا تووشی نەخۆشیەك بووم کە وێنە لەبەرچاوم ئەجولاّو بەدەجار هەوڵدان ئنجا پەرداخێك ئاوم بۆدەگیرا.لەشام چوومە لای سی دکتۆر سوودی نەبوو، چوومەوە بۆ فەرەنسا لەوێ باشترین پزیشك پێی وتم: نەخۆشیەکەت دەگمەنەو لە شانزە ملیۆن کەسدا یەك کەس تووشی دەبێت.

زۆرم پێناخۆش بوو کەوتیان پارەی ئەمسەرو ئەوسەرو شەش مانگت بۆ ئەدەین بۆ مانەوەت لێرە بۆ چارەسەر، زانیم تاقیکردنەوەم لەسەر دەکەن.

دوای شەش مانگ چارەسەر وتیان:چارەسەرت نیەو بڕۆ بۆ لای میهراگا لەهیندو خەریکی یۆگا بە تادەمریت.

هاتمەوە شام وهاتمە دەرسێکی تۆوەو تاڕادەیەك کاری تێکردم دوعام کرد خواشیفام بۆ بنێرێت نوێژبکەم وبەراستی رووبکەمە خوا. کەدووەم جارهاتم وتت: خواشەرت و شروتی لەسەردانانرێت بۆیە یەکسەردەستم کرد بەنوێژ و، خوای گەورەش شیفای بۆناردم.

دکتۆر نابلوسی دەڵێت: ئایاتی کەونیمان هەیە کەسەیری هەرچیەك بکەی لەم بوونەوەرەدا بەڵگەیە لەسەر بەدیهێنەرەکەی، ئایاتی قورئانمان هەیە کە بەڵگەن

لەسەر ئەوەی خوا ناردونی و محمد درووودی خوای لەسەر نێردراوی خوایە، ئایاتی تەکوینیشمان هەیە کە لەو بەسەرهات ورووداوانەوە دەیانبینین کەبەردەوام رووئەدەن لەژیانی خەڵکیدا.

## خۆتان بەخوابسپێرن

قورئان دەفەرموێت: ﴿ وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّه فَهوَ حَسْبُه إِنَّ اللّه بَالِغُ أَمْرِه قَدْ جَعَلَ اللَّه لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا ﴾ الطلاق:٣. هەرکەس پشت بەخوا ببەستێ خوا بۆ ئەو بەسە، خوا بەکاری خۆی رادەگاو هەرچی بیەوێ دەیکات،هەمووشتێکیش کات وساتی تایبەتی بۆداناوە.

دکتۆر نابلوسی دەڵێت: زەمانی عوسمانیەکان پیاوێك لەشام دۆستێکی نزیکی یاوەری سوڵتان بوو، بەشەمەندەفەر بە چەندرۆژێك چوو بۆ ئەستەنبوڵ بۆ کارێك، دۆستەکەی بیست رۆژ داواکەی لەبەردەمی سوڵتاندا دائەنا ئیمزای نەدەکرد، بەدڵشکاوی کابرا رۆیشت و بێهیوا بوو، سوڵتان ئیمزای کرد، دۆستەکەی زۆرگەڕا تالەخانێك دۆزیەوە، پێی وت: ها ئەوە داواکەت تا ئیعتیمادت لەسەرمن بوو خوا بۆی نەکردی، کە هیوات لەمن بڕی و پشتت بەخوا بەست وا خوا بۆی کردیت و سوڵتان بۆی ئیمزاکردیت تا ببێت بەدەرس بۆت.

## ژنێکی بۆخواسوڵحاو

پێش راپەڕین بەدوورۆژ لە دەربەندیخان ژنێك کە سێ کوڕو سێ کچی هەبوو، لەخەویا یەکێك لەپشتەوە پێی دەڵێت: کوڕەکانت دەوێت یان ئیمان و لەبەرچاویشیا تارمایی کوڕەکانی و لەولاشەوە دیمەنی باخ و باخات و سەوزاییەکی خۆش دەبینێ،ئەمیش سەرسام بوو ئەلەرزی ونەیدەزانی چی وەلام

بداتەوە،هەرئەوەندەی بۆکرا بلێت:أشهد ان لا الـه الا الله واشهد ان محمدا رسول الله. دووبارە هەمان پرسیاری لێکردەوەو ئەمیش شایەتمانی هێنایەوەو وتی: کورەکان و کچەکانیشم دەکەم بەقوربانی ئیمانەکەم.

دوای دوورۆژ کوڕە گەورەکەی کەتەمەنی سی ساڵ بوو لەبەردەم ئەمنە سورەکەدا لەکاتی هێرش بردندا شەهیدکرا، دایکی لە پرسەکەیدا دەیووت: رازی نابم کەس بگری من کوڕەکانم داوە بەخوا و بەبەهەشت. پاش ماوەیەك کوڕێکی فیتەری سەیارە بوو لە ژێر سەیارەیەکدابوو چاکی بکات،سەیارەیەك ئیستۆپی تیانەماو خۆی دا بەسەیارەکەی سەر ئەمداو پەراسووەکانی شکاو بەدایکیان وت: سوپاس بۆ خوا نەمردووە، وتی: بشمرێت خوا داویەتی و خوا دەیباتەوە.. خوا رەحمی پێکرد نەمرد.

ئەم ژنە بەو هەموو سەبرو ئارامی وخواناسیەوە گەڕایەوە لای خوای خۆی،ئێستا کچەکانی هەرچی ببێت دەڵێن: هیچ نیە هەرزوو دایکمان بەسەوزی داوینی بەخوا.

## دایکێکی خواناس

مامۆستا مەریوان کەبە ئەسڵ شارباژێڕیە بۆی گێڕامەوە کەدایکی ئافرەتێکی خواناسەو وەختی خۆی بەزۆر دراوە بەشوو بەباوکی کەکەسێکی مەی خۆرو دوور لەخوابووە، ئەم دایکەی ئارامی گرت ومێردەکەی هێنایە سەر رێی نوێژکردن و، ٥کوڕوکچێکی هەیەو هەموومناڵەکانی لەسەر دینداری گەورە کردووەو، ئاواتی ئەوەبووە هەر ٥کوڕەکەی ببنە وتاربێژ، تا ئێستا ٤ کوڕی بوونەتە وتاربێژ.

ماموستا مەریوان دەڵێ: لەپۆلی یەکی پەیمانگای وتاربێژی بووم هەرچیم دەکرد حەزم لەوبوارە نەبوو، شەوێکیان لەخەوما قەرەباڵغیەکی زۆرم بینی کەچوومە پێشەوە خۆشەویستمان(د.خ) دانیشتبوو کۆمەڵێك فەقێی لەدەوربوو، بانگی منی کردوفەرمووی: وەرە جێی تۆ ئێرەیە.

لەدوای ئەو خەوە دڵم دامەزرا لەسەر ئیمامەت و وتاربێژی و هەرچەند زۆر نارەحەتی و فشارم تووش بووە بەلاَم سوپاس بۆ خوا بەردەوامم لەخزمەتی ئیسلامدا، بەفەزڵی خوا خێرخوازێك قوتابخانەیەکی ئیسلامی بۆ دروستکردین لەهەولێر، بەوەش مەدرەسەیەکی ئایینمان دامەزراند کە ١٧٠ قوتابی تیا دەخوێنێت. بەندەش یەکەم کەس بووم کە بانگهێشت کرام بۆ وتاردان بۆ قوتابیەکان کە سوپاس بۆخوا کاریگەری زۆری هەبوو.

## بەدوو ناونیشان:

ماموستا مەلا موسا وتی: سەرەتای هەشتاکان لەدێیەکی شارەزوور ئیمام بووم، ژنێك هات بۆلام و وتی: مێردەکەم هەرچەند حاجیە بەلاَم زۆر لێم ئەدا بەناهەق و ستەمم لێدەکات،منیش ماڵە باوکێ برایەکم نیە هانایان بۆبەرم، ئەمشەو خۆشەویست دروودی خوای لەسەر هاتەخەوم فەرمووی: بەمێردەکەت بڵێ جارێکی تر لەرووتا دەست بەرز بکاتەوە هەردووچاوی دەردێم، بەدووناونیشان، یەکەم: کەلە مزگەوتەکەی من بووە لەحەج لەپاڵ پایەیەکدا خەوی لێکەوتووەو چێژێکی رۆحی دەستکەوتووە، دووەمیش کەلەکلکەی باخ لای خورماڵ ئەوساڵە تووتنی کردووە چوارچەپك تووتنی دراوسێیەکەی دزیوە، جاناوێرم پێی بڵێم ئەترسم ئەوەندەی تر لێم بدا..

منیش لەبەرحورمەتی مێردەکەی خۆم نەچووم و مامۆستایەکی ترم لەگەڵ بوو ئەوم نارد پەیامەکەی پێبگەیەنێت.مامۆستاکە چوو بۆماڵیان و پاش سەلام کردن وتبووی: کاك حاجی تۆ بەناهەق ستەم لەم ژنەت ئەکەیت: ئەمشەو رەسولی خوا ئەفەرموێت: جارێکی تر لەرووبا دەست بەرز بکەیتەوە هەردووچاوت دەردێنێت، بەدووناونیشان، یەکەم: کەلە مزگەوتەکەی من بووە لەحەج لەپاڵ پایەیەکدا خەوت لێکەوتووەو چێژێکی رۆحیت دەستکەوتووە، دووەمیش کەلەکلکەی باخ لای خورماڵ ئەوساڵە تووتنت کردووە چوارچەپك تووتنی دراوسێیەکەت دزیوە. مام حاجی کەئەمەی بیست یەکسەر چووە سوژدەو وتی: خوایە تۆبە..

## خوا رۆزیدەرە

بانگخوازێك دەڵێت: جارێك سواری تەکسی بووم، شۆفێرەکەی پیاوێکی بەتەمەن بوو، لێم پرسی لەکەیەوە سایەقیت؟ وتی: لەساڵی ١٩٤٨ ەوە، وتم: حەزئەکەم بەسەرهاتێکی خۆتم بۆ بگێڕیتەوە کە کاری تێکردبێت.

وتی: ڕۆژێکیان زۆر نەخۆش و ناساغ و ماندووبوم، لەماڵەوە کەوتبووم هیچ نەبوو لەماڵماندا، دوو سێ ڕۆژ بەو حاڵەماینەوە، ژنەکەم ماڵە دراوسێکان گەڕا سابەڵکو ٢٠ جونەیهێك قەرزبکات، کەس نەبوو قەرزی بداتێ. دەست لەدەست و قووەت لەخوا وتم: ئەڕۆم ئیشێکم هەیە، ژنەکەم سوێندی دام و تکای لێکردم کەلەبەر ناساغییەکەم کاری وانەکەم، بەڵام هەرچۆنێ بوو ڕۆشتم، چی گەڕام کەس دەستی لێ ڕانەگرتم.. تا خەریك بوو بێ هیوابم، تاکسیەکی بیجۆ دەستی لێ ڕاگرتم و وتی: برام ئەم نەفەرە میوانە و بیگەیەنە فرۆکەخانە من ئوتومبیلەکەم لەکارکەوتووە، کە سەرکەوت و کەوتینە قسە، دەرکەوت کارێکی هەیە لەبنکەی گواستنەوەی کەلوپەل وتم: من خزم و ناسیاوم هەیە لەوێ حەز دەکەیت دەتبەم

باکارەکەت بۆ ئاسان بکەن، زۆری پێ خۆش بوو، کەبردم لەجیاتی (١٥٠٠) جونەیھ تەنھا (٥٠٠) جونەیھیان لەبەر من لێ سەند، کەگەڕاینەوە و گەیاندمە فرۆکەخانە وتی: ئەوە ٢٠٠ جونەیھ ھەقی ئەوکارەی بۆت کردم، باشە!؟

منیش وتم: من لەکەیەوە وێڵم بەدوای ٢٠ جونەیھدا و وا خوا دە قاتی ئەوەی نارد زۆر باشە ماڵت ئاوا بێ، وتی: دەکەواتە مادام حاڵت وا خراپە ئەوە (١٠٠٠) جونەیھی تر، کە وەرم گرت وتم: یاڕەبی چ ڕۆزی دەرێکی؟ ھەرتۆ پەنای بێ پەنایانی، ھەرتۆی بەڕاستی ڕۆزی دەر و فریادڕەسی.

﴿ وَفِي السَّمَاء رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ، فَوَرَبِّ السَّمَاء وَالْأَرْضِ إِنَّهُ لَحَقٌّ مِّثْلَ مَا أَنَّكُمْ تَنطِقُونَ ﴾ الذاريات:٢٣.

## عیززەتی نەفس:

حاجی ئیبراھیم ئاغا، لەشاری سلێمانی پیاوێکی پیاوانە و پارێزکار و بەخشندە بووە، یەکێك لەحەماڵەکانی دەگێڕێتەوە و دەڵێ: شەو درەنگ بوو و خەوم لێ کەوتبوو، دایان لەدەرگا و کاتێ کردمەوە، دەبینم حاجی ئیبراھیمە زۆرم پێ سەیر بوو کەبەو نیوە شەوە ھاتووە بەشوێنمدا، بۆیە واقم وڕمابوو.. ئەویش کە حاڵی منی زانی وتی: ھیچ نارەحەت مەبە، خۆت گورج بکەرەوە بابڕۆین.

ئەم پیاوە زۆر قورس و سەنگین و پیاو چاك بوو، لەبەرئەوە ڕووم نەھات دەست بنێم بەڕوویەوە و بڵێم: جا ئەمە کەی وەختی کارە؟ من خەوم دێت و نایەم!! لەبەرئەوە خۆم گورج کردەوە و لەتەکیا ڕۆشتم سێ کەسی تریشی لەحەماڵەکانی ھاوەڵم خەبەرکردەوە، پێکەوە ڕۆشتین بۆ عەمارەکەی، دەرگای عەمارەکەی کردەوە و ھەریەکەو شتێکی پێ ھەڵگرتین، لەڕۆن و برنج و ئارد و زەخیرەی تر..

ڕۆیشتینە خوارەوە بۆ گەڕەکی سەرشەقام، لەوێشەوە کۆڵان بەکۆڵان ڕۆیشتین، تانزیکی گەڕەکی جولەکان بووینەوە و لەبەردەم ماڵی مەلایەکدا وەستاین، دای لەدەرگای ماڵەکەو پاش ماوەیەك، پیاوێکی نورانی هات دەرگای کردەوە، کەچاوی کەوت بەئێمە بورایەوە.

حاجی ئیبراهیم باوەشی پیاکرد و لە بەلووعەی ئاوەکەی نزیك کردەوە و هەندێ ئاوی لەسەرو چاوی پرژاند، ئەویش هۆشی بەخۆیا هاتەوە و هەستایەوە.

ئنجا حاجی گلەیی لێکرد و وتی: قوربان! گلەیی بێ لێت، چۆن جەنابت حەوت ڕۆژە نانتان نیە و منت ئاگادار نەکردۆتەوە؟ ماڵی منیش هی ئێوەیە، با تۆ بەم برایەی خۆتت بووتایە.

مامۆستا وتی: ئەی ئێستا چۆنت زانیوە؟

حاجی وتی: من ئاگام لەغەیب نیە و غەیب زان نییم، پێغەمبەر(د.خ) هاتە خەوم و فەرمووی: ئەوە حاجی ئیبراهیم ئاغا چۆن ویژدانت قبوڵ ئەکا، مەلا فلان کەس خۆی و ماڵ و منالی حەوت ڕۆژە نانیان نەخواردووە؟! چۆن تۆ هەواڵی نازانیت؟ نازانی هیچیان نیە؟ هەرئێستا!! دەچیت بۆلای و بەئەندازەی پێویست خواردن و خۆراکی بۆ دەبەیت. منیش لەتاوا خەبەرم بۆوە، یەکسەر چووم بۆ عەمارەکە و ئەوەی پێویست بێ هێناومە.

ئەویش وتی: خوا پاداشتت بداتەوە لەسەر ئەو زەحمەتەی کێشاوتە.

حاجی وتی: خوا پاداشتی تۆیش بداتەوە، باقسەت بکردایە خۆ من غەیب زان نییم، چووزانم حاڵی جەنابتان وایە!

مامۆستایش وتی: بۆ حاجی ئیبراهیم ئەگەر ئادەمیزاد هەفتەیەك نان لەماڵیا نەبێت دەبێ لای خەڵکی باسی بکات؟! یا داوای شت لەخەڵکی بکات؟

حەماڵەکە دەڵێ: ئێمە شتەکانمان دانا و سەیری ماڵ و منالّیمان کرد حالّیان زۆر شپرز بوو، قرچە لەجەرگمان هات بۆیان.

هەر لەویا حاجی ئیبراهیم ئاگری پێ کردینەوە و ڕۆنمان قرچاند و ئارد و شەکرمان تێکرد و حەلّوا پێگەیشت، تا حەلّواکەی دەرخوارد نەدان بەجێی نەهێشتن.. پاش ئەوەی ماوەیەك لایان دانیشتین ئنجا بەجێمان هێشتن و هاتینەوە.

ئافەرین پیاوی بەغیرەت و بەشەرەف، ئەگەر کەسێك حەوت ڕۆژ نان لەماڵیا نەبێت بیخوات، دەبێ داوا لەخەڵکی بکات؟! بەڕاستی شیاوی ئەوەیت پێت بگوترێ: مەلاو جێنشینی پێغەمبەر(د.خ)، بەڕاستی ڕێزی دینەکەت گرتووە، بۆیە خۆشەویستی خوا لەسەری کردویتەوە و خواش فریات کەوتووە.

بەڕاستی مامۆستا بوویت چونکە زانیوتە شەرەفی زانیاری بپارێزی، خوا لەکۆمەڵگادا وێنەت زیاد بکات.

## خەوی باوکێک

رەمەزانی ساڵی ٢٠١٠ لە مزگەوتی زەهاوی لە بەکرەجۆ، لە شەوێکی (لیلە القدر) دا وتارم دا، کە هاتمە دەرەوە، گەنجێك هاتە دەرەوە و خۆی پێناساندم و وتی: حەزدەکەم ئەم بەسەرهاتەی خۆمت بۆ بگێڕمەوە، وتم: فەرموو، وتی: باوکم دەیووت کوڕم خەوم دیوە کە مردم تۆ نایەیتە ژێر دارە مەیتەکەمەوە.

چەند ساڵێك چوومە دەرەوەی وڵات، لەبەر باوکم هاتمەوە نەخۆشی دڵی هەبوو، نەشتەرگەریمان لە ئێران بۆ کرد، پاشان چووم بۆ هەولێر مامەڵەی سەفەری بۆ بکەم کە بیبەم بۆ ئەردەن، هەموو دووری ڕێگاکە سلێمانی تا هەولێر سێ سەعاتە، سبحان الله باوکم وەفاتی کرد و تا هاتمەوە ناشتبوویان!!

لەدایکبووی هەشتاکانە، کۆلێژی ئەندازیاری شارستانی لە بەغدا چەند ساڵێك لەمەوبەر تەواودەکات و لە کەناڵی جەزیرە دەبێتە پەیامنێر، کەسێکی خواناس و بۆ خوا سوڵحاو بوو هەمیشە شەونوێژ و ڕۆژوی سوننەتی هەبوو... ناوبراو لەبەر سەرقاڵی و کاری پەیامنێری کە کەناڵی جەزیرە لەکوردستان ئیعتیمادیان لەسەری بوو، نەیتوانی بچێتە پرۆسەی هاوسەرگیرییەوە.

ناوبراو خێرخواز بوو لە دێ یەکی سەر بە پارێزگاری کەرکوك مزگەوتێکی دروست کرد بەبێ ئەوەی کەس وکاری پێ بزانن، چەند منالێکی بێ باوکیشی کەفالەت کردبوو.

پیاو باشێك لە کەرکوك بە کاك بەختیاری برای دەڵێت: خوا بەخێری بگێڕێت، لە خەوما تۆ و محمدی برات بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشتن تۆ دەرچوویت و محمد دەرنەچوو.

خەوەکە هاتەدی، کاتێك محمد و بەختیار دێن بۆ تەعزیەیەکی خزمێکیان لە کەلار لە کاتی گەڕانەوەدا لە سەر پردێکی ڕێی کەلار سەیارەکەیان وەردەگەڕێ و محمد بە زمانی بەڕۆژووەوە ماڵ ئاوایی لەم دنیا فانییە دەکات.

محمد لە شەوی مەولود دا لەدایك بوو بۆیە ناویان نا (محمد)، ناوبراو بەڕاستی هەڵگری ناوی پیرۆزی محمد بوو ﷺ، هەر لەشەوی مەولودیشدا ٢٠١٠/٢/٢٥ وەفاتی کرد..

بەڕاستی ئەمە پەند و عیبرەتێکی گەورەیە کە مردن بە گەورە و بچووکی نیە و ئەبێ هەمیشە ئامادەبین بۆی، خۆ ئەمەش ئامۆژگاری پەروەردگارە کە دەفەرموێت:
يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ (١٠٢)آل عمران

## بیده دەست خوا:

ئەو برا بەڕێزەی لەوێنەکەدا ئاماژەی بۆکراوەو من لەخزمەتیانا وتارم دا وتی: لەدەوروبەری سەید صادق کەسێك دزی لەماڵی باوکم کرد، تەلەفیزیۆن و زەخیرەو هەندێ شتی تری بردبوو، کەسەکەمان دۆزیەوە نەچووە ژێری و نکوڵی لێکرد، هەرچەند ئەشمانزانی شتەکانی ئێمەی لەکوێ داناوە، باوکم وتی: وازی لێبێنن حەواڵەی خوام کردووە، سبحان الله ئەو دزە لەسەیتەرەی دابوو نەوەستابوو ئاسایشی بازگەکە تەقەیان لێکردبوو، بەقاچی شکاوەوە کابرا بەندکراوەو پاش تەحقیقات دەریشکەوتووە کەئەو ئوتومبیلەی پێی بووە ئەویشی دزیوە..

جارێك لەخزمەت مامۆستا مەلا عەبدوڵای پەرخیدا بووم وتی: هەرچیم دابێتمە دەست خوا خوا هەقی سەندووم.. جا خوایە ئێمەش وا ئەوانەی ستەمیان لەم میللەتە کردووە حەواڵەی تۆیان ئەکەین،هەرچەند خۆ ریسوات کردوون بەلأم چاوەڕێی زیاترین..

## وەڵامت پێیە بۆ بەر بارەگای خوا:

خوای گەورە لەقیامەتدا دەفەرموێت: ئەی بەندەکەم تینووم بوو ئاوت، نەدامیٚ! ئەویش دەڵێ: کەی تۆ تینووت بووە تامن ئاوت بدەمیٚ؟؟ خوا دەفەرمویٚ: فلاٚن بەندەم تینووی بوو، ئاوت بدایەتیٚ لای من وەرت دەگرتەوە وەك دابێتت بەمن وابوو.

خوای گەورە بەهەمان شێوە گلەیی دەکات لەبەندەکەی کە داوای نانم لیٚکردیت و نەتدامیٚ، نەخۆش کەوتم و نەهاتی بۆلام..

باشە: توهەقی ئەو خوایە خوای گەورە گلەییت لیٚبکات لەسەر ئاووخواردن و سەردانی نەخۆش، ئەی گلەییت لیٚناکات خەڵکی تینووی ئیسلامن و نایاندەیتیٚ و خەمی بانگەوازەکەیت نیە.

## دوعای کاتی نارەحەتی:

ئیبن حەجەر لە فەتحدا دەڵێت:ئەبی بەکری رازی وتوویەتی: لە ئەصفەهان لای ئەبی نەعیم فەرموودەم ئەنووسی، شێخ ئەبوبەکری کوڕی عەلی موفتی بوو بۆیان تێچاندبوو لای سوڵتان و ئەویش بەندی کردبوو،شەو خۆشەویستم بینی جوبرائیل لەلای راستیەوە بوو بەردەوام تەسبیحاتی دەکرد، خۆشەویست(د.خ) پێی فەرمووم: بە ئەبوبەکری کوڕی عەلی بلێ:دوعای نارەحەتی بخوێنێت کەلە صەحیحی بوخاریدایە تا خوا رزگاری دەکات.منیش بۆ بەیانی هەواڵم بۆنارد ئەو دوعایە بخوێنیٚ و سوپاس بۆخوا بووە هۆی بەربوونی.

دوعاکەش ئەمەیە:

*** عن ابن عباس رضي الله عنه أن رسول الله صلى الله عليه وسلم كان يقول عند الكرب: (( لا إله إلا الله العظيم الحليم، لا إله إلا الله رب العرش**

العظيم، لا إله إلا الله رب السموات، ورب الأرض، ورب العرش الكريم )) ﴿ متفق عليه ﴾.

* وعن أنس رضي الله عنه أن النبي صلى الله عليه وسلم كان إذا حزبه أمر قال: يا حيّ يا قيوم، برحمتك استغيث )) ﴿ رواه الترمذي وصححه الألباني ﴾.

وعن أبي بكرة أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (( دعوات المكروب: اللهم رحمتك أرجو، فلا تكلني إلى نفسي طرفة عين، وأصلح لي شأني كله، لا إله إلا أنت)) ﴿ رواه أبو داود وهو في صحيح الكلم الطيب﴾.

* وعن سعيد بن أبي وقاص رضي الله عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((دعوة ذي النون إذ دعا وهو في بطن الحوت : ( لا إِلَه إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ) ﴿ الانبياء: من الآية:٨٧ ﴾. لم يدع بها رجلٌ مسلم في شيء قط إلا استجيب له )) ﴿ رواه الترمذي– صحيح الكلم الطيب ﴾.

## نامەیەک

برایەك بەناوی كاك شەماڵ ئەم نامەیەی بۆناردم ودەڵێت:

لە ساڵی ٢٠٠٣ لە پۆلی ٣ی ناوەندی بوم دوەم ساڵم بوو لەو پۆلە، تاقیکردنەوەکانی مانگی ٣ دەستی پێکردبوو بە ئەنجامی ئەم تاقیکردنەوانە دەردەکەوت ئایا بەشداری دەبی لە تاقیکردنەوەی وزاری یان نا منیش لە ٢ وانە کەوتبوم کۆتا تاقیکردنەوەم مابوو لەوانەی بیرکاری زۆر لاواز بوم لە بیرکاری دوای ئەوەی تاقیکردنەوەکەم کرد زانیم خراپم وەلامدایتەوە دەستم کرد بە پاڕانەوە لە خوای گەورە لە یەك لە پاڕانەوەکانم دەموت: خوایە گیان وعد دەدەم بەس لەو دەرسە ناجیح بم هەموو نوێژەکانی بەیانیم بکەم بە تەواوی، کاتێك

وەرەقەی تاقیکردنەوەم لێ هاتەوە تەماشام کرد ٢٧ لەسەر ٥٠م وەرگرتوە بەو ئەنجامە نەبوایە داخلی وزاری نەدەبوم فەسلیش دەکرام چونکە دەبوە دووەم ساڵ ساقیت لەو پۆلە، لە کۆتایی کە بە وردی تەماشای هەمو پرسیارەکانم کرد کۆی نمرەکانی من دەیکردە ١٧ لەسەر ٥٠ بەڵام مامۆستا لەکۆکردنەوە هەڵەی کردبو نوسیبوی ٢٧ لەسەر ٥٠ لەو ئەنجامەش کەمترم هێنابا دەکەوتم لەخوای گەورە بە زیاد بێت من پێم وایە وەڵامی منی داوە.

منیش دەڵێم وا خوا وەڵامی دایتەوە، بەڵام کاکە شەماڵ پەیمانەکەی خۆتت بردۆتە سەر لەکردنی نوێژی بەیانی.

## شێخ ئەحمەد یاسین:

شێخ ئەحمەد یاسین لەساڵی ١٩٣٨ز لە فەلەستین لە دایك بووەو لە دوانزە ساڵیدا لەیاریدا ئازاری فەقەراتی ملی دەگاتو، ماوەیەك ملی دەگرنە گەچو پاشان بەهۆی ئەم ڕووداوەوە لاوازو بێهێز دەبێتو زۆر بە ئاسانی بە بچوکترین شت دەکەوێت، بەو حاڵەوە خوێندن تەواو دەکاو دەچێتە زانکۆی ئەزهەرو پاشان دێتەوە فەلەستنو لەگەڵ هەژاری وباری تەندروستی خراپیدا، بەهیممەتی بەرزی بزوتنەوەی (حماس)ی دامەزراند، جوولەکە گرتیانو زیاتر باری تەندروستی خراپ بوو تا وای لێهات تەنها سەری دەجوڵاو لەسەر عەرەبانە هاتووچۆی پێدەکرا..

لەهەوڵێکی تیرۆریستیدا لە ئەردەن دەزگای سیخوڕی جوولەکە ویستیان (خالیدمشعل ) بکوژنو سەر نەکەوتنو گیران، ئەمەش بووە مایەی ئیحراجی شا حسێنو بەرامبەر بەئازادکردنی ئەودوو سیخوڕە،جوولەکە شێخ ئەحمەد یاسینی بەردا..

شێخ ئەحمەد یاسین لەبەرنامەی (شاهد على العصر)دا پێش شەهید بوونی بەماوەیەك وتی: من پێش ئەوەی لەدایك بم لەخەودا بەدایكمیان وت: تۆ كوڕت دەبێ‌و ناوی بنێ ئەحمەد.. بۆیە كە لەدایك بووم، دایكم ناوی نام ئەحمەد هەرچەند باوكم دوو ژنی تری هەبوو، هەردووكیان زۆر ناو ئەحمەدیان پێناخۆش بوو، بەڵام دایكم بەقسەی نەكردن..




ئەم پیاوە خوای گەورە وەك بیانووی لەش ساغەكان ببڕێت هێشتیەوە تا مانگی سێی (٢٠٠٤)، كەبەیانیەكیان لەنوێژ گەڕایەوە خۆی و چەند كەسێك كە لەگەڵیا بوون بەموشەكی فڕۆكەی جولەكە شەهید بوون..

د. زغلول النجار دەڵێ: رۆژێ پێش ئەوەی شەهید ببێ لەخەستەخانەبوو گیانی ئەداو كەس بەتەمای نەبوو، خوای گەورە ویستی وا بوو كەلەسەر جێگا نەمرێت و بێتە دەرەوەو شەهیدی ببێ بەنسیبی..

شەهیدبونی ئەم نەبەردە قارەمانە گیانی جیهادو خەباتی كردەوە بەبەری موسڵمانانداو هەموو سەركردە عەرەبەكانی شەرمەزار كرد..

شێخ بەئاواتی خۆی گەیشت کەهەمیشە دەیووت: (انا طالب الشهادە) من بەدوای شەهادەتدا دەگەڕێم.. هەروەها کەدەیووت: من ئاواتە خوازم خوا لێم ڕازی بێت.. کاتێکیش لەبەندیخانەدا بوو دەیوت: من شادمانو بەختەوەرم چونکە لەپێناوی هەقێکدا بەند کراوم کەبڕوام پێیەتی..

بەڕاستی بانگخوازێکی ماندونەناس بوو، توانی بەو حاڵەشەوە ڕووبەڕووی پیلانی دوژمنان ببێتەوە، نەك هەر لەژیان دا بەڵکو پاش مردنیش.. ڕۆژنامەیەکی بەریتانی وتی: ئەگەر ئەحمەد یاسین لەژیاندا بوایە چەندی لەجوولەکە دەکوشت، پاش مردنیو بەشەهید بوونی زۆر لەو ژمارەیە زیاتر دەکوژرێ!..

## دوعای ستەملێکراو

ستەم ئازاری دەروونی ستەملێکراو دەدات و بەکوڵ و دڵ دوعا لەستەمکار دەکات، یەکێ لەپاشاکانی فارس مامۆستایەك بۆ کوڕەکەی دەگرێت، تا بەچاکی پەروەردەی بکات و ئامادەی بکات ببێتە پاشای دوارۆژ، ڕۆژێك مامۆستاکە زۆر لەکوڕی پاشا دەدات بە ناهەق، کوڕیش هیچی دەسەڵات نابێ بیکات بەرامبەریەو زۆر دەروونی ئازار دەدات.. کاتێك باوکی دەمرێت و دەبێتە پاشای وڵات، دەنێرێ بەدوای مامۆستاکەیدا و پێی دەڵێت: فلان ڕۆژ بۆ بەناهەق ئاوا لێت دام و ئازارت دام، ئەمڕۆ ڕۆژی ئەوەیە تۆڵەت لێ بسێنم، ئەویش دەڵێ: ویستم تێت بگەیەنم کە ستەمکردن چەند ناخۆشە، تا ئازارەکەی بچێژیت و هەرگیز ستەم نەکەیت.

کاتێك کەسێکی ستەملێکراو دوعا دەکات لەستەمکار پەروەردگار یان یەکسەر یان پاشماوەیەك کارەکەی بۆ جێبەجێ دەکات و لەفەرموودەدا هاتووە کەخوای پەروەردگار دەفەرموێت (وعزتي وجلالي لأنصرنك ولو بعد حين) بە

گەورەیی و دەسەڵاتی خۆم، سەرت دەخەم ئەگەر پاش ماوەیەکی تریش بێت.. جاری وا هەیە خوا لەبەر حیکمەتێك سزای ستەمکار دوا دەخات، کە ئێمەی بەندەی هەست و هۆش سنووردار نازانین بۆچییە و لەبەر چییە، ئاشکراشە خوای گەورە کەس ناتوانێ موحاسەبەی بکات و بلێ بۆ وایەو بۆ وانیە، وە تەنها ئەوە کە دەتوانێت بە دەسەڵاتی خوایەتی خۆی لەهەموو کەس بپرسێتەوە (لایُسأل عما یفعل وهم یُسألون) الانبیاء ٢٣.

## نزاکەی ئیمام ئەحمەد

کاتێك ئیمام ئەحمەد لەسەر مەسەلەی (خلق القرآن) گیرابوو، وەزیرێك بەناهەق شەقازلەیەکی لێدا، ئەویش دوعای لێکرد وتی: خوایە من مەزلۆمم و هەقم بسێنە بەوەی کە لەلاشەی خۆیدا بەندی بکەی.. بەڵێ خوای گەورە نزاکەی وەرگرت و ئەو وەزیرە پاش ماوەیەك لایەکی تووشی ئیفلیجی بوو، زۆر بێزارو نارەحەت بوو بوو، دەیووت: لایەکم ئەگەر پارچە پارچە بکرێت بەخۆی نازانێت ولایەکیشم ئەگەر مێشێکی پێوە بنیشێ وا دەزانم شاخێکی بەسەرا کەتووە.

## شێخ ئیبراهیم حەسسان

لەچەند مانگی پاش ئازادکردنی عێراق، وەفدێکی کوەیتی هاتن بۆ بەغداو چاویان بە وتارخوێنی مزگەوتێکی بەغدا کەوتبوو کە ناوی (شێخ ئیبراهیم حەسسان)ە، شێخی ناوبراو ڕووداوێکی بۆ گێڕابوونەوە، کە نموونەی دوعا قبوڵ بوونی ستەم لێکراوەو وتبوی: من خەڵکی بەسرەم و لەو شارە وتارخوێن بووم لە

مزگەوتێکدا، لەیادی لەدایك بوونی خۆشەویست دا لەنەوەدەکاندا هۆنراوەیەکی (ولید الأعظمی)م خوێندەوە، کە دەڵێ: (إسلامنا نور لمن یهتدی إسلامنا نار لمن یعتدی)واتە ئیسلامەکەمان نوورە بۆ هەرکەسێك هیدایەت وەرگرێت وئیسلامەکەمان ئاگرە بۆ هەرکەسێك دەست درێژی بکات، تا دەگاتە ئەو دێڕەی کەدەڵێ: ئێمە بەغەیری پێغەمبەر ئیقتیدا بەکەس ناکەین..

پاش تەواوبوونی یادەکە ڕاپۆرتیان لەسەر نوسیم و گیرام لەلایەن ڕژێمەوە.. پاش ئازار و چەرمەسەرییەکی زۆر ڕزگارم بوو، پاشان ساڵی١٩٩٤ گواستیانمەوە بۆ بەغدا، لەیەکەم وتارمدا باسی زوڵم و ستەمم کرد، یەکێ لەئامادەبوان کە لەسەر کورسیەکی کەم ئەندامەکان دانیشتبوو تا لە وتارەکەم بوومەوە گریا.. پاش نوێژ کوڕەکەی نارد بۆلام و وتی: باوکم حەز دەکات سەردانێکی ماڵمان بکەیت، منیش هەرچەند وتم: زۆر سەرقاڵم و کاتم نیە سوودی نەبوو.. ئیتر ناچار چووم بۆ ماڵیان و پاش بەخێر هاتن، بە کوڕەکەی وت: ئەو چادرە لابەن لەسەر ئەو ئۆتۆمبێلە لە گەراجەکەدا.. کەلایان برد سوپەرێکی سپی مۆدێل١٩٨٢بوو کە ڕەقەمی کوەیتی پێوەبوو..

وتم: مەسەلەی ئەم سیارەیە چیە؟ کابرای خاوەن ماڵ وتی: من لەساڵی ١٩٩٠دا لیوابووم لە سوپای عێراقیدا وکاتێك کوەیتمان داگیر کرد، من تەفتیشی بازگەکانم دەکرد لەنێوان عێراق و کوەیت دا، ڕۆژێك ئەم ئوتۆمبێلەم بینی بەدەست لاوێکەوە بوو چەند ئافرەتێکیشی تیابوو، حەزم لێکرد و بەپاسەوانەکانم وت: شەڕ بەو شۆفێرە بفرۆشن، ئەوانیش گێچەڵەیان پێکرد و بوو بەدەمەقاڵێیان و منیش چووم، کوڕەکەم دایە بەرشەق و زللە و زۆرم لێدا تا لەسەر شۆستەکە بورایەوە.. ژنەکان دابەزین بەگریان و زریکەو منیش دەستڕێژێکم کرد بەسەریاندا تا بترسن، ئینجا سەیارەکەمان لێسەندن و هێنامانەوە،

پیرێژنێکیان دوعای لێکردم و وتی: یاخوا تووشی ئیفلیجی ببیت و لەدنیا و قیامەتدا لەخۆت نەحەسێیتەوە..

خوا ئاگادارە پاش چەند ڕۆژێك تووشی پشت یەشە بووم و دواتر قاچی چەپم سڕبوو، بەپەلە بردیانم بۆلای باشترین پزیشکی پسپۆری بەغدا، پاش فەحس کردن، بڕیاریان دا نەشتەرگەری بڕبڕەی پشتم بۆ بکەن.. بەڵێ نەشتەرگەریان بۆکردم و نەجاحەتی نەهێنا و تووشی ئیفلیجی بووم و لەوساوە لەسەر ئەم کورسی کەم ئەندامەم و ئەزانم ئاهی ئەو پیرێژنەیە گرتوومی، تەوبەم کردووە و دەمەوێ ئوتومبێلەکەشیان بۆ بگەڕێنمەوە، ئیتر نازانم چۆن دەستم پێیان بگات و بیاندۆزمەوە.. جا کە تۆ وتارتدا زانیم لەهجەکەت بەسراوی یەو، دیارە خەڵکی بەسرەش تێکەڵاویان هەیە لەگەڵ کوەیتیەکاندا، بەڵکو لەبەر خوا سۆراخێکم بۆ بکەیت و سەیارەکەیان بۆ بگێڕینەوەو گەردنم ئازاد بکەن..

شێخ ئیبراهیم دەڵێ: منیش پێم وت: ئاخر کێ ئەوێرێ پەیوەندی بکات بە کوەیتیەکانەوەو تەلەفۆنیان بۆبکات، دیارە حکومەت بەشتی وابزانێ سزای قورسی لەسەر ئەدات.. ئیتر هەموو هەینییەك کوڕەکەی دەناردە لام دەیووت: باوکم دەڵێ: بە قوربانە چی بۆکردووین؟ منیش دەمووت: بەخوا هیچم بۆنەکراوە، ئەمە ساڵێکی خایاند، تا لەساڵی١٩٩٥دا بۆ کارێکی خۆم سەردانێکی بەسرەم کرد و کەویستم بگەڕێمەوە بۆ بەغدا چەند سەعاتێك لە نەقلیات چاوەڕێم کرد سەیارەیەکی بەغدام دەست نەکەوت..

برادەرێك کە منی ئاوا بینی وتی: یاشێخ فلان کەسی گەڕەکی خۆمان سەیارەی پێیە و دەچێت بۆ بەغدا بۆ لەگەڵ ئەو ناچی، منیش وتم: زۆر باشەو ئیتر ڕۆیشتم برادەرەکەم دۆزیەوەو لەگەڵی سواربووم بەرەو بەغدا، دیارە ڕێگەیەکی دوورو درێژە و کەوتینە گفتوگۆ، برادەرەکە وتی: مامۆستا هەرچەندە ئەم سەیارەیە زۆر

باش نیەو لایەق بەجەنابتان نیە، چیبکەین خوابیانگرێت سەیارەیەکی باشمان هەبوو ئەو زاڵمانە لێیان سەندین، منیش پێم وت: قەت ناشێ سەیارەکەت سوپەرێکی سپی مۆدێلی١٩٨٢ی ڕەقەم کوەیت بێت، برادەرەکە هەر ئەبلەق بوو، وتی: یاشێخ دەڵێی کەراماتت هەیە؟ وتم: نا کەراماتم نیە، وەرە بتبەم بۆلای سەیارەکەتان..

ئیتر بردم بۆ ماڵی لیواکە و سەیارەکەی دایەوەو وتی: بەڵکو تەلەفۆن بکەی بۆ نەنکت لە کوەیت تا گەردنم ئازاد بکات، کوڕەش وتی: کێ دەوێرێ لەعێراقەوە پەیوەندی بکات بە کوەیتەوە..

کابرای لیوا وتی: باشە پەساپۆرتت بۆ تەرتیب دەکەم و لەسەر حسابی من بچۆ بۆ (عەممان) و لەوێوە تەلەفۆن بکە.. بەڵێ.. پاش ماوەیەك هەموو شتێکیان بۆ ئامادەکرد و چوو بۆ عەممان و تەلەفۆنی کرد بۆ کوەیت و بەنەنکی وت: نەنە خوا کردی وا سەیارەکەمان دەستکەوتۆتەوەو کابرای لیوا تووشی ئیفلیجی بووەو داوای گەردن ئازادی دەکات، نەنکیشی ئەوەندەی تر دوعای لێکردو وتی: گەردنی ئازاد نەبێت و خوا لەوە خراپتری لێبکات.. کوڕە کە گەڕایەوە بەغدا لێمان پرسی ها چی بوو؟ وتی: بەخوا چی خەریك بووم لەگەڵیا، گەردنی ئازاد نەکرد، منیش پێم وت: ئاخر کوڕی باش چۆن ئیش وا دەکرێ، ئەبوایە هەندێ فەزڵی عەفوکردن و لێخۆش بوونت بۆ باسکردایە و ئینجا داوای گەردن ئازادیت لێبکردایە.. ناچار جارێکی تر لەسەر حسابی (لیوا)ەکە چووەوە بۆ عەممان و ئینجا بەجۆرێکی تر قسەی لەگەڵ نەنکی کرد تا ڕازیبوو گەردنی ئازاد بکا.

خوا ئاگادارە پاش دوو هەفتەیەك کابرای لیوا بەرەوچاکی ڕۆیشت و لەسەر عەرەبانەکە هەستا و ئێستا بەگۆچان دێت بۆ مزگەوت بەپێی خۆی..

(ئەم ڕووداوە لە ڕەمەزانی ٢٠٠٣، دکتۆر محمد عوضی لە بەرنامەکەی (صور وخواطر)دا باسی کرد).

## چاکە بەزایە ناچێت: یەکەم :

لەپێش شەڕی عێراق - ئێراندا، لەیەکێ لەگوندەکانی خۆمان لەسنووری ئێران لای چوارتاوە، لە دەمەو ئێوارەیەکی زستانی ساردا، پیاوێکی گوندەکە تارمایی سەربازێك دەبینێ کە لە (ئیجازە)گەڕاوەتەوەو لەسەرمادا لەوەدایە ڕەق ببێتەوەو دیارە ناتوانێ بگاتەوە( ڕەبیەکەیان ) کە لەسەر چیاکە دەبێت.

ئەو پیاوە دەچێت بەدەم سەربازەکەوەو دەیهێنێتەوە بۆ ماڵەوەو ئەو شەوە خزمەتی دەکات و بەیانی لەگەڵ کوڕەکەیدا بەوڵاخێك دەینێرێتەوە بۆسەر چیاکە بۆلای سەربازەکانی تر، پاش ماوەیەك شەڕی عێراق - ئێران دەست پێدەکات و گوندەکە ڕادەگوێزرێت.

پاش چەند ساڵێك و پێش ڕاپەڕین ئەو پیاوە هەندێ وڵاخ و مەڕو ماڵاتی خۆی و خەڵکی تر دەبات بۆ موسڵ و دەیفرۆشێت بە سی هەزار دیناری سویسری و پارەکە قایم دەکات لەجلەکانیداو دەیشارێتەوە، کە دەگەڕێتەوە لەسەیتەرەی کەرکوك هەولێردا دەیگرن و پارەکەی لێدەسەنن و دەڵێن: ئەوە پارەی پێشمەرگەیەو، لەبەر سووری هەتاودا ڕایدەگرن و کەلەبچە دەکەنە دەستی، ئەمیش چی قسە دەکات گوێی لێناگرن و بێسوود دەبێت.

ئالەم کاتەدا کوردێکی ئاوا بەو پارەیەوە بەردەست جەندرمەکانی بەعس بکەوێ، ئاشکرایە بەئاسانی وازی لێناهێنن، بەڵام دیارە خوای گەورەش بەڕەحمەو ئەوەندەی پێناچێت سەیارەیەکی عەسکەری دەوەستێ و ئەفسەرێکی پلە بەرزی لێ دادەبەزێت کەحیمایەیەکی زۆری دەبێت و بەدارەکەی دەستی دەکەوێتە گیانی سەربازەکانی سەیتەرەکەو دەڵێ ئەم پیاوەتان بۆ لەم گەرمایەدا ڕاگرتووە، ئەڵێن: گەورەم ئەوە پارەی ( مخربین )ی پێیەو گرتومانە، ئەڵێ: شتی وانیەو پارەکەیان لێ دەسێنێتەوەو کابرا لەگەڵ خۆیدا سەردەخات.

لەرێ بەکابرا دەڵێت: نامناسی؟ دەڵێ:نەخێر، دەڵێ: باش بیرکەرەوە چ خێرێکت کردووە! هەرچی بیر دەکاتەوە ئەو چاکەیەی زووی بیر ناکەوێتەوە.

تومەز ئەو ئەفسەرە سەربازەکەیە کەکاتی خۆی پێش زیاتر لە دەساڵ ئەم چاکەی لەگەڵ کردووەو لەمردن و ڕەق بوونەوە ڕزگاری کردووەو بەهۆی ئازایەتیەوە لەشەڕی ئێران – عێراق دا (نوط الشجاعة)ی وەرگرتووە و ئاوا پێشکەوتووە وبووە بەو ئەفسەرە.

ئنجا دەڵێ بۆ کوێ دەچی، دەڵێ: دەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ سلێمانی، دەڵێ: بابتگەیەنین، ئەویش دەڵێ: ماڵت ئاوابێت تەنها بم گەیەننە نەقلیاتی کەرکوك خۆم دەگەڕێمەوە، ئەفسەرەکەش دەیباتە نەقلیات و سەیارەی حیمایەکانی لەگەڵ دەنێرێ تا لە سەیتەرەی کەرکوك بەسەلامەتی دەری دەکەن، بەڕاستی ئەمە وانەیەکی گەورەیە کەئەو کابرایە بۆ ناسیاوێکی منی گێڕاوەتەوە لەدوای ڕاپەڕین کەگەڕاوەتەوە بۆ گوندەکەی خۆی.

## چاکە بەزایە ناچێت: دووەم:

رائید ئەبو شەقرە لەئەردەن دەڵێت:پاش تەواوکردنی زانکۆ چوومە کۆمپانیاکەی باوکم کاربکەم و بەشێکم وەرگرت، تەندەرێك هەبوو ئەبوایە شەست هەزار دینارمان بارمتە دابنایە، ئێمەش لەوکاتەدائەوەندەمان لە ژمێریاری نەبوو، زۆرم پێناخۆش بوو ئەو تەندەرەمان لەکیس بچێت، چوومە لای باوکم،وتی: دوامۆڵەت کەیە؟ وتم: سبەی نیوەڕۆ، وتی: خوا کەریمەو رۆیشتەوە بۆماڵەوە بۆ پشوودان، زۆرم پێناخۆش بوو باوکم وەك من حەماسی نەبوو بۆ وەرگرتنی تەندەرەکە.

ئێوارە زانیم کەباوکم ٢٠هەزاردیناری کردووە بەخێر ئەوەندەی تر نارەحەت بووم وپێمووت: ئێستا کەی وەختی خێرکردنە؟ وتی: کورم هەرکارێت قورس بوو خێر بکە ئاسان دەبێت!

بۆسبەی دووسەعاتی مابوو بۆ تەندەرەکە کۆمپانیایەك گرێبەستیان لەگەڵ کردین کەبایی نیوملیۆن دیناربوو، پێشەکی ٦٠هەزاردیناریشیان هێنا ومنیش بەو پارەیە چووم تەندەرەکەم وەرگرت! بەڕاستی ئەمەبوو بەوانەیەك و ئەزموونێکی گەورە بۆم کە ﴿ قُلْ إِنَّ رَبِّي يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ لَهُ وَمَا أَنْفَقْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُ وَهُوَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ ﴾ سبأ:٣٩.

ئەوەش وێنەی رائید ئەبوشەقرە ورامی برایەتی کەساڵی ٢٠١١بەبۆنەی تێپەڕبوونی پەنجا ساڵ بەسەرکۆمپانیاکەیاندا کەساڵی ١٩٦١ دامەزراوەو وەکیلی سەد کۆمپانیای جیهانین لەبواری جل و بەرگ و سەعات و بۆنداو شەست و پێنج لقیان هەیە، خوانی رۆژووشکانیان بۆ کارمەندەکانیان کردووە لە ئوتێلی (الفور سیزنز).



## چاکە بەزایە ناچێت: سێیەم:

بازرگانێکی سولەیمانیله سالّی ٢٠٠٠دا لەئەردەن پشکنین ئەکات دەڵێن: شێرپەنجەی ریخۆڵەتە و دێتەوە لەخەستەخانەی هیوا بیخەنە سەر عیلاج، لەوکاتەدا برادەرێکی خۆشەویستیشی ناساغ دەبێت و لەبەرنەبوونی باوکی سەری دونیای لێدێتەوە یەك چۆن بیبات بۆ تاران، ئەمیش دەڵێت:خۆم دەیبەم، دەڵێن:تۆش وەزعت تەواونیە..

ئەڵێ:قەیناکە بەڵکو بەیەکەوە بمرین! لەتاران دەچنە لای پزیشك وپشکنین بۆ برادەرەکەی دەکەن وعیلاجی بۆدەنووسن، دکتۆرەکە بەمیش دەڵێت: تۆش لەوە ئەچێت وەزعت تەواونەبێت؟ دەڵێ: بەتەمام چارەسەری شێرپەنجە وەرگرم، دەڵێت: وەك هاتوویت تۆش پشکنین بکە، دوای پشکنین دەرئەکەوێت پشکنینەکەی ئەردەن ناتەواو بووەو شێرپەنجەی نەبووەو خوا بەو چاکەیەی هەرزوو پاداشتی دایەوەو لەدەرزی و دەرمانی شێرپەنجە رزگاری بوو. ﴿**لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلَا ذِلَّةٌ أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ**﴾ یونس:٢٦.

## یادەوەری بازرگانێک:

سامیح بازرگانێکی میسریە خاوەنی کۆمپانیای هاوردەکردنی مەکائینی گەورەیە وەك شۆفڵ و حەفارە لەئیتاڵیاوەو تەمەنی ٤٠ ساڵێك دەبێت، ناوبراو دەڵێت: بیست ساڵێك لەمەوبەر بێکاربووم و هیچ بڕوانامەیەکیشم نەبوو، زۆر لەخوا پاڕامەوە دەرگای بژێویم لێ بکاتەوە، خزمێکمان هەبوو لەسەفارەتی ئیتاڵیا چێشت لێنەربوو، داوای قەرزم لێکرد، وتی: بۆکارناکەیت؟ وتم: جالەکوێ؟ وتی:بەڵکو فیزەیەکی ئیتالێت بۆ وەرگرم، هەرچۆنێك بوو چوومە ئیتاڵیا وزۆرهەوڵمدا، پاش چەند ساڵێك بازرگانێکی میسریم ناسی لەئیتاڵیاوە پارچەی مەکائینی گەورەی هاوردەدەکرد، چەند ساڵێك کارم لەگەڵ کردو پاشان

کۆمپانیام دامەزراندو خوا دەرووی خێری لێکردمەوە وهەمیشە ئەو ساتە وەختەم لەیاد ناچێت کە بەڕاستی لەخواپاڕامەوە وهات بەدەممەوە﴿ أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاءَ الْأَرْضِ أَئِلَهٌ مَعَ اللَّهِ قَلِيلًا مَا تَذَكَّرُونَ ﴾ النمل:٦٢.

## تادونیای روونه فریاکەون!

تافرسەت ماوەو تا چرای ژیانتان نەکوژاوەتەوە هەقی کەس بەسەرخۆتانەوە مەهێڵن! چونکە هەمووی خوا ئاگاداریەتی و لەسەرتان تۆمارکراوە و مسقاڵە زەرە ون نابێت..کاك حاجی کامەران وتی: جەنابی حاجی قادری باوکی ئافرەتێك کرێچی ئەبێت و پاش ئەوەی کرێی چەند مانگێکی لائەبێت خانووەکە چۆڵ دەکات و کرێکە نادات.

پاش چەند ساڵێك کەسێك دێت بۆلای ودەڵێت:تۆحاجی قادریت ئەڵێ: بەڵێ! فلان کەس چەند ساڵ لەمەوبەر کرێچی تۆ بووە؟ بەڵێ! بۆچی؟ وتی: زۆر دێتە خەوم و دەڵێ: بچن بۆلای حاجی قادر قەرزاریم و لەسەر ئەوە دەمسوتێنن، منیش وتوومە حاجی قادر ناناسم، لەکوێ بیدۆزمەوە، ناونیشانی تەواوی تۆی پێداوم تەنانەت ئەوەش کەلەژێر دارتووەکەی بەرماڵتان دائەنیشیت! ئنجا نازانم چەندت لایەتی، حاجی وتی: ١٥٠٠ دیناری سویسریە!وتی: جائێستا پارەکە گۆڕدراوە،چی بکەین گەردنی ئازاد دەکەیت؟

وتی: نەوەڵا ئەیشکێنینەوە بەپێی ئەو رۆژە! پارەکەیان شکاندەوە بەپارەی ئێستاو ئنجا کاك حاجی گەردنی ئازاد کرد..

مامۆستا هەڤاڵی تەقتەقیش باسی ئافرەتێکی خزمی خۆی کرد شتێك دەکرێت کەرۆژی دواتر پارەکەی بدات وجەڵتە لێی ئەدات و ئەمرێت، ئەچێتە خەوی

خزمێکیەوەو ئەڵێت: دوێنیێ فلأنە شتم لەفلأن کەس کڕیوە ئەبوایە پارەکەیم بۆ بردایەو وا مردم، پارەکەی بۆببەن لەسەر ئەو قەرزە رایانگرتووم!

یاالله ئەبیّ حسابی بەرپرسە نابەرپرسەکان چۆن بێت کە سەرزەوی و ژێرزەوی ئەم ولأتانە تالأن دەکەن و خوێنی هەزاران خەڵکی بێتاوان وا لەگەردنیانا! پەنا ئەگرم بەتۆ خوایە!دوائایەتی قورئان کەدابەزی دەفەرموێت:﴿ وَاتَّقُوا يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللَّهِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾البقرة:٢٨١.




***

## شێخ محمد غەزالی ئەڵێت:

یەکە-کاتێ دکتۆر (عبدالحلیم محمود)بوو بە وەزیری ئەوقاف، پێی وتم کە بچم لە مزگەوتی عەمری کوڕی عاص جومعەی داهاتوو وتاربدەم، مزگەوتەکە کەوتبووە ناوچەی(الفسطاط) لەخوارووی شاری قاهیرە. ئەو ڕۆژەی کەفەرمانی پێدام سێشەممە بوو، تاوەکو جومعە ئەوەندەی نەمابوو، وەفریای پاکردنەوەو رێکخستنی مزگەوتەکە نەدەکەوتم، بۆیە داوام لێکردکە مۆڵەتم بدات، کەچی ئەو هەر سوور بوو لەسەر قسەکەیو فەرمووی: ئەم جومعەیە دەبێ نوێژی تیا بکەیت و وتاری تیا بدرێت.

ناچار منیش نزیکەی پەنجا قوتابی خۆمم لە ئەزهەر ئاگادارکرد کە بێن هاوکاریم بکەن لەپاکردنەوەی مزگەوتەکەدا، بەوشێوەیە مزگەوتەکەمان لەماوەیەکی کەمدا پاککردەوە بەمەرجێك لەهەندێ شوێنیدا تا سەقفەکەی خۆڵ ودارو بەردی تیابوو.. هەمووی چەند جومعەیەکی نەخایاند خەڵکی لەهەموو لایەکەوە ڕوویان کردە مزگەوتەکەو بەجۆرێك نوێژکەر زیادیکرد ژمارەیان لە (١٥٠٠٠) پانزە هەزارکەس تێپەڕی.

لەدڵما شتێك هەبوو بەرامبەر بە (مەعاویەو عەمری کوڕی عاص)و هەموو ئەوانەی کاتی خۆی ڕوبەڕووی ئیمامی عەلی بووبوونەوەو زۆر ڕەخنەم لێدەگرتن، تا ڕۆژێك شێخ (باقوری)هاوەڵم بانگی کردم بۆ ماڵی خۆیان و هەر کەدانیشتم پێی وتم: ئەوە چیت هەیە لەگەڵ (عەمری کوڕی عاص)دا؟، وتم هیچم نیە تەنها ئەوەندە نەبێت کە لەمزگەوتەکەیدا جومعە دەکەم..

شێخ باقوری وتی: واز لەوە بهێنەو گوێم بۆ بگرە، خەوێکم پێتەوە بینیوە، لەخەوما لەماڵەوە بووم، گوێم لەیەکێك بوو وتی: والی هات، والی هات! پرسیارم کرد والی کێیە؟، وتیان: (عەمری کوڕی عاص)ە. کەهاتە ژوورەوەو بینیم

سامم لێکرد، پێی وتم: بەشێخ غەزالی بڵێ: من لێی خۆش بووم لەو رەخنانەی کە لێی گرتووم و لەو قسەو باسانەی کەدەیکات چونکە مزگەوتەکەمی ئاوەدان کردۆتەوە...

پاش ئەوەی خەوەکەی بۆ گێڕامەوە یەکسەر دڵم پڕ بوو لەگریان و زانیم کە ئەوە ئیشارەتێکە بۆ ئەوەی کە لەدڵمایە بەرامبەر ئەو پیاوە بەرزانەی ئیسلام، بە(شێخ باقوری)م وت: من پەشیمانیم دەرئەبڕم لەبەردەمی تۆدا، بەڕاستی هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) ئەبێت بەڕێزەوە سەیربکرێن. باشە ئەگەر سەرکردە (عەمری کوڕی عاص) فەتحی میصری نەکردایە لەکوێ ئیسلامەتی بەمن دەگەیشت؟!.



دووەم- قوتابی بووم لە زانکۆی ئەزهەر، بروسکەیەکم بۆ هات لەماڵی باوکمەوەکە تیایدا داوایان لێدەکردم زوو بگەڕێمەوە بۆلایان، منیش زانکۆم بەپەلە بەجێهێشت بینیم باوکم حاڵی زۆر خراپەو ئازارێکی زۆری هەیە بەهۆی بەردی گورچیلەوە. نەمان دەزانی چی بکەین، پارەمان نەبوو نەشتەرگەری بۆ بکەین، لەلایەکی تریشەوە ئەگەر پارەشمان بۆ قەرز بکردایە نەماندەوێرا نەشتەرگەری بۆ بکەین، چونکە مامم بەهۆی نەشتەرگەری گورچیلەوە گیانی لەدەست دابوو. پزیشك هەندێ حەبی ئازاری دابەباوکم، منیش ناچار چوومە سەر دوکانی باوکم، چونکە کەسمان نەبوو بیکاتەوە، زۆر دڵتەنگ و ناڕەحەت بوو، دنیام لێببوە چەرمی چۆلەکەو سەری دنیام لێ هاتبۆوە یەك.

پیاوێك هاتە دوكان و هەندێ شتی لێکڕیم و بەدەنگێکی نزم و زۆر بەشەرمەوە وتی: پارەکەم پێ نیە، بەخوا سبەینێ بۆت دەهێنم. منیش زانیم راست دەکات، وتم ئەوە بۆخۆت و بڕۆ خوات لەگەڵ. کابرا رۆیشت و لەخۆشیدا نەیدەزانی چی بکات، ئینجا چوومە سوچێکی دوکانەکەوەو وتم: خوایە پێغەمبەرەکەت پێی راگەیاندوین کە چارەی نەخۆشەکانمان بەخێرو سەدەقە بکەین، داوات لێدەکەم بەوخێروسەدەقەیەی ئێستام باوکم چاك بکەیتەوە. ئیتر لەسەر زەوی یەکە دانیشتم و زۆر گریام.

پاش سەعاتێك لەماڵەوە بانگیان کردم " کە نزیکی دوکانەکەمان بوو، بەپەلە گەڕامەوە زۆر ئەترسام. کەگەیشتمە ماڵەوە، باوکم هات بەرەو پیرم و وتی: ئێستا ئەم بەردەم فرێدا، نازانم چی بووە، شکور ئازارم نەماو سەرفرازبووم. منیش زۆر سوپاسی خوام کرد، کە هات بەهانامەوەو بۆ سبەینێ گەڕامەوە بۆ زانکۆ و لەسایەی خواوە بەردەوام بووم لە خوێندن!.

...وێنەی مزگەوتەکە (ساڵی ٢١ کۆچی دروست کراوە).



## خوائەتپاریزێت!!

پەیامداری ئاسان نیە، چونکە چەند بەرزبیتەوە کەوتنە خوارەوە سەختترە وموغرەیات زیاتر ئەکەوێتە سەرەتاتکێ بۆت، لێرەدا نموونەیەك باس دەکەم کەئەویش شێخ محمد صدیق مەنشاویە، ناوبراوسالّی ۱۹۳۰ لەدایکبووەو باوکی قورئان خوێن بوو، لەهەشت سالّیدا قورئانی هەموولەبەرکرد، کاریگەری باوکی ومامی لەسەربوو، مردنی برایەکی بەگەنجی کاریگەری هەبووە لەسەری وە بە قورئانخوێنی گریاو بەناوبانگە.

رادیۆی میسری داوایان لێکرد کەخۆی و باوکی بچن تاقیان بکەنەوە تا ببنە قورئان خوێنی رادیۆ، ئەوانیش بەوە قایل نەبوون ونەچوون، تا لە موناسەبەیەکدا قورئانیان بۆ تۆمارکردو داوایان لێکرد کە بەبیٚ تاقیکردنەوە بچێتە رادیۆ قورئان تۆماربکات هەرنەچوو تا ناسیاوێکی زۆر خەریکبوو لەگەلّیا تاقایلی کرد.ئاوازدانەرێك لەسالآنی شەستەکاندا داوای لێکرد کەئاواز بۆ قورئانخوێندنەکەی دابنیٚ وئەو تەنها کەسە کە ئەم بەدلّی بێت ئەوکارەی بۆبکات، ئەویش بەوە قایل نەبوو وتی:من مۆسیقا لەقورئانەوە فێربووم، چۆن تۆ قورئان تەلحین ئەکەیت بە مۆسیقا..

جەمال عەبدول ناسر وەزیرێکی نارد بۆلای کە لە ئاهەنگێکدا قورئان بخوێنیٚ کەئەو تیا ئامادە ئەبێت، وەزیرەکە هاتە لای و وتی:شەرەفمەند ئەبی کە لەحزوری سەرۆکدا قورئان بخوێنی.ئەویش پێی وت: جابۆسەرۆك شەرەفمەند نابێت بەگوێگرتن لەمەنشاوی کەقورئان ئەخوێنیٚ،بەڕاستی سەرۆك خراپترین نوێنەری ناردووەو نەچوو.

لەسالّی ۱۹٦۳دا کەسێك دەعوەتی ئەکات لەپاش موناسەبەیەك بۆ نانخواردن، ئەویش کەئەچێت چێشتلێنەرەکە بەدزیەوەدێتەلای و ئەلەرزیٚ و ئەلّیٚ قوربان

کەسێك پارەی داوەمەتێ ژەهربکەمە خواردنەکەتەوە، تکایە ئەوەی بۆت دائەنرێت مەیخۆو باکەسیش نەزانێت بانان براو نەبم، کەخواردنەکەی بۆدائەنرێت داوای لێبووردن ئەکات و تەنها پارچە نانێك لەبەردڵی خاوەن موناسەبەکە ئەخوات و ئەڕوات شوێنەکە بەجێ دەهێڵێ، لە تەمەنی ٤٩ ساڵیدا بەنەخۆشی دەوالی قورڕگ کۆچی دوایی دەکات..بەو هەموو سەدەقە جاریەی کەلەدوای خۆی بەجێی هێشتووەو قورئانخوێندنەکەی مەدرەسەیەکە وتاقیامەت خزمەتی قورئان ئەکات..

## خوا زانایەو ئاگاداری دڵەکانە بیەوێ ئاوا ئەینێرێت:

لەم ساڵانەدا ئەم پیاوە هەژارەی دارستانەکانی غانا ئەم فڕۆکەیە لای کوخەکەیەوە نیشتەوەو ئەویش دایەوە بەتیمی کەناڵێکی تورکی کەبۆ وێنەگرتن بەکاریان ئەهێناو بەپێکەنینەوە پێی وتن، لەمە گەورەترتان لانیە بمبات بۆمەککە بۆحەج.. یەکێك لەتیمەکە ئەمەی لەتویتەردا بلاَوکردەوە گەیشتەوە بەکەسانێك کەهەموو تێچووی حەجیان بۆ دابین کردو ئاواتەکەی هاتە دی و چوو بۆحەج.. بەڕاستی حەج گەشتی دڵە پێش جەستە.. خوا بیکات بەنسیبی هەموو عاشقێکی ماڵی خوا..ئامین..



### ئەوەی بەختەوەرم دەكات ئەوەیە:

خوازیندووەو هەرگیز نامرێت

بەخشندەیەو كەس بێئومێد ناكات

میهرەبانەو هیوا ناكوژێت! (ئەحمەد شوقەیری)

## هاوارو هانات با بۆخوابێت

﴿ يَسأله مَن في السّماوات والأرضِ كلَّ يومٍ هو في شَأن ﴾ الرحمن:٢٩.

هەموو گیانلەبەرو زیندەوەران، هەرچی هەن لە ئاسمانەكان و زەوی، هەموو كات بەگوتار و بەزمانی حاڵ، داوای پێویستیەكانیان لەخوا دەكەن، هەموو ڕۆژێك و هەموو كاتێك ئاگاداریانەو دەچێ بەهانایانەوەو كاریان بۆ جێبەجێ دەكات و ملیارەها ملیار كار تاوتوێ دەكات بە(كن فیكون)لەبوونەوەرو لەجیهانی ئادەمیزاد و پەری و فریشتەكان.

ئەگەر لەدەریادا ڕەشەبا هەڵی كردو شەپۆل هات،

سەرنشینانی كەشتی هاوار دەكەن: یا اللە...

ئەگەر كەسێك لەبیاباندا ونبوو، یان كاروان لەڕێ لایداو سەرگەردان بوون...

هاوار دەكەن: یا اللە...

ئەگەر دەرگا بەڕووی داواكارێكدا داخراو هیچ كەس لای لێ نەكردەوە،

هاوار دەكات: یا اللە...

ئەگەر هیچ دایی نەداو هەموو ڕێگاكان داخران، هیوا بڕاو دەست بەهیچا نەگەیشت...

هاوار دەكرێ: یا اللە...

ئەگەر سەری دنیات لێ هاتەوەیەك و دڵت تەنگ بوو، تروسكایی نەما ئالەوێدا

هاواربکەو بڵێ: یا الله...

باش بزانە هاوارەکان بۆ لای خوا بەرزدەبنەوەو لەو کاتەدا کە کەس نیە لەم بوونەوەرەدا بێت بەهاناتەوە، خوا هەیە کە دێت بەدەم داواتەوە، دەتبینێ و شەکوات دەبیستێ ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ، فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴾ واتە: ئەگەر بەندەکانم لەبارەی منەوە پرسیاریان لێکردی، ئەوا من نزیکم و وەڵامی داواکەران دەدەمەوە کاتێك داوایەکیان لێم دەکەن، دەبا ئەوانیش هەروەك من چۆن وەڵامیان دەدەمەوە، باوەڵامی من بدەنەوەو بڕوام پێ بهێنن، بەڵکو ڕێیان پیشان بدرێت و سەرفراز ببن...(لا تحزن/ عائض القرني).

مامۆستا محمد حامد کە لەمزگەوتی گەیلانی لای عەلوەکە لەسلێمانی پێشنوێژی دەکرد بۆی گێڕامەوە کە لە دوای ڕاپەڕین لە (گوندی باریکە)دەبن لەسلێمانی و، باوکی تووشی نەخۆشیەکی سەخت دەبێت و چەند جار دەیهێنێت بۆ لای دکتۆر بۆ سلێمانی و پارەو پولیان بەدەستەوە نامێنێ، ئێوارەیەکیان پیاوێکی ناسیاویان سەردانیان دەکات و بەباوکی دەڵێت: تۆ زۆر زەرووره گۆشت بخۆیت بۆ ئەوەی چاك ببیت...

باوکیشی بەمامۆستا محمد دەڵێت کوڕم بەڵکو گۆشت بکڕی، دەڵێن بۆ من باشە.

مامۆستاش زۆر خەمبار دەبێت چونکە دەمەو ئێوارەیەو نەهیچی پێیەو نەکەسیش شك دەبات لێی قەرز بکات، بۆیە دەچێتە ژوورەکەی ئەو دیویان و تێر دەگری لەداخی بێ وەزعی وبێ دەسەڵاتیان... ئەوەندە ناخایەنێت کە کۆمەڵێ قازوقوڵنگ بەئاسمانا تێدەپەڕن و هەندێ چەکدار کە لەو ناوچەیەدا دەبن تەقەیان لێ دەکەن، بەقەدەری خوا دانەیەکیان دەکەوێتەماڵی مامۆستاوە خێرا سەری

دەبڕێ و بۆ باوکی لێ دەنێ و، خوای گەورە بەفەزلی خۆی دڵیان خۆش دەکات... قورئان دەفەرموێت:﴿ **أمَّن يجيبُ المضطرَّ إذا دعاه ويكشف السوء ويجعلكم خلفاء الارضِ ءَإله مع الله قليلاً ماتذكرون** ﴾ النمل:٦٢.
واتە: ئایا کێیە جگە لەخوا کەبێت بەهانای لێقەوماوو بێدەرەتانەوە، کاتێك لێی دەپاڕێتەوە، ئەوسا بەڵاو ناخۆشیەکان لادەبات و دەتانکاتە جێنشین لەزەویدا، ئایا خوا هاوەڵو هاوبەشی هەیە؟؟ کەمێك بیرکەنەوە و یاداوەری وەرگرن.

## پەیامدارەکان:

## ئەوانەی کە خوا بەچاکی ئەناسن و ئەزانن ئەو ماڵ و سامانەی هەیانە خوا داویەتی. بەردەوام خێروچاکە دەکەن بۆ ئەوەی خوا لەخۆیان رازی بکەن کەخوا (شاکر علیم)٥ بۆنموونە:



دکتۆر عصام فلەیج لەکوەیتەوە لەپێگەی گۆڤاری (المجتمع)دا ئەڵێت:
١- خێزانێکی کوەیتی سی ساڵ خزمەتکارێکی ئەندۆنیسیان هەبوو، ناوبەناوسەردانی ولاٚتی خۆی دەکردەوەو تەمەنی بووە ٥٥ ساڵ تووشی نەخۆشی شەکرە بووبوو، هەمیشە هاوەڵێکم کەسەردانی ئەکردن ئەیووت: ئەم داماوە کەی ئەگەڕێتەوە بەیەکجاری بۆ ولاٚتی خۆی پشوویەك بدات، تاماوەیەك نایبینێ و ئەحواڵی ئەپرسێت، ئەڵێن: چۆتەوە بۆ ئەندۆنیسیا وئاواتەکەی هێنایە دی، وتی: ئاواتەکەی چی بوو مناڵەکانی خوێندنیان تەواوکرد؟؟خاوەن ماڵەکە وتی: ئەوەهیچ مناڵەکانی زانکۆی پێخوێندن بەلاٚم

ئاواتی ئەوەبوو مزگەوتێك دروست بكات،ئەوەش وێنەی مزگەوتەكەی كەبۆی ناردوین بەناوی مزگەوتی فاتیمە!

بەڕاستی ئەوەیە هیممەت بەرزی و پەیامداری سی ساڵ لەغەریبی خزمەتكاری بكەیت، ڕاستە ماڵ ومناڵی پێبەخێوكرد بەلاَم بەدروستكردنی مزگەوتێك كۆشكێكیشی بۆخۆی بنیات نا لە بەهەشتا..

٢- فاتیمە بوقەمبەری كوەیتیش لە شاری شیفیلدی بەریتانیا یانەیەكی كڕیو كردی بەمەركەزێكی ئیسلامی بەناوی مەركەزی ئیسلامی فاتیمە بوقەمبەر، بەڕاستی ئەوەش سەدەقەی جاریە بۆ ئەو بەڕێزە..هەروەها لەئەمستەردامیش لەهۆڵەندا بینایەكی گەورەی كڕیو كردی بە مەركەزێكی ئیسلامی وقیامەتی خۆی ئاوەدان كردەوە.

٣-ئافرەتێكی كوەیتی تریش لە شاری سان لوی فەڕەنسی لەمزگەوتێكدا نوێژدەكات، مزگەوتەكە بچوك دەبێت گەورەی ئەكات وناوی ئەنێت (مەركەزی نورەی ئیسلامی ).

٤-ئافرەتێكی تری كوەیتیش لەشاری سترانبۆرگی فەڕەنسی مزگەوتێكی گەورەكرد وناوی نا مزگەوتی ناصر..ئەمە ئافرەتان، خێرخوازێكی پیاوی كوەیتیش بەناوی باوكی عبدالعزیز تائێستا سەد مزگەوتی لەولاَتان دروستكردووەو ئاواتێتی بیگەیەنێتە هەزارمزگەوت..ئەوانە مشتێكن لەخەرواری خێرخوازانی ئەم ئومەتە كە لەهەموو سەردەمێكدا وەك ئەستێرە ئەدرەوشێنەوە لەئاسمانی ئیسلامەتیدا.

***

## ئەوەیە ئارامگرتن!

**کەمرۆڤ لەدەسەلآت و کارسازی ودانایی و زانستی بێپایانی خوا تێگەیشت. کەزانی هەموومان هی خواین و بۆلای ئەو ئەچینەوە. کەزانی هەموو رووداوو وردودرشتێکی ئەم بوونەوەرە لەژێرچاودێری خوادایە. ئەوە لەسەربەلآوموسیبەتەکان تا دواپلە ئارام ئەگرێت بۆنموونە:**

دکتۆر عبدالوهاب الطریری بانگخواز ئەلێت:

قەدەری خوا بووکەمن (صدمە)ی یەکەمی ببینم، شێخ سەلمان عۆدە لە تورکیابوو منیش ئەبوایە پێنجشەمە بەیانیەکەی بچم لەفرۆکەخانەی ئەستەنبوڵ بەیەك بگەین و پاشان بەیەکەوە بچین بۆ شاری هلسنکی بۆکۆنفرانسی ئیمام و وتاربێژانی فلەندا، ئەو مەوعیدەم بەلاوە قورس بوو زۆرهەوڵمدا پێشی بخەم،جێگایەکی بەتاڵ هەبوو لەفرۆکەدا چوارشەممە عەسر گەیشتمە ئەستەنبوڵ لەفرۆکەخانە شێخ سەلمان هاتبوو بەپیرمەوەوئەو ئێوارەیە بەیەکەوە بووین.

کەچوینەوە شوققەکەی برادەرێك تەلەفونی بۆکردم وتی: دەبێ بگەرێنەوە بۆ سعودیە ماڵ ومناڵی شێخ تووشی رووداوی هاتوچۆبوون.منیش بەشێخ سەلمانم وت: مناڵەکانت تووشی رووداوی هاتوچۆبوون و ئەبێت بگەرێینەوە.ئەویش وتی خواحەزکات هەرئێستا دەگەرێینەوە ئەگەر فرۆکە هەبێت بۆ سعودیە.

ئنجا شێخ تەلەفونی کرد بۆ بەرائی کوری و ئەویش هەموو هەواڵەکەی دایە کە دایك و برایەکیو خوشکەزایەکی دایکی تووشی رووداوی هاتووچۆبوون و کۆچی دواییان کردووە. یەکسەر وتی: انا لله وانا الیه راجعون. انا لله وانا الیه

راجعون. کەتەواوبوو وتم: چی بووە: وتی:هاوسەرم وهیشامی کوڕم کۆچی دواییان کردووە.وتم: ئینشەلا وانیە و من تەلەفونیان بۆکردم وایان نەووت.

من هەردەمویست بلێم وانیەوئەویش هەرسوپاسی خوای دەکردو انا لله واناالیه راجعون ی دەووتەوە.لەیەکەم صدمەدا زۆرخۆراگربوو، بەڕاستی جەرگ سوتان زەحمەتە، ئالەوێدا بڕوا بەقەزاو قەدەردەرئەکەوێت.

خۆمان کۆکردەوە چوین بۆ فرۆکەخانەو حیجزمان کرد بۆگەشتێك کە دوای سێ سەعات ئەچووبۆ ( ریاض ). نەمئەزانی چی بلێم وچۆن موسیبەتەکەی لەسەرسوك بکەم، هەردوعام دەکرد هەواڵەکە وانەبێت.

بەوحاڵەشەوە شێخ سەلمان وتی: من هەردەبێ بگەڕێمەوە بەلام پێم باشە تۆ بچیت بەلای کۆنفرانسەکەوە، ئاخر ئەو موسڵمانانە چاوەڕێن..سبحان الله بەو وەزعەشەوە هەردڵی لای بانگەواز بوو.

لەفڕۆکەخانە کەسانێکی زۆر کەدەیان ناسی دەهاتن بەگەرمی سلاویان لێدەکردو وێنەیان لەگەڵ دەگرت ئەویش بەجەرگی سوتاوەوە ئەوەستا لەگەڵیان وزەردەخەنەی لەسەرلێوبوو بۆیان.

کاتێك چووینە هۆڵی چاوەڕوانی گەنجێك هات سلاوی لێکرد وشێخیش بەگەرمی وەلامی دایەوە، گەنجەکەوتی: یاشێخ باوکم تازە لەئەڵمانیا هاتۆتەوەو تۆی خۆش دەوێت، حەزدەکەم سلاوێکی لێبکەیت، شێخ چوو بۆلای باوکی کوڕەکەو زۆر موجامەلەی کردو پێی وت: ئەمجارە ئەوگۆچانەت بەدەستەوەیە، پشت بەخوا جارێکی تر کەبینیمانیتەوە گەنج بوویتەوەو گۆچانەکەت فڕێ دابێت. دواتر کوڕەکە لەواتس ئەپەوە هەواڵەکەی زانیبوو هات سەرخۆشی لێکرد و زۆر داوای لێبووردنی کرد.

کەچووینە فڕۆکەوە شێخ بەدانیشتنەوە نوێژی دەکرد تاسەبوری بۆبێت، من جاربەجاروەنەوزم ئەداو ئەو هەربەردەوام بوو لەنوێژو زیکرەکانیدا.

بەرەبەیان گەیشتینە (ریاض) دۆستان پێشوازیان لێکردین، یەکسەرچووینە خەستەخانە، عبدالرحمانی کوڕی بێهۆشی تەواوبوو،کوڕەزاکەشی نووستبوو دەستی هێنا بەسەریاو خەبەری بۆوەو شێخ باوەشی پیاکرد.

ئنجا پاش عەسر هیشام کفن کرابوو شێخیان بانگ کرد تابۆدواجار خواحافیزی لێبکات، کە شێخ کفنەکەی لەسەرلادا فرمێسك لەچاوی هات وسۆزوبەزەیی بۆجولا.

ئنجا بووە ئیمام تا نوێژی مردوو بکات لەسەر تەرمی هاوسەرەکەی و خوشکەزای هاوسەری وهیشامی کوڕی.

پاشان لەسەرقەبران پاش ناشتنیان ئامۆژگاری ئامادەبوانی کردودوعای بۆکۆچکردوان کرد، بەڕاستی کەمن لەهەمووکەس زیاتر لێی نزیك بووم لەوموسیبەتەدا ئارامی و ئیمانی پتەوی‌شێخ زۆر کاری تێکردم.خوالەوانیش و لەئێمەش خۆشبێت.ئامین..



## کوردێکی تێکۆشەر:

بۆ هەموو هەوڵ وکۆشش و ماندووبوون و خەبات کردنێك مرۆڤ ئەبێت ئیمانی بە قەزیەکەی بێت کە هەوڵی بۆ ئەدات، بڕوادارانیش پابەندی فەرمانی خوان و مەبەستیان ڕەزامەندی ئەوە وسەروماڵیان فرۆشتووە بەخوا،جا کاتێك خوای گەورە هانیان ئەدات جەخت ئەکاتە سەرئەوەی کەخوا ئەیان بینێ و ئەبیستێ و ئاگاداریانە ﴿ **وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ** ﴾ **البقرة: ٢٤٤**.

جیهادکردن لوتکەی دینداری یە وکوردیش وەکو باقی گەلان شەرەفی جیهادی دەستکەوتووە لە کۆن و نوێدا، ئەمەش نموونەیەکە:

ناپلیۆن پۆناپارت لە ساڵی (١٧٩٨ز) دا میسری داگیرکرد و کردیانە بنکەیەك بۆ ئیمپراتۆریەتی فەرەنسی لە ڕۆژهەڵاتدا، ئەوەی خراپ بوو بەرامبەر میسرییەکان کردیان، لە کوشتن و برین و تاڵان کردن. خەڵکی میسر کەوتنە شۆڕش کردن دژی ستەمکاران و سوپای عوسمانیش خۆی ئامادەکرد بۆ دەرکردنی داگیرکەران، لەم سەرو بەندەدا، پیاوێکی خواناسی بۆخوا سوڵحاوی تێکۆشەر کە لە شاری ئاکرێ دەژیا، خەو بە خۆشەویستەوە دەبینێت درووەی خوای لەسەر کە مژدەی دەداتێ ئەگەر بچێ بۆ یارمەتی سوپای موسوڵمانان لە میسر خوای گەورە دوای سێ ڕۆژ لە جەنگ کردن سەریان دەخات بەسەر فەرەنسییەکاندا.

ئەم پیاوە ناوی (جبرائیل کوڕی حسێنی زێباری) بوو، باپیرانی کاتی خۆی تێکۆشەر بوون و لەگەڵ (صلاح الدین) دا جیهادیان کردووە تەنانەت خوزە و زرێپۆشی جەنگی باپیرانی تا ئێستا ماوە و لەناو مەزارگەی قەبرەکەی (جبرائیل) دا دانراوە و پارێزراوە لە ئاکرێ.

جبرائيل بۆ بەیانی ئەم خەوە بۆ خەڵکی باس دەکات و بیست لاوی ئاکرێ واز لە کار و پیشەیان دێنن و کەس و کاریان لەبەر خوا بەجێ دەهێڵن و دەچن بەرەو شام و لەوێوە بۆ فەلەستین و پاشان بۆلای سوپای موسوڵمانان لە میسر، کە گەیشتنە ئەوێ، جبرائيل چووە لای سەرکردەی سوپای عوسمانییەکان و مژدەکەی خۆشەویستی (ﷺ) پێگەیاندن.

جبرائيل و هاوەڵانی شانبەشانی سوپای موسوڵمانان جەنگان دژی سوپای فەڕەنسی و، مژدەکەی پێغەمبەر (ﷺ) هاتە دی و دوای سێ ڕۆژ فەڕەنسییەکان شکان و سەرکردەی سوپای فەڕەنسی (مینو) قایل بوو بە خۆ بەدەستەوەدان، پاشان ئەسکەندەریەییان لە تشرینی یەکەمی ساڵی (١٨٠١) دا چۆڵ کرد و بەمەش میسر گەڕایەوە باوەشی ئوممەتی ئیسلامی. پاش ئەم ڕووداوە دەنگوباسی (جبرائيل) بڵاو بۆوە و خەڵکی نازناوی (بیر) یان لێ نا کە مانای (وەلی) خوایە و ناوەکەشیان بۆ ئاسانی لەسەر زمان کورت کردەوە و لەجیاتی (جبرائيل) ئەیان وت (جب)، واتە بە (بیر جب) بانگیان دەکرد.

ناوبراو خۆی و هاوەڵانی لە کانونی یەکەمی ساڵی (١٨٠١) دا گەڕانەوە ئاکرێ و خەڵکی ناوچەکە پێشوازییەکی گەرمیان لێکردن ولەلایەن عوسمانییەکانیشەوە لە (خەراجی موسڵ) موچەی خانەنشینییان بۆ بڕایەوە. لە ساڵی (١٨٠٣) دا (موراد پاشای کوڕی ئیسماعیل پاشا) کە ئەمیری بادینان بوو داوای لێکرد کە بچێت بۆ هاوکاری والی بەغدای ئەو کاتە دژی چەند هۆزێك کە چەتەگەرییان دەکرد و ڕێیان لە خەڵکی دەگرت و ئاسایشیان تێك دەدا، ناوبراو خۆی و نزیکی شەش سەد کەس چوون بۆ هاوکاریی والی بەغداد و لەم جەنگەشدا تەنها دوانزە کەسیان لێ شەهید بوو.

جا توانای (بیر جب) بۆ کۆکردنەوەی ئەو ژمارە زۆرە بێ بەرامبەر بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خەڵکی خۆشیان دەویست و متمانەی تەواویان پێی بوو. شایانی باسە کە (جبرائیل) کۆچی دوایی کرد هەر لەماڵەکەی خۆیدا لە ئاکرێ ناشتیان و تا ئێستاش ماڵەکەی وەك مەزارگەیەك خەڵکی سەردانی دەکەن، کە لە دووژووری بچوك پێکهاتووە. ل٣١٩، دراسات وثائقية في تأريخ الكرد الحديث وحضارتهم، د.عماد عبد السلام.



(وێنەی زرێی باپیرانی جبرائیل لە مەزارگەکەی)

***

هیدایەتی دڵەکان لای خوایە وبەدەستی خوایە: ﴿ وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَنْ فِي الْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا أَفَأَنْتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ (٩٩) وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَنْ تُؤْمِنَ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ وَيَجْعَلُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ (١٠٠)﴾ یونس. واتە: ئەگەر پەروەردگاری تۆ بیەوێ، خەڵکی سەرزەمین گشتی ئیمان دێنێ (بەڵام ئیمانی قەهری و زۆری، ئیختیار لە خەڵك دەستێنێ. خودا بەشەری ئازاد خوڵقاندووەو عەقڵی پێداوەو بە وەسیلەی پێغەمبەران یاساکانی پێراگەیاندووە، تا لە سۆنگەی ئاوەزی خۆی و ڕێنوێنیەکانی ئاسمانی، بەختەوەری دنیا و ئاخیرەت بێ. ئەی پێغەمبەر ئایا تۆ خەڵکی بە زۆر ناچار بە ئیمانهێنان دەکەی؟ (ئیمانی بە ناچاری ڕواڵەتیە و کەڵکی نییە).

هیچ کەس ناتوانێ ئیمان بێنێ مەگەر هەوڵی بۆ بداو خوداش ئیزن بدا. خودا عەزاب دەگەیەنێ بە کەسانێك (لە عەقڵ بەهرە وەرناگرن و بیرناکەنەوەو) نەزانن و تێناگەن.

## بوار بۆ ڕەخساندن:

خوای گەورە بوار بۆهەمووکەس دەڕەخسێنێت بۆ ئەوەی ئیمان بهێنێت و بیانووی ناهێڵێت، ئەمە بێجگە لەوەی ئایەتەکانی خواو بەڵگەونیشانەکانی زۆرن لە بوونەوەرو نەفسی مرۆڤیشدا.ئەمەش نموونەی هیدایەتێکی سەیرە.

سێر ماری تریز حەننا ٢٨ ساڵ ڕاهیبە بوو لەدێرو قوتابخانەی فرنشسیکان و خەستەخانەی ئیتالی لەمیسر، ناوبراو باسی سەرگوزشتەی خۆی دەکات ودەڵێت: ئەوکاتەی کە شاحوسەینی ئەردەن لەئەیلولی ڕەشی ساڵی ١٩٧٠ فەلەستینیەکانی بەدڕندەترین شێوە کوشت، من لەگەڵ خاچی سووری نێودەوڵەتی بە ئیسعاف

ئەمانویست فریایان بکەوین، بەلاّم بەجۆرێك پارچە پارچە بووبوون نەمانئەتوانی هەلّیان بگرینەوە، ئەم دیمەنە پڕ کارەساتە مەعیدەی تێکدام، وەزعم زۆر خراپ بوو گەیاندمیانە لەندەن، پزیشکەکان وتیان ئەبێت مەعیدەی لابرێت و پاش ئەو نەشتەرگەریەش لە چەند رۆژێکدا ئەمرێت.



وتم: کەهەر بمرم بالەمیسر لەخەستەخانەی ئیتالّی لەئەسکەندەریە بۆم بکەن،هاتمەوە میسرو نەشتەرگەریەکەم بۆکراو کەس بەتەمای ژیانم نەبوو، وامن ئەو هەموو سۆندەو وایەرەی عەمەلیاتم پێوەیە وتازەعەمەلیات کراوم، کەسێك دەستی خستە سەرشانم نەخۆشی وئازارم نەما، وتم: دکتۆر، وتی:من محمدی نێراوی خوام،نەمزانی چی بلّێم،هیچم لەبارەی ئیسلامەوە نەئەزانی، ئێمە خێزانێکی مەسیحی بووین، باباشنۆدەی قیبتیەکان خالّمەومامیشم میلادحەنایە کە ئەوکاتەوەزیر بوو.

کاتێکم زانی بەدەستی موبارەکی ئەو سۆندەو وایەرانەی پێمەوەبوو لێیکردنەوەو دەستی گرتم و هەستام ومەترێك زیاتر هەنگاوم نا، دەرگا بەرزەکەی

کەعبەم بینی فەرمووی دەستت بێنە هەروەك بفڕم چوومە ناوکەعبەوە کەهەموو خەیراتی خوای تیابوو، دەستم لەسەرچاوم دانابوو، فەرمووی دەستت لابە، وتم: لەبەرنووررو رووناکی ناتوانم!

فەرمووی: دەستت لابە مەترسە!دەستم لابرد نووری درەوشاوەی خۆشەویستم بینی، ئنجا مانای (یانور النبی) تێگەیشتم کەخەڵکانێك لای ئێمە دەیلێن.ئنجا فەرمووی دانیشە، جامێ ئاوی دامێ بیخۆمەوە وفەرمووی ئەوە زەمزەمە.

پاشان فەرمووی ئەوەی دەیلێم بیلێرەوە، فاتیحەو موعەویزەتەینی فەرموو لەدوایەوە وتمەوە هەروەك ئەوەی هەرلەزووەوە لەبەرم کردبێت، تومەز دەنگم بەرزبووەو دکتۆرەکان هاتنە سەرم بینیان دانیشتووم وهیچی عەمەلیاتم پێوەنەماوە، زۆردڵیان پێم خۆش بوو، راهیباتەکان هاتن کەمنیان بینی موسڵمانبوون، رۆژنامەنووسمان لێکۆبوونەوە، سەرۆکی بەشەکە دەرگای لەسەرداخستم وتی: وابڕوات هەموو خەستەخانەکە موسڵمان ئەبێت.

دووەم رۆژیش خۆشەویستم بینیەوە فەرمووی:قورئانەکە تەواوبکەو زەمزەمی دامێ،کارمەندە مەسیحیەکانی ئەو رۆژەش موسڵمان بوون.

رۆژی سێیەمیش بینیمەوە فەرمووی ئێرە بەجێبهێڵە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا بەم وەزعەوەوبە جلی عەمەلیاتەوەچۆن دەرچم؟

ئەوەم بیرنەچێت کەخۆشەویست دەستی گرتم ئەو خاچەی لەسەر مەچەکم بوو کەخاڵم بۆی کوتابووم بەمناڵی نەما، جائەوەش کەراماتێك بوو بۆمن و ئەوانەی کە ئەوەیان ئەبینی موسڵمان ئەبوون و ئەیانزانی راست ئەکەم.کەخۆشەویست فەرمووی دەرچۆ کارگوزارێکی ئافرەت هات ژوورەکە پاك بکاتەوە، وتم: یارمەتیم بدە دەرچم، وتی: نانبڕاوم مەکە کۆشێ هەتیو بەخێو ئەکەم، وتم: مەترسە

پێمبزانن ناوت نالێم، دڵی نەرم بوو جلی خۆی دامێ و کەدەرچووم لەدەرگاکە نەیانناسیمەوە.



(وێنەی مامم میلاد حەننا)

چووم بۆ ئەزهەر شێخ شەعراوی وشێخ غەزالی وشێخ جادالحق م بینی زۆر دڵیان پێم خۆش بوو، دوایی بردیانم بۆئاسایش، چونکە بلاّوکرابۆوە گوایە فڕێنراوم،کەچووم وتم: ئەوەتا کەس نەیفڕاندووم وخۆم هاتووم.بەڕێوەبەری ئاسایش پەیوەندی کرد بەوەزیرەوە وتی: قوربان وا راهیبەکە لێرەیەو نەفڕێنراوە.

پاشان وەزیر هات کەبەسەرهاتەکەم بۆباس کردو بینی خاچەکە لەسەر مەچەکم نەماوە دەستی ماچ کردم.ئنجاوتیان: هەندێ ئیجرائاتی رۆتینی قورس هەیە ئەبێت بیکەین،وتم:باکم نیە هەرچی بێت ئەیخەمە ژێرپێمەوە، من خۆشەویستم بینیوە هیچم بەلاوە گرنگ نیە.

لەمیسر عادەت وایە هەر قیبتیەك موسڵمان بێت چەند قەشەی بۆدێنن تا گفتوگۆی لەگەڵ بکات، چەند قەشەیان هێنا بۆ گفتوگۆ دوانزەیان موسڵمان بوون، کەبینیان نەخۆشێك مەعیدەی لابراوەو پاش سێ ڕۆژ دانیشتووە نەبای دیوەو نەباران.ئنجا چەند مەترانیان هێنا ئەوانیش هەشتیان موسڵمانبوون وبوونە بانگخواز وەك قەشە ئیبراهیم عبدالسید.




ئنجا باباشنۆدەی خاڵم هات و وتی:ئەمە خوشکەزامەو لەخۆیەوە نابێ هیچ بڵێت. ئنجاوتی: تۆ سەرت کردین بەقوڕا.

وتم: نا من شەرەفمەندم کردون بەئیسلام.

وتی: تۆ ئەڵێی چی؟کەوتە جنێودان.

وتم:هەرچی بڵێی سوودی نیە، تۆ لەسەر مەچەکم خاچت بۆدروست نەکردم؟ کوا ئەو خاچە بۆکوێ چوو؟ وتی: دەمت داخە قسە نەکەی،شەقازللەیەکی لێدام

دوودانم شکاو برۆم برینداربوو پڕ بوو لەخوێن.. لەوکاتەدا وەزیرو بەڕێوەبەری ئاسایش لە شاشەیەکەوە سەیریان ئەکرد وهیچیان بۆنەکرا، ئنجا کەخاڵم رۆی فریاکەوتنی خێرایان بۆکردم و ئاهەنگێکیان بۆ موسڵمانبوونم گێڕا ویستیان ناوم بنێن خەدیجە، بەڵام شێخ شەعراوی وتی: ناوی بنێن ئیجلال ئیتر ناویان گۆڕیم بۆ ئیجلال عەلی.



وەزیر بە بەڕێوەبەری ئاسایشی وت کە پاسەوانم بۆدابنێ، کەچی بیری چوو، هەرلە بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش دوورکەوتمەوە فڕێنرام و سزاوئازارێکیان دام کەئەوەتا ئاسەوارەکانی ماوە، قۆڵیان شکانم ئەوەتە پاش گرتنەوە قۆڵێکم کورترە لەوی تر، ئاسنی گەرمیان ئەخستە سەرچاوم تاکوێربم، لەشوێنی عەمەلیاتەکیان ئەدا تا تووشی موزاعەفات ببم و ئەوەبوو سپڵو زراویشمیان لەکارخست و دەرهێنرا،ئێستا من بێ گەدەو بێ سپڵ وزراو لەسەر شلەمەنی ئەژیم سوپاس بۆخوا.

زۆر سوپاسی پاپا ئەکەم کەبۆ ترساندنی قیبتیەکان وێنەی سزادانی منی بڵاودەکردەوە لەکەنیسەکان، ئەوەش وای دەکرد هەندێ لەو قیبتیانە بێنەلام پرسیاربکەن تاراستیان بۆدەربکەوێت، زۆریان سوپاس بۆ خوا موسڵمانبوون.

رۆژێك كۆمەڵێك رۆژنامەنووسم لابوو لەدەرەوە هاتبوون قسەم بۆدەكردن،ئافرەتێكی مونەقەبە هات و وتی: من موسڵمانبووم وجیّ و رێم نیەو براكەم لێیداوم ودەری كردوم هاتووم لای تۆ بمێنمەوە، وتم: ئاخر قەدەغەكراوە نابێت كەس دوای ١٢ یشەو لام بمێنێتەوە،ناچار رازی بووم بمێنێتەوەوخواردنم بۆئامادەكرد.

كاتێكم زانی ئەفسەرێكی ئاسایش هات و جانتاكەی پێكردەوە دەبەیەكی تیابوو، وتی: ئەوە چیە، وتی: ئاوە،وتی: ئەتوانی بیخۆیتەوە؟ دەستی كرد بەگریان و ئیعتیرافی كرد كە ناردویانە بە پەنجا هەزار جونەیە بمكوژێت وئەوەش ئاو نەبوو تێزاب بوو، دواتر پشكنینیان كرد تلیاكیان دۆزیەوە كە لەپشت تەوالێتەوە بەدزیەوە دای نابوو تا تووشم بكات.

شافەیسەڵ بانگهێشتی كردم بۆحەج و سیّ تابلۆی دامیّ كەوێنەی( زەمزەم و ئارامگەی پێغەمبەرو عەمامەكەی خۆشەویست) بوون كە ئەوەتا هەڵمواسیون.



## ئیغرائات:

بازرگانێکی گەورەی قیبتی ویستی بەپارە ئیغرام بکات، گوایە ملیۆن ونیوێك جونەیهم بداتێ و برۆم بۆ ئەمەریکا تائەوەندە خەڵك لەسەردەستما موسڵمان نەبێت، منیش بەهیچ جۆرێك قایل نەبووم، سوپاس بۆخوا نزیکەی دوانزە هەزارکەس لەسەردەستما موسڵمانبوون.

تەنانەت تەنتاوی شێخی ئەزهەروتی: برۆ ئیسلام پەکی لەتۆنەکەتووە، وتم:پەکی کەوتووەو ئەولاتریش، تۆلای خۆت دانیشتووی خەڵك بانگ بکەی بۆئیسلام، هەرکەس لەکورسیەکەی خۆی ئەترسێت،من سوپاس بۆخوا باکی هیچم نیەو ناشرۆم!

## شۆڕەسواری قورئان:

دکتۆر ئەیمەن سوەید ساڵی ١٩٥٥ لەدیمەشق لەدایکبووەو باوکی ژمێریار بووەو باپیری (محمد ئەیمەن) زانایەکی ناوداری دیمەشق بووەوزۆرخەمی ئەخوارد لەوەی کەهەمووقورئانی لەبەرنەبوو، ئەیووت خۆزگەهەرچی زانستم هەیە لێم بسەنن و قورئانم لەجیاتی لەبەربوایە. لەوەئەچێت دوعاو حەزی ئەوبێت کە کوڕەزاکەی ئاوادەرچوو.

دکتۆر ئەڵێت: بیرم نایە لەکەیەوە نوێژدەکەم، لەسێی سەرەتاییشەوە رۆژووم گرتووەو رایان ئەهێناین بۆ رۆژوو بە تەدریج، سەرەتا تانیوەڕۆ وئنجا نیوەڕۆ تا ئێوارە بەرۆژوو ئەبووین، ئەوکاتەی کە بۆیەکەم جار بەرۆژووبووم، دایکم بەکۆڵ گێڕامی بەژوورەکەدا، کەئەمەش عادەتە لای ئێمە، منیش بۆ منداڵەکانم هەروام وکەبۆیەکەم جاربەرۆژووبوون لەخۆشیا بەکۆڵ بەژوورەکەماندا گێڕاومن.

لەشەشی سەرەتایی مامۆستایەکی بەناوی نزار طیان ئەیبینێت کەلەبەردەم نەشرەیەکدا وەستاوە کەبەدیواری قوتابخانەدا هەڵواسراوەو دیقەتی نووسینێك ئەدات کەباس لەشۆڕەسواری قورئان دەکات.. زۆر هانی ئەدات لەسەر قورئان لەبەرکردن، ئەویش دەڵێت هەموو قورئانم بۆلەبەرکرێت (قل یا أیها الکافرون)م بۆلەبەرناکریت، مامۆستا پێی ئەڵێت: خەمت نەبێت ئەویش وهەموو قورئانیش لەبەردەکەیت، پاشان ئەیبات بۆنوێژی تەراویحی شێخ حسێن خەتاب، کە زۆر بەجوانی قورئانی ئەخوێند.دواتر بردی بۆلای شێخی مورەبی عبدالکریمی ریفاعی وئەویش زۆرگرنگی پێداو هەمیشە پێی دەوت: سەیدئەیمەن. پاشان لای شێخ محی الدین ی کوردی خوێندی..




ناوبراو تا پۆلی ٣ی کۆلێژی ئەندازیاری کارەبای خوێندو وازی لێهێناو چووە زانکۆی ئەزهەرو لیسانسی لەزمانی عەرەبیدا هێناو ئنجا ماستەرو دکتۆرای لە قیرائاتدا هێنا لەمەککە و پاشان لەئەزهەریش دکتۆرایەکی تری لەهەمان بواردا هێنا.

دکتۆر ئەڵێت هیچ وانەیەك نەبووە حەزم لێی نەبێت و هەمیشە لەیەکەمەکان بووم وخۆم فێری زمانی فەرەنسیش کردو ساڵانە ۳۰تا ٤٠ رۆژ ئەچم بۆ فەرەنساو وانەی تەجوید ئەڵێمەوەو کەسانێکی باشمان پێگەیاند وئێستاش بوخاری بە وانە ئەڵێمەوە رۆژی هەشت سەعات و هەردوو سەعاتێك پشوو وەردەگرین و بەدەرۆژ نیوەی دەخوێنین و بەدەرۆژی تریش تەواوی دەکەین. جا دکتۆر ئەیمەن کەئیجازەی دە قیرائەتەکەی هەیە شایانی ئەوەیە پێی بووترێت شۆرەسواری قورئان و کتێبی تەجویدی مصوری دانا کە بەهۆیەوە خەڵاتی ریزنانی وەرگرت لەوڵاتی سعودیە.

## ئەهلی قورئان:

ئەوانەی ئەهلی قورئانن ئەهلی تایبەتی خوان، ژیان لەسایەی قورئاندا نیعمەتێکە مەگەر سەید قوتبی رەحمەتی بتوانێت شتێکی لێ باس بکات، کەئەویش پاش زیاترلە ٤٠ ساڵ لەبواری نووسین و ئەدەبیاتدا ئەڵێ ئەوەی لەناخمدایە لەبارەی قورئانەوە ناتوانم بەتەواوی دەری ببڕم و تۆماری بکەم..

دکتۆر ئەیمەن سوەید ئەڵێ: بەخوا ئەوەی ڕێز لەقورئان بگرێت خوا رێزی لێدەگرێت لەدونیادا وپێش ئاخیرەت خوا پاداشتی ئەداتەوە،ئەمەم بە پیاوێکی میسری وت کەخەمی کچەکانی بوو فێری قورئانیان بکات، دوای ماوەیەك تەلەفونی بۆکردم وتی: یاشێخ قسەکەت هاتەدی، مامێکم مرد وتەنها باوکم میراتگری بوو، بینایەکی چوارقاتی لەپاش بەجێما، باوکم قاتێکی دا بەمن تیادانیشم و قاتێکیشی دامێ بیکەم بەمەرکەزی لەبەرکردنی قورئان..

دکتۆر ئەڵێت: دوعام ئەکردو ئەمووت خوایە بمخەرە سیسیلەی سەندی خوێندنەوەی قورئانەوەو دوا کەسیش نەبم و منیش بیگەیەنم بەکەسانی تر،خواش

دوعاکەی گیراکردم..بەڕاستی شەرەفێکی گەورەیە کەسەنەدەکەی ۲۸ پشتە تادەگاتە زەیدی کوڕی سابیت، کەئەویش لەدەمی پێغەمبەری خوای وەرگرتووەو پێغەمبەریش دروودی خوای لەسەر لەجوبرائیلەوە وئەویش لە پەروەردگارەوە وەری گرتووە. شێخ عبدالعزیز عیون السود ئیجازەی داوە بەدکتۆر ئەیمەن کە ۲۸ هەمین کەسە لەو سیلسیلەیەداو دکتۆر ئەیمەنیش بەردەوامە کە ئیجازەی داوە بۆنموونە بە ئەبوبەکری شاطری ودکتۆر عبداللە بصفرودەیان کەسی تر..

## سێ دوعای کاک ئەحمەد!

لەگەڵ برای بەڕێزم کاك لەۆن شەوی بیسستی ڕەمەزانی ۲۰۱۷ سەردانی کاك شێخ مەحمودی کوڕی شێخ کاوەمان کرد وکتێبی مەکتوباتی کاك ئەحمەدی شێخ بەرگی پێنجەممان بۆ برد بەدیاری، لەمیانەی گفتوگۆدا بەڕێزیان وتی: شێخ مارف و شێخ سەعید وشێخ مستەفا کە هەرسێکیان کوڕی شێخ محمدی بچوك بوون کەئەویش تاقانەی کاك ئەحمەدی شێخ بوو وەهەرزوو وەفاتی کرد، ڕۆژێك دێنە خزمەت باپیریان و داوای دوعای خێری لێدەکەن، شێخ سەعید ئەڵێت:دوعام بۆبکە شەهیدبم، ئەویش زۆری پێخۆش دەبێت کە ئەو داوایە دەکات و دەڵێت:خوای گەورە شەهیدی بکات بەخەڵات بۆت، ئەڵێت حەزدەکەم دوعاکەشم بۆبنوسیت، دڵی ناشکێنێ و بۆی ئەنوسێت.شێخ مستەفاش ئەڵێت:دوعام بۆبکە بچم بۆحەج و لەوێ بمرم ونەگەڕێمەوە، دوعای بۆدەکات و ئەمیش داوادەکات بۆی بنوسێت، شێخ مارفیش تازەپێدەگات ئەڵێت:دوعام بۆبکە دەوڵەمەندبم، ئەویش پێی ناخۆش ئەبێت و ئەڵێت: ئەوە غەزەبە.

پاش چەند ساڵ بەیەکەوە هەرسێکیان ئەچن بۆحەج و پاش تەواوبوونی حەج کەلەسەرگەڕانەوە دەبن، شێخ مستەفا بێتاقەت ئەبێت لەوەی وادەگەڕێنەوەو

بەئاواتی خۆی نەگەیشت، بۆ بەیانی کەخەبەری دەکەنەوە لەجێگاکەیدا گیانی سپاردووە.کەجل وکەلوپەلەکانی دێننەوەو سەیرئەکەن دوعاکەی کاك ئەحمەدی تیایە کە کاتی خۆی دوعای بۆکردبوو.

شێخ سەعیدیش لەموسڵ شەهیدکراو بەئاواتی خۆی گەیشت و کەجل وبەرگ وکەلوپەلیان هێنایەوە ئەمیش دوعاکەی کاك ئەحمەدی باپیری تیابوو کە دوعای شەهیدی بۆکردبوو. شێخ مارفیش هەرچی ئەکردو ئەکۆشا ئەو دەوڵەمەندە نەئەبوو کەحەزی پێئەکرد وهەمیشە ئەیووت:باپیرم دوعای دەوڵەمەندی بۆنەکردم و فەرمووی ئەوە غەزەبە.



***

## پرۆفیسۆر خورشید ئەحمەد:

ناوبراو کەزانایەکی بواری سیاسی و ئابوریە لە وتارێکدا یادەوەری خۆی باس دەکات لەبارەی پێشەوا مەودودیەوە ودەڵێت:باوکم هەرچەند بازرگانی دەکرد بەلاّم کەسێکی رۆشنبیرو دیاری شاری دلهی بوو،لەساڵی ۱۹۳۸ لەتەمەنی حەوت ساڵیمدا کە مەودودی هاتە ماڵمان سەلامم لێکردولەوساوە ئەیناسم، لەساڵی ۱۹٤۹ چوومە کەراتشی وکتێبەکانی شێخ مەودودیم ئەخوێندەوە وئامادەی وانەکانی دەبووم، کەباسی باوکمم بۆکرد وناسیمیەوە زۆر زیاتر گرنگی پێدام، ساڵی ۱۹۵۰ بوومە ئەندامی جەماعەی ئیسلامی وباوکم وتی: ئەگەرخۆشم نەمتوانیبێت ببمە ئەندام وا کوڕەکەم پێشکەش کردن.

مەودودی چاوی لەدەستی کەس و لەکۆکردنەوەی دونیا نەبوو، بۆ خواو بانگەوازەکەی ئەژیاو هاوەڵێکی ویستی سپلێتێکی بەدیاری بداتێ قەبولّی نەکرد، پاش ماوەیەکی زۆرو هەوڵێکی زۆر بەوە وەری گرت کەهاوەڵەکەی وتی: تۆ تەفسیری قورئان دەکەیت و منیش حەزدەکەم بەو دیاریە بچوکە بەشداربم لەخزمەتی قورئانداو رەزامەندی خوا بەدەست بهێنم.

شێخ مەودودی زۆرگرنگی بەکات ئەداوزۆر حەزی ئەکرد پێش مەوعید ئامادەبێت، زۆر مورەتەب بوو لەژیانیا جا لەماڵەوە بوبێت یان لەبەندیخانەدا، زۆر ئازاری دەچەشت بەدەست بەردی گورچیلەوە، کاتێك ساڵی ۱۹٤۸ بەندکرا زۆر پاڕایەوە لەخوا کە ئەو ئازارەی لەسەر هەڵگرێت تا داوای هیچ ئاسانکاریەك نەکات لە بەرپرسانی بەندیخانە، سبحان الله بۆماوەی زیاتر لەبیست ساڵ ئازاری گورچیلەی نەما، ساڵی ۱۹٦۸ هەڵیدایەوەو چوو لە لەندەن چوارمانگ مایەوە تانەشتەرگەریان بۆکرد.کەئەمەش تەوفیقی خوابوو بۆ ئەو بانگخوازەی سەروماڵی نەزرکردبوو بۆگەیاندنی پەیامەکەی خوا.

(وێنەی پرۆفیسۆر خورشید لەکاتی وەرگرتنی خەلاتی مەلیك فەیسەڵ دا).



**خوایە هەقی کورد بسێنە:**

ڕۆژی هەینی ٢٠١٦/٥/١٣ لەمزگەوتی مێرگەپان بووم، وتاربێژەکەی نەهاتبوو، داوایان لەمن کرد وتاربدەم منیش هەرچەند سوپاس بۆخوا سەدان وتارم داوە بەلاّم یەکەم جار بوو لەهەینیدا وتاربدەم، سوپاس بۆخوا وتارێکی ئیمانیم پێشکەش کردن، دوای نوێژ چەند نوێژخوێنێك سەلام و دەستخۆشیان لێکردم وهەندێ بەسەرهاتیشیان بۆگێڕامەوە.

مامۆستا رزگار کە دوکانەکەی لەسەر شەقامی مەولەویە لەسلێمانی وتی: من هەلّەبجەیم و زۆر سەیری دادگاییەکەی سەدامم دەکرد، لەقەزیەی ئەنفالەکەدا پیاوێك هات وەك شایەت و وتی: من سەربازبووم ژنەکەم و هەشت منالّەکەم بێسەرو شوێن بوون، ئامرەکەم داواکارییەکی بۆنووسیم و گەیاندمە کۆشکی

کۆماری لەبەغدا و سەرۆك کۆمارم بینی و وتی: کەی ماڵ و مناڵەکەت دیارنەماون، وتم: فلاَنە کات، وتی: ئەوە ئەنفال کراون بەتەمایان مەبە!منیش وتم: گەورەم ئەنفال بۆموسلمانە یان کافر؟؟ ئەویش توڕەبوو کردمیە دەرەوە.پاشان وتی:خەوێکیشم بینی، حاکمەکە وتی: ئێمە کارمان بەخەونیە.

پاش ماوەیەك لە سلێمانی کابرایەك هاتەدوکانەکەم وتم: برا دەنگی تۆلام غەریب نیە!نازانم لەکوێ گوێم لێبووە؟ وتی:من ئەوەم کەشایەتیەکەم دا لە مەحکەمە! وتم: ئەو خەوە چی بوو کەنەیانهێشت بیگێڕیتەوە؟

وتی: پاش ئەوەی سەددام دەری کردم،زۆر بیتاقەت بووم و بەو خەم وخەفەتەوە گەڕامەوە سەربازگە، دەستنوێژم شت و زۆردوعام کرد کە خۆشەویستمان (درِوودی خوای لەسەربێت)ببینم وشەکوای حاڵی خۆمی لابکەم، شەو سەعات دوو خەبەرم بۆوەو نەمبینی، بۆیە دەستنوێژم شتەوەو نوێژم کرد ودوعام کرد بیبینم، کەنووستمەوە بەخزمەتی گەیشتم دەستم بەدەستی موبارەکیەوە بوو، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ماڵ مناڵم ماون؟ دەستی شل بوو، دەستی بەردام و فەرمووی: نەماون! ئنجا هەردوو دەستی بەرزکردەوەوسێ جار فەرمووی: خوایە هەقی کورد بستێنە!(جاوا خوا سەدامی بەودەردەبردوهەقی سەندین ئەی کەی هەقمان لەبەرپرسەکانی ئێستا دەسێنێت کە٢٧ ساڵە ئەوەی سەدام نەیکردبووکردیان؟؟)..

## دیبیق..

پیرەژنێکی ساڵمەندی فەرەنسی، کە ناوی ( ئۆجینی بلانشار ) بوو، بێکەس و بێدەرامەت، بەتەنها ئەژیا لە شوققەیەکدا لەناوەڕاستی پاریس، ئەم بێوەژنە فەرەنسییە لە ساڵی ( ١٩٦٥ ) دا تەمەنی ٩٠ ساڵی تێپەڕاندبوو..

پارێزەرێکی فێڵباز، بەنیەتێکی خراپەوە چوو بۆ لای ئەم پیرەژنە بێکەسە، وتی با رێکەوتنێکی نووسراو ئیمزا بکەین، هەموو مانگێك من ( ٢٥٠٠ فەرەنکی فەرەنسی ) ت ئەدەمێ، هەتا تۆ لەژیاندا بیت، بەو مەرجەی دوای مردنی تۆ، ئەم شوقەیەت ببێت بە موڵکی من....

پیرەژنەکەش، چونکە بێکەس و بێ داهات بوو، قبوڵی پێشنیاری محامییەکەی کرد..پارێزەرەکەش لەترسی ئەوەی پیرەژنەکە پەشیمان بێتەوە..گرێبەستەکەی هۆنییەوە و لەدادگا بەفەرمی مۆر و ئیمزای پێکرد..

پیرەژنی نەوەدساڵە هەموو مانگێك ٢٥٠٠ فەرەنکی فەرەنسی خۆی وەردەگرت..

محامیە چاوچنۆك و فێڵزانەکە وای دانابوو، ئەم پیرەژنە یەك ساڵ تا دوو ساڵی تر بژی، دواتر شوقەکەی لەناو جەرگەی پاریسدا بەپارەیەکی کەم ئەبێت بە موڵکی ئەم....

پیرەژنەکە دوای ئیمزاکردنی گرێبەستەکەی ( سی ساڵی ) تر ژیا و لەتەمەنی ١٢٢ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد...

ئۆجینی بلانشار، بەردەوام مانگانەی خۆی وەردەگرت...ئێ گرێبەستەو ئیمزا کراوە..

محامییەکە، بەچەند قات پارەی شوقەکەی دا بەو پیرەژنە.. خۆی زووتر مرد و پارەکانیشی زایە بوو، خۆیشی هیچی دەستنەکەوت..

خوا ویستی وابوو، ژیانێکی ئاسان بۆ پیرەژنێکی لاوازی بێ کەسی بێ داهات دابین بکات هەتامردن...

ئەوەی بەتەمایە بەفێڵ ولەسایەی یاسا ومۆروئیمزای گریەستی فیڵاوی تەماع بکاتە ماڵی فەقیر و بێکەسان، ئەبێت هەرهەناسە برِکێی بێت تا مردن..چونکە تێر بوون لەم دونیایەدا نییە، بەتایبەتی بۆ حەرامخۆران..

ئیتر وایە شوققە و فێلا و هێن و مێز و گریبەستی فیڵاوی، دیق کردنی لەدوایە....دیییق..

تـــــــاهـــــــــا سۆڵەیی/دارولمولکی بابان...٧ ی سێپتەمبەری ٢٠١٥

## دەمودەست جەزای خۆی وەرگرت!!

شەوی ٢٩ی رەمەزانی ٢٠١٨ سەردانی مامۆستا موسای بیارەیم کردو بەرێزی وتی: لەزەمانی حکومەتی بەعسدا لە شارۆچکەیەکی نزیك سلێمانی خەڵکی بەرمیل دائەنێن بۆوەرگرتنی نەوت، کابرایەکی پیاوکوژ دێت ودەست ئەخاتە سەر بەرمیلی پیرەمێردێکی داماوو ئەڵێت: ئەمە بەرمیلی منە، ئەویش ئەڵێت: بەرمیلی تۆی چی هی منەو لەبەیانیەوە بەدیاریەوە وەستاوم..خۆی توورِە ئەکات وئەڵێت: بۆمن درۆ ئەکەم وەڵا ئەتکوژم، خەڵك ئەکەونە بەینەوەو ناوبژی ئەکەن و کابرای داماویش ئەڵێ بابە بۆخۆت و لەکۆڵم بەرەوە، ئەو هەرخۆی رائەپسکێنێ و ئەڵێ ئەتکوژم، کەسێك قورئانێك دێنێ و ئەڵێ بیکە بۆخاتری ئەم قورئانە وازی لێ بێنە شەقێك لەدەستی کەسەکە هەڵ ئەدات!!

لەم کاتەشدا کورِەکەی باوەشی پیائەکا وهەوڵ ئەدات باوکی دووربخاتەوە و پیاوە پیرەکە نەکوژێت، بەقەدەری خوا پەنجەی ئەکەوێتە سەر پەلەپیتکەی کلاشینکۆفەکەو سی فیشەك سەری باوکی ئەبات بەئاسمانا..خوا دەمودەست کردی بە پەندی زەمانەو هەر لەدونیادا جەزای خۆی وەرگرت و قیامەتیش بابمێنێت وسزای نەبراوە چاوەرێیەتی..

## لەناوچەوانی نووسرابوو:

شەوی ٢٨ی رەمەزانی٢٠١٨ پاش ئەوەی لەمزگەوتی موفتی سەعات ١٢ وتارم دا مامۆستا لوقمان کەلە بیست وپێنج ساڵ لەمەوبەرەوە کە لەتەوێڵە وتارخوێن و ئیمام بوو ئەیناسم، یادگاریەکی خێزانی رەحمەتیمی باس کردو وتی: ساڵی ١٩٩٣ رەحمەتی هاتبوو بۆ خورماڵ کەلەوێوە بێت بۆتەوێڵە بۆماڵی ئێمە وئێوارەی بەسەردا دێت و ئوتومبیل نابێت بیهێنێ، لەناو ئەو هەموو خەڵکەدا کورێك بانگ دەکات وئەڵێت: تۆدۆستی مامۆستا لوقمانی ئوتومبیلێکم بۆ پەیدابکەبمبات بۆماڵی مامۆستا لە تەوێڵە، ئەویش لای سەیر ئەبێت، چوزانێت ئەم تەوێڵەییەو دۆستی مامۆستایە، ئوتومبیلی بۆ پەیدا دەکاو دێنەوە بۆتەوێڵە، کەهات بۆماڵمان بەرەحمەتیم وت: باشە چۆن زانیت ئەو برادەرە (کەناوی کاك نیهاد) بوو دۆستی منەو تەوێڵەییە؟ وتی: لەناوچەوانی نووسرابوو..

خوا لەرەحمەتی و مردوانی هەمووان خۆش بێت، وائەزانم ئەوە تەوفیقاتێکی خوابووە بۆی کە بەوئێوارەیە ئیشی مەیسەر بێت، شایانی باسە رەحمەتی بۆ



ئەشیعەی سیتی سکان ئەبوایە بچوایەتە ئێران لەرێی هەندێ دۆستەوە لە سنووری تەوێڵەوە، چونکە ئەوکاتە ئەو ئەشیعەیە تەنها لە مەعسکەر رەشید هەبوو لەبەغداو ئەویش لەکارکەوتبوو.لەخوا دەپارێمەوە کە ئەو هەموو ئەخۆشی و ناخۆشیەی بەدەست ئەخۆشیەوە بینی بۆی ببێتە مایەی پلەی بەرزو پشووی هەتاهەتایی لەفیردەوسی ئەعلادا، کەئەوەندە متمانەی بەدین و ئیمانی خۆی و رەحمەتی خوای میهرەبان بوو ئەیووت: بەگەورەیی خوا فیردەوسی ئەعلا نەبێت نامەوێت، کەسوپاس بۆخوا رەسولی خوا پێش مەرگی بەدوومانگێك وەك موبەشیراتێك مژدەی فیردەوسی ئەعلای دایە..

## کاک کەریم فەقێ رەشید سەراوی:

شەوی ٢٨ ی رەمەزانی ٢٠١٨ لەپاش وتاردانم لەمزگەوتی عوسمانی کوڕی عەفان لەکارێزە وشك، کاك کەریم هاتە دەرەوە لەگەڵماو وتی:من فەرمانبەربووم لە دائیرەی زراعەو ئەمخواردەوەو دوورلەخوابووم، بەسەرخۆشی باسی کەسێکم کردبوو هاتەسەرم و زۆر سەرزەنشتی کردم و وتی:من کە مرۆڤێکم ئەوەم پێناخۆشە ئەی خوا ئەبێت چەندی پێناخۆش بێت، ئەمە وای کرد تەوبە بکەم.

ساڵی ٢٠٠٣ خێزانم بەنەخۆشی دل کۆچی دوایی کرد زۆر ئافرەتی چاك بوو، ئافرەتێکی خواناسی ترم هێنا وئەویش پاش ١٤ مانگ لەمردنی یەکەم هەشت رۆژبوو کچێکمان بووبوو ئێوارەیەك گریاو وتی: من ئەمرم و ئەم کچەم بێدایك ئەبێت.منیش وتم: هەموو ئەمرین و تۆ بۆ وا ئەڵێیت؟ سبحان الله دڵی خەبەری دابوو دوای دەخولەك مرد.. کچەکەم ماڵە خاڵی بەو بچوکیە گرتیانە خۆیان ماڵیان ئاوابێ زۆرچاك گەورەیان کرد.

دوای ئەوەش هاوسەرێکی ترم هێناو ئەویش زۆرباشە ئەم ئێوارەیە پێموت: دوعام کردووە تۆ بێیت وتارمان بۆبدەیت وەك ساڵانی رابردوو چونکە قسەی تۆ ئەچێتە دڵمەوە، وا خوا وەڵامی دامەوەو تۆ هاتی وتارت بۆدایین..بەڕاستی بەسەرهات و قەدەری کاك کەریم زۆر هەژاندمی کەدووجار کۆستی کەوتووەو ماڵی لێشێواوە، ئەم وێنەیەشمان بۆیادگار گرت..



***

## بەرەکەتی یارمەتی منالّی بێباوک

شەوی ٢٧ی رەمەزانی ٢٠١٨ لەرادیۆی سپێدە بەرنامەیەکم لەگەڵ کاك عوسمان سەنگاوی پێشکەش کرد ناوبراو لە رێگەی رێکخراوەکەیەوە ژمارەیەکی زۆر منالّی کەفالەت کردووە وتی: کاك سەلیم خەڵکی هەورامانەولەسەرچنار دوکانی هەیە پێنج منالّی بێباوکی کەفالەت کردووە، لەسەربانی قاتی سێی ئەو خانووەی ئەیکات ئەکەوێت خوارەوە، هیچی لێنایەت، شیشێك کە چەقیوە بەلای قژیا ئەڕوات نیو سانتیم ئەم لاتر بوایە سەری کون ئەکرد، بلۆکێکیش کەدانرابوو تەنها تۆزێك قۆڵی ئەڕوشێنێت، هاوسەرەکەی لەخەویا بینی کەکاتێك ئەم ئەکەوێتە خوارەوە دوومنالّی بێباوك ئەیگرنەوە..

## لەقەدەرە سەیرەکان:

کاك خەبات کە کوڕەزای حاجی مەلا شەریفە پێش سێ ساڵێك لەقاتی سێی خانووەکەیەوە کەتازە دروستی دەکرد کەوتە خوارەوە بەسەرقادرمەداو سەری شکاو پەراسووی شکاو ئازاری بۆ دروست بوو لە بڕبڕەی پشتیدا، مالّی باوکی لەبەغدابوو، شەو کەئەیبیستن ئەم وای لێهاتووە، براکەی بەناوی کاك هەردی کەلەئاسیا سێڵ لەبەغدا دەوامی ئەکرد هەرشەو مۆڵەت وەردەگرێ وسەعات چوار ئەکەونە رێ و هەشتی بەیانی ئەگەنە سولەیمانی، سبحان الله سەعات هەشت بینای ئاسیا سێڵ لەبەغدا لەکارێکی تیرۆریستیدا ئەتەقێنرێتەوەو کورسیەکەی کاك هەردی شەست وحەوت مەتر هەڵئەدات!

جا قەدەرەکە زۆر سەیرە ئەگەر ئەونەهاتایەتەوە بێگومان کاك هەردی تیائەچوو، بۆیە کاك خەبات ئەڵێت: لەگەڵ ئەو موسیبەتەدا کەچەند مانگ

لەسەرجێگا بۆی کەوتم هەرسوپاسی خوام دەکرد کە بەو موسیبەتەی من براکەم لەمردن رزگاری بوو..



## تەوفیقاتی خوا:

– مامۆستا مەلا عبداللەی مزگەوتی گەورە، خوا لێی خۆش بێت، پیاوێکی پیاوانەو موسڵمانێکی زۆر چاك و خواناس بوو، بەڵام بڕوانامەی مەلای دوانزە عیلمی نەبوو...

(بەڕێوەبەرایەتی شئونی ئەوقاف)ی ئەوسا فەرمانێ دەردەکات، گوایە هەرچی مەلای دوانزە عیلم نەبێ نابێ ببێ بەئیمام و دەبێ مەلاکان لەتاقی کردنەوەی تایبەتدا لە بەغدا ئامادەبن بۆ بەدەست هێنانی ئەو بڕوانامەیە ئەگەر نەیان بێت.. مامۆستا مەلا عبداللەش ناچار دەچێت بۆ بەغداو پاش دەرچوونی ئەنجامی تاقی کردنەوەکە یەکەم ئەبێت...

کەدێتەوە سلێمانی، مامۆستا مەلا عینایەت لێی دەپرسێت: مەلا عبداللە چۆن پلەی یەکەمیت بەدەست هێنا، خۆ تۆ زۆر لەو تاقیکردنەوەیە دەترسایت.. ئەویش وتی: پێغەمبەر ی خوا درووودی خوای لەسەر شەوی تاقیکردنەوەکە هاتە خەوم و هەموو پرسیارو وەڵامەکانی پێ وتم..

– پێشەوا بەننا شەوی تاقیکردنەوەی نەحوصرف لەخەویا لەبەلەمێکدا ئەبێت لەگوێ رووباری نیل لەگەڵ چەند زانایەکی بەرێزدا، یەکێکیان ئەڵێت: کوا شەرحی ئەلفیەی ئیبن عەقیل،وتم: ئەوەتا، وتی: بیخەرە سەر لاپەڕە ئەوەو ئەوە وپیاپاچوومەوە، بۆ بەیانی زۆربەی پرسیارەکان ئەوانەبوون هاتبوونەوە. کەئەمەش ئاسانکاریەك بوو لەخواوەو خەوی راستیش مژدەی خوایە ئەیدا بەبڕوادار لەدونیادا..

## دکتۆر محمد موسی الشریف

یەکێك لەو بانگخوازانەی کە سەرسامم بەهەوڵ وهیمەتی و پەیجی التأریخ ی هەیەوزۆرچالاکە دکتۆر محمد موسی الشریف ە، جا بۆتان باس بکەم لەبەرچی سەرسامم پێی:

ساڵی ١٩٦١ لەجەددە لەدایکبووەو بنەچەیان لەباوکەوە ئەچێتەوە سەر ئال وبەیت، دایکی میسریەو، پاش ئەوەی ئەچێتە پەیمانگای فڕۆکەوانی، ئنجا ئەینێرنە ئەمەریکا بۆ خوێندنی فڕۆکەوانی وبووە فڕۆکەوان لە هێڵی ئاسمانی سعودیە، مانگانە نزیکەی ١٨ رۆژ سەرقاڵی کارەکەی بوو بۆیە بڕیاری دا کە خوێندنی شەرعیش تەواو بکات، ساڵی ١٩٩٨ کۆلیژی شەریعەی زانکۆی محمد بن سعودی ئیسلامی تەواوکردو ساڵی ١٩٩٢ ماستەری تەواوکردو ساڵی١٩٩٦ دکتۆرای

لە کیتاب و سوننەدا هێنا.نزیکەی ٢٥ ساڵ وانەی لای دکتۆر ئەیمەن سوید ئەخوێند تا ئیجازەی دە قیرائەتەکەی لێوەرگرت وهەموو قورئانی لەبەرە.

خوێندنی شەرعی ئاسان نەبوو چونکە بەزەحمەت شەش مانگ بێ مووچە مۆڵەتیان دایەو کارئاسانیان بۆ نەئەکرد.

ئەڵێت لەبەرئەوەی وەك ئێستا مۆبایل نەبوو، یەکێکم راسپارد خشتەی تاقیکردنەوەکانی زانکۆم بۆ بنووسێت، کەبۆی هێنامەوە تومەزهەڵەی کردووە چووم بۆ تاقیکردنەوە تومەز ئەو وانەیەی من خۆم بۆئامادەکردووە ئەوەنیەو وانەیەکی ترە.

جارێکی تر بەپەلە چووم بۆفڕۆکەخانە تابچم بۆ مەککە جێ نەمابوو زۆرهەوڵمدا، لەبەرئەوەی خۆشم کابتنم، کابتنی فڕۆکەکە قایل بوو لەلایەوە لەمەقصورەی تەیارەکەدا دانیشم، کەویستم سەربکەوم موفەتیشەکە وتی:نەمووت جێگانیە، وتم: ئەوە بیتاقەیان داومەتێ لەلای فڕۆکەوانەکەوە دائەنیشم ئەوەندە ناکەس بوو بیتاقەکەی دڕاندو وتی: جێگانیە، دوایی چوومە ژوورەکەی زۆر سەرزەنشتم کرد سوودی نەبوو، بۆیە زۆر دوعام لێکرد، خواکردی هەواڵم بۆهات کە تاقیکردنەوەکە رۆژێك دواترە باش بوو لەدەستم نەچوو.

بەیانیەکیان کەهەستام بۆنوێژی بەیانی گوێم لەدەنگێك بوو دووجار وتی: المقلوب، المقلوب، یەکسەرزانیم کەمەبەستی باسی (المقلوب)ە کەجۆرێکە لەفەرموودەی لاواز، یەکسەر سەعیم تیاکرد وکەچووم بۆ تاقیکردنەوەی فەرموودە ئەو رۆژە یەك پرسیارمان بۆهاتبۆوە ئەویش لەبارەی (المقلوب)ەوە بوو زۆر سوپاسی خوام کردو ئەوە تەوفیقاتێکی خوابوو، کەمن لەو سەردەمەدا بۆ خوا خۆم یەکلایی کردبۆوە.

ناوبراو لەدکتۆراکەیدا دکتۆر عبدالستار فتح الله سعید موشریفی بوو کە کەسایەتیەکی ئیخوانی میسربوو، جا زۆر سەرسام بوو بەزانست و ئەخلاق وتەوازوعی، تەنانەت ئەڵێت زۆر سەرسام بووم رۆژێك بینیم کەگەیشت بەمامۆستا محمد قوتب لە ڕاڕەوی زانکۆ دانەویەوە دەستی ماچ بکات لەکاتێکدائەمیش بەتەمەن بوو.

ناوبراو نزیکەی ٩٤ پەڕاوی داناوە تائێستاو بەداخەوە لەبەرئەوەی بانگخوازێکی چالاکەو بەباش باسی ئیخوان ئەکات لەگەڵ ٧١ بانگخوازو کەسایەتی سعودیدا لەساڵی ٢٠١٧ ەوە لەبەندیخانەدایە.



## خێرخوازێکی مەککە!

عبدالرحمان الفقیە لەساڵی ١٩٢٥ لەدایکبووە وتەمەنی ٩٠ ساڵ زیاترەو یەکێکە لەدەوڵەمەندە خێرخوازەکانی سعودیە وتەندروستی باشە بەهۆی ئەوەی رۆژی نزیکەی ٤ کیلۆمەتر بەپێ ئەڕوات و مەلەش دەکات.

خاوەنی پڕۆژەی (طازج) ە بۆ خواردنی خێرا کەمریشکی برژاو ئامادەئەکەن، خاوەنی پڕۆژەی گەشتیاری و هیلتۆن مەککەیەو یەکەم کەسە کەدەواجنی سەردەمیانەی هێناوەتە سعودیەوە. کەسێکی خێرخوازەو هاوکاری بۆ خوێندن و منالّی بێباوك و پڕۆژە خەیریەکان هەیە.

ناوبراو هۆکاری بەرەکەت لەماڵ و سامان و رزقیا ئەگێڕێتەوە بۆ نیەتی باش ودەڵێت: ساڵێکیان نەخۆشی کەوتە دەواجنەکانەوەو ومریشکی زۆر مرداربوونەوە وتەنها من مریشکم هەبوو ئەمتوانی بەچوارقاتی نرخی خۆی بیفرۆشم بەلاّم لەبەرخوا نرخی مریشکم بەرز نەکردەوە، زۆر لەبازرگانەکان لۆمەیان کردم کەبۆ دەستی خۆم نەوەشاند، منیش نیەتم خێربوو ئەمزانی خوا هەقم بۆدەکاتەوە، ئەوەبوو لەدوو ساڵدا خوای گەورە دەرگای رزقی بۆخستمە سەرپشت وبوومە یەکێك لەدەوڵەمەندەناودارەکانی سعودیە.



## وەسیەتنامەیەک:

کاك جەمال مەردۆخ دەڵێت: پوورزایەکم بەناوی شۆڕش ڕەزا هاوسەری خوشکم بوو لە ساڵی ١٩٩١لەباشماخ کاریدەکرد، جوابی نارد بۆ دایکمو خوشکم کەنانی بۆبکەن و بۆی بنێرن، چونکە چەند روژ لەوێ دەمێنێتەوە ئەمانیش دوای داواکەی دەستیان کرد بە نان کردن، کەچی ئەوەندەی پێنەچوو کوڕی پورم هاتەوە و خۆی کرد بە ژورداو ڕەنگی زۆر تێك چوو بوو، ئەو کات هیچی لای ئێمە باس نەکرد هەرچەند دایکم لێی پرسی بەڵام هیچی نەوت، بۆ بەیانی ڕاپەڕینی سێیەم رویداو لای ئە منە سورەکەی شاری سلێمانی بە هۆی پارچەیەك نارنجۆك کە چووە بۆریهەناسەی دوای سێ ڕۆژ شەهیدبوو..



دوای ماوەیەك لە شەهیدبونی وەسێتنامەیەکمان دۆزیەوە کە تیایدا نوسیبووی کاتێ لە باشماخ بووم فریشتەی مردنم بینی پێی وتم: چوار ڕۆژت ماوە بچۆ وەسیەت بکە.. ئە م پورزایەم زۆر کە سێکی خواناس بوو.

وێنەی وەسیەت نامەکە:

## ئەجەل:

قورئانی پیرۆز لەزۆرئایەتدا سەرنجمان رائەکێشێت بۆ ئایەتەکانی بوونەوەرو ئایەتەکانی قورئان و ئایەتەکانی ناو نەفسی مرۆڤ خۆی، ﴿ **وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِلْمُوقِنِينَ (٢٠) وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ (٢١) وَفِي السَّمَاءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ (٢٢) فَوَرَبِّ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِنَّهُ لَحَقٌّ مِثْلَ مَا أَنَّكُمْ تَنْطِقُونَ (٢٣)**﴾ الذاريات.

برادەرێکم دایکی ئەبات بۆلای دکتۆر هادی خەلیلی جەڕاحی دەماری بەناوبانگی عێراقی لەبەغدا،دکتۆر لەمیانەی قسەکردندا باسی پێکهاتەی سەرسوڕهێنەری مێشك ودەمارەکان ئەکات و ئەڵێت: برادەرێکی دکتۆرمان نوێژی نەئەکرد لەیەکەم نەشتەرگەری مێشکدا تەسلیم بوو دەستی کرد بەنوێژ کردن.

هەروەها لەئایەتەکانی بوونەوەر مەسەلەی ئەجەلە کەئەگەرلێی وردبینەوە بەڕاستی سەرت ئەسوڕمێت،قورئان سەرنجمان رائەکێشێت بۆی و٦١ جاروشەی ئەجەل دووبارە بۆتەوە ﴿ **أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا فِي أَنْفُسِهِمْ مَا خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُسَمًّى وَإِنَّ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ بِلِقَاءِ رَبِّهِمْ لَكَافِرُونَ (٨)**﴾ الروم.

بەڕاستی کات و ساتی ئەجەل شاراوەیە کەچی خوا کەخۆی عالیمی غەیب و شەهادەیە هەندێك جار بۆهەندێك کەسی ئاشکرادەکات لەبەرحیکمەتێك کەخۆی ئەیزانێت، وەکو ئەوەی کەموستەفانوعمانی بانگبێژی مەدینە دڵی خەبەری دابوو دوای دووڕۆژی تر دەمرێت و واش دەرچوو، ئەوەی سەیرترە لەوە لەسلێمانی پیاوێکی شێت هەبوو بەناوی قالە بەئیمامی مزگەوتی شێخ محی الدین ئەڵێت: مامۆستا سبەی سەعات دەی بەیانی دێم لەویا دائەنیشم و ئەمرم،مامۆستا زۆری پێ

سەیردەبێت، سبحان الله بۆبەیانی سەعات دە دێتەمزگەوت و دائەنیشێت و ئەمرێت.

ئنجا خۆئەوەش رەحمی خوایە کەئەجەلی خۆمان نازانین ئەگەر پێمان بوترێت سەد سالّی تریشە دەقەوسەعاتی بۆ ئەژمێرین و ژیانمان لێتالّ ئەبێت.(وێنەی دکتۆر هادی خەلیلی).



## مردنێکی سەیرا

کاك ئیبراهیم ئەحمەد دەڵێت: باوکم پیاوێکی ساڵحی بۆخوا سوڵحاوبوو،لە حەفتاکاندا لەپێنجوین رۆژێك برنج وگۆشتی هێنایەوەو وتی:ئێوارە دوو میوانمان دێت، ئەوەبوو ئێوارە دووکەسی نوورانی کەنەدیبومان و نەبینیشمانەوە لەدەرگایان داو وتیان میوان رادەگرن، فەرموومان لێکردن پاش نان خواردن رۆشتن، باوکم کەئەو ئێوارەیە هەموو منالەکانی کۆکردبۆوە ئامۆژگاری کردین و وتی: ئەو باخ و باخاتانەی هەمانە بەشی بکەن لەنێوان خۆتانداو ئەوەشتان کەویستی زایەی بکات بایەکێکتان هەڵیبگرێتەوە. باوکم دوای وەسیەتەکەی دیاربوو دڵی خەبەری دابوو، وتی: ئەو قورئانە بێنن یاسینم بخوێنن، یاسینمان بۆخوێند و کەتەواوبووشانی دادابوو سەیری سوچی سەقفەکەی دەکرد، پێکەنی و گیانی سپارد.

جابەڕاستی مردن وتەنانەت باسەکەشی ئەوەندە موسیبەتێکی گەورەیە زۆربەی خەڵکی لێی رادەکەن،کەچی کەسانی وەك کاك ئەحمەدی پێنجوینی ئاوا پێشوازی لێدەکەن. ﴿ قُلْ إِنَّ الْمَوْتَ الَّذِي تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُ مُلَاقِيكُمْ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ الجمعة:٨.

## خوا زاناو دانایەو ئەیەوێت لەیاساو باوی تێبگەن:

قورئانی پیرۆز زۆرگرنگی داوە بەوەی کە موسڵمانان لەو یاسایانە تێبگەن و ڕوون بێت لایان، هەروەك دەفەرموێت: ﴿ يُرِيدُ اللهُ لِيُبَيِّنَ لَكُم وَيَهدِيَكُم سُنَنَ الَّذين مِن قَبلِكُم وَيَتُوبَ عَلَيكُم وَاللهُ عَليمٌ حَكيم ﴾ النساء: ٢٦. واتە:خوا دەیەوێت هەموو شتێکتان بۆ ڕوون بکاتەوەو ڕێنموونیتان بکات بۆ ئەو

یاساوباوانەی کە بەسەر گەلانی ڕابردوودا هاتوون و لێتان خۆشبێت، خوا زاناو دانایە...

نموونەکان زۆرن: چاوگێڕان بەژیانی خۆمانو خەڵکیدا لەکۆنو نوێدا ئەم ڕاستیانە دەسەلمێنن‌و هەندێکیان دەماودەم دەگێڕدرێنەوەو هەندێکیان لەدوو تویی پەڕاوێکدا تۆمار کراون و هەندێکیشی بیر دەچنەوە، لیوا روکن (محمود شیت خطاب) لە پەڕاوەکەیدا (عدالة السماء) چەند نموونەیەکی بۆ تۆمارکردوین‌و مامۆستا ڕاشیدیش لە (صناعة الحياة) دا چەند نموونەیەك باس دەکات، کە دەڵێت:

یەکەم: پیاوێك یەکێك دەکوژێ‌و فڕێی دەداتە چاڵێکەوە، پاش ماوەیەکی زۆر، یەکێك پەیدا دەبێت‌و لەکێشەیەکەوە دەیەوێت ئەم بکوژێ، ڕادەکات‌و نازانێ لەکوێدا خۆی بشارێتەوە، سەرەنجام ئەچێتە ئەو شوێنەی کەخۆی پیاوەکەی تیا کوشتبوو، دوژمنەکەی هات‌و لەوێدا دۆزیەوەو لەهەمان شوێن دا کوشتیەوە (الجزاء من جنس العمل)..

دووەم: کاتێك سوپای عوسمانی لەبەغداد کشانەوە، سەربازێکی تورك پەرتەوازە بوو بوو، لەدەرگای مزگەوتی (أبي الحنيفة) وەستا بوو، بێکەس‌و بیدەر، نەگبەتێ هات کوشتی‌و شتەکانی برد، پاش بیست ساڵ ئەو نەگبەتە شەڕی بوو لەگەڵ زەلامێکداو چەقۆیەکی لێدا، لەتاو برینەکەی شپرزە بوو، سەدان مەتر ڕای کرد تا گەیشتە ناو دەرگای مزگەوتی (أبي حنيفة) و لەویا بەدەما کەوت‌و مرد!.

سێیەم: ئەحمەد جەمال الحريری خوا لێی خۆش بێت بۆی گێرامەوە، کە لە مەککە (مطوف) بوو، تەوافی بەخەڵك دەکرد، وتی: کوڕم لات سەیر نەبێت کەلاشەی ئەمیر (عبدالالە) لە بەیانی شۆڕشی چواردەی تەموزدا لەبەغدا ڕایان کێشا، من بەچاوی خۆم دیم لەبەیانی ڕۆژی نۆی شعبان دا لەمەککە، ئەو ڕۆژەی شۆڕشی عەرەبی ڕاگەیەنرا کە (لورنس) سەرکردایەتی دەکرد، عەلی باوکی ئەو

(عبدالالـه) ە، چووە سەر قەلاّی مەککەو بە (حامیة)ی عوسمانی وت کە ئەمین بن‌و دەستیان بۆ نابەن، تاخوێن نەڕژێ و بگەڕێنەوەو ئەو ناوچەیە بەجێبهێڵن، ئـەوانیش بۆئەوەی لەمەککەدا خوێن نەڕژێت خۆیان تەسلیم کـرد، کەچـی سـەربازەکانیان بەرداو چـواردە ئەفسـەری عوسمـانیش کـە لەگـەڵیان بـوون قاچـیان بەسـتنەوەو بەزیندوویی رایان کێشان تاپـاش چـەند سـەد مـەترێك گیانیـان دەرچـوو، پاشـان لەنێوان مەککەو(منی) دا بەمردوویی بەدارا هەڵیان واسین..دیارە کوڕەکەشی لـەو موبارەکتر نەبووە!! بۆیە بەڕاستی عەدالەتی خوایە، کەئـەو نەگبـەتی‌و تاوانـە خـوا بە(عبدالالـه)ی کوڕی رشت‌و بێجگە لەسزای قیامەت هەر لەدنیادا پیشـانی دان.. لاپەڕە ١٢ (صناعة الحیاة)..

**چوارەم:** بەنـدە، بـرادەرێکم بـۆی گێڕامـەوە کـە لـە شـەڕی کوەیتـدا، دوو سەربازی کورد لەوێ دەبن، یەکێکیان دەیەوێت خۆی بەرێتە پێشێ لە ئامرەکەی‌و دەڵێ: قوربان دەچم شتێکت بۆ دێنم، ئەویش لەگەڵ سـەربازە کوردەکـەی تـردا دەینێرێ کە سایەق دەبێت، لەڕێ سایەقەکە پێی دەڵێت: خوا هەڵناگرێ بـۆ شـتی وا دەکەیت، ئەویش دەڵێت: من دەمەوێ بەهەر نرخێك بێت (ئیجازە) وەربگرم و بگەڕێمەوە سلێمانی بۆ ناو کەس‌و کارم..

بەڵێ.. ئەو برادەرە دەچێتە سەر ماڵێکی کوەیتی قـوڕ بەسـەرو دەسـت دەداتـە (ئێرکۆندیشن)ەکەیان‌و دەیهێنێ لـەو چـلەی گەرمایـەدا، هەرچـەند مـاڵ‌و منـاڵی خاوەن ماڵەکە دەپاڕێنەوە سوودی نابێت.

کە دەیهێنێ بـۆ ئامرەکـەی، لەبەرئـەوەی شـەو کارەبـا داناگرسـێنن لەترسـی هێرشی (حولەفا)، ئامرەکە دەڵێت: ئەو کارەبایەی بۆ ترتیب بکەن باهیچ نەبێ بەم گەرمایە ئێرکۆندیشنەکە بخەینە ئـیش‌و فێنکمـان ببێتـەوە، سـەربازەکەش خـەریکی

کارەباکە دەبێتو لەگەرمەی سەرقاڵیدا نازانن کارەباکە دادەگرسێنن‌و کارەبا دەیگرێت‌و دەیکوژێت..

سەربازە کوردە دەست پاکە بەویژدانەکە دەڵێت: خوا ئاگادارە من لاشەی ئەو برادەرەم بەئیجازە هێنایەوە کەبەتەما بوو بەو زوڵم‌و ستەمە ئیجازە وەرگریٚ؟!، وەری گرت بەڵام بەمردوویی.. ئەوە عقوبەتی خوا.. خوا بمانپارێزێ.. (لا ١٨٠ کتیبی ژیانەوە: نووسەر).

## برۆ لای خۆتان کاربکە!

دکتۆر محمد راتب نابلسی دەڵێت:نزیکەی سەدساڵێك لەمەوبەر گەنجێکی بۆ خوا سوڵحاوی خەڵکی شام ئەچێ بۆ مەدینە و حەزدەکات لەو خاکە پیرۆزە نزیك بێت لە پێغەمبەری خواوە (د. خ)، حەزرەتیش دەچێتە خەوی پێی دەڵێت:کارکردنت لە ولاتەکەی خۆت باشترە لەوەی لەلای من بیت، لەلای من بەختەوەر دەبیت بەڵام کارت بۆ ناکرێ و پلەت بەرزنابێتەوە.

ئەمیش دەگەڕێتەوە بۆ شام وقوتابخانەیەکی ئایینی دادەمەزرێنێ و بۆ ماوەی هەشتا ساڵ خەڵکی فێری ئیسلامەتی دەکات و جاری واهەبوو بەهەندێ قوتابی دەوت: باوکت و باپیریشت لای من قوتابی بوون.ئەم پیاوە خواناسە نەوەدو شەش ساڵ ژیا و خزمەتێکی گەورەی ئیسلامی کرد و ئێستاش قوتابخانەکەی ماوە. لێیان پرسی چۆنە ئاوا چاوو گوێ و ئەندامەکانت بەو تەمەنەشتەوە باشن، وتی: لە گەنجیدا پاراستمانن لە گوناه، خوای گەورەش لە پیریدا بۆی پاراستین. (موسوعة الاسماء الحسنى _محمد راتب النابلسی -بەرگی دووەم /لاپەڕە ٨١ ).

## مامۆستا مەلا مەجیدی شەقلاوە

(د. علی احسان)کە خەڵکی لای چەمچەماڵەو لەهەشتاکانەوە لە شاری جەددە مامۆستایە باسی خوالێخۆشبوو مامۆستا ( مەلا مەجیدی شەقلاوە) ی بۆ کردم کە یەکێکە لە برا دێرینەکان، زۆر هەڵوێستی جوانی هەیە:

ا- لە هەشتاکاندا وەزیری ئەوقاف دەچێت بۆ شەقلاوە لە ئوتێلێك دادەبەزێت و دەنێرێت بەدوای مەلاکاندا و زۆربەیان دەچن، مەلا مەجید ناچێت، بۆیە دوایی وەزیر خۆی دێت سەردانی دەکات و گلەیی نەچوونەکەی لێدەکات، ئەویش لەوەڵامدا دەڵێت:

قوربان خۆ جەنابتان وەزیری (سیاحە) نین لەو جۆرە ئوتێلانەدا دابەزن، کە نهۆمی خوارەوەی بارەو مەی تیا دەخورێتەوە، ئەو هەموو مەلایە بە جبەو مێزەرەوە ئاخر چۆن بێنە خزمەتت لە شوێنێکی وادا، جێی بەڕێزتان مزگەوتە، چاك وابوو لە مزگەوت دابەزینایە و جا بتزانیایە چۆن هەموو مەلاکان دەهاتنە خزمەتتان. بەمەش جەنابی وەزیر دەمکوت دەبێت و هیچی بۆ نامێنێتەوە.

ب – ڕۆژێك مامۆستا مەلا مەجید دوو میوان دەچنە ماڵیان و خێزانی دەمەو نیوەڕۆ خواردنی ئەو دوو میوانە و خۆیان ئامادە دەکات، کاتێ دەگەنە وەختی نانخواردن میوانەکان ژمارەیان دەگاتە (١٥) کەس. کوڕی مامۆستا دێت و دەچرپێنێ بەگوێ ی داو دەڵێت: دایکم نازانێ چی بکات؟!، خواردنەکە زۆر کەمەو بەش ناکات، مامۆستاش دەڵێ: بەدایکت بڵێ کە کەوگیری دا لە چێشتەکە با (بسم الله) بکات و هەقی نەبێت.

کوڕەکە دەڵێت: بەخوا نەك (بسم الله) بەڵکو هەموو قورئانیشی بەسەرا بخوێنێ هیچی پێناکات و خواردنەکە بەش ناکات.

مامۆستا پێی دەڵێت: نەفام تۆ لەوە تێناگەیت، چیت پێدەڵێم وا بکە...

ئینجا خێزانی ( بسم الله) دەکات و خواردنەکە تێدەکات، بەفەزڵی خوا، خواردنەکە بەرەکەتی تێدەکەوێت و بەشی هەر (١٥) میوانەکە دەکات.

## مامۆستا نوری فارس

ئەم مامۆستا خۆشەویستە زۆر لەفەرموودەکانی پێغەمبەردروودی خوای لەسەر وەك پەڕاوی (تاج) و (ریاض الصالحین ) کردووە بەکوردی بێجگە لە چەند پەڕاوێکی فیقهی و وەکو خۆی دەڵێت: جاری واهەبووە یەك هەفتە بەدوای مانای وشەیەکدا گەڕاوە.

ئەم پیاوە باشە کاوەی کوڕی لەگەڵ خەلیل ناوێکدا کە کەرکوکی بوو کاری دینارو دۆلاردەکەن و هاتوچۆی سنووری ئێران دەکەن لە نەوەدەکاندا، یەکێ لە سەیتەرەیەکی لای کانی پانکەی سلێمانی هەواڵ ئەدا بەکۆمەڵێ چەتەی پیاوکوژ کەئەم دوو نێچیرە پارەی باشیان پێیە بۆسەیان بۆ بنێنەوە، ئەوانیش بەجلی پۆلیسیەوە دەستیان لێڕادەگرن وپارەکەیان لێدەسینن، سەیارەیەکیان پارەکە دەباتو سەیارەیەکیشیان لە ئیش دەکەوێ،لەم بەزم رەزمەدا خەلیل دەمانچەکەی دەردێنێ وبرای سەرۆك دزەکان ئەکوژێ، سەیارەی دزەکان دەکەوێتەوە ئیش و ئەوانیش خەلیل بریندار دەکەن، بەهەرحاڵ پۆلیسەکانی سەیتەرەکە هەرچەند نزیك دەبن لێیان هیچیان بۆناکەن و ناچن بەدەمیانەوە،بەهەرحاڵ ئوتومبیلێك لەرێی خوادا خەلیل وکوڕی مامۆستا سەردەخات ودەگەنە عەربەت، سەرۆکی چەتەکانیش بەخۆی وهەشت سەیارە چەکدارەوە دەگەنەوە سەریان پاش ئەوەی کەمەیتی براکەی بۆ دەچێتەوەو ئەم دوو داماوە شەهید دەکەن.

مامۆستاو خزمانی مەیتەکان وەردەگرنەوە و سێ رۆژێك بەسەر تەعزیەکەیاندا تێپەڕدەبێت، کابرایەکی جل کوردی بالآبەرز دێت بۆ کتێبخانەکەی مامۆستا مەلا

مەحمود لای مزگەوتی گەورەو ئەحوالی نوری فارس دەپرسێت، ئەویش دەڵێ:لـە تەعزیوە ئالاوەو کارەساتیکی وای لیقەوماوە، ئەویش دەڵێ: من بۆ ئەو مەسـەلەیە ئیشم پێیەتی، ئەمیش دەڵێت:زۆرباشـە نیوسـەعاتی تـر وەرەوە وادەکـەم مامۆسـتا نوریش بێت، مامۆسـتاوخزمێکیان دێـن و لـەژوورێکی مزگـەوتی گـەورە قسـەی لەگەڵ دەکەن و کابرا هەموو بەسەرهاتەکە دەگێڕێتەوە.

## مامۆستا نوری فارس ئاوا باسـی شـەهیدکردنی کـاوەی کـوڕی دەکات:

پاش سی ودووساڵ لـەغەریبی کوڕ بەناهەق کوژرا، مـاڵ دزرا، سـەیارە فڕێنـرا، دەنگمان بەخوا نەبێت بەکەس نەدەگەیشت،بەسەرو ریشی سپیەوە، خۆشی خۆشی گەڕاینەوە ناو ولاتی خۆمان، کەچی کۆمـەڵێ کـوردی نامـەردی سـەربەم لایەنـە کوردیە بەناو پێشمەرگانە، کەلەراستیدا جاش مەرگـەن، نـەوەك پێشـمەرگە، وەك دووپشکی عەربەت وکوڵە وەیباب دایان پێمانەوە، جالـەماڵەوە من و دایکی کـاوە دەستمان کرد بەپاڕانەوەو قورئان خوێنـدن و قورئـان هـەڵبڕین وقووروسـکاندن، گاور بەزەیی پیامانا ئەهاتەوە، ئاگامان لەهیچ نەبوو، مێشێ دوژمنمان نەبوو، هـیچ خەبەرێ نەبوو، رۆژێ دووپیاو لـەخەڵکی ئەو ناوچە هـاتن بەپرسـەمانەوە، ئێمـەش رێزێکی شایانمان لێگرتن، دڵم خەبەری دا کەئەمانە شـتێ لەدڵیاندایـە، لـەبەرئـەوە یەکی کتێبێکی تاجی کوردیم بەدیاری پێیاندا وگوتم پێیان: ئەمەنوێنەری ئێمەیە لای ئێوە، ئەوانیش بەخەیاڵی خۆیان ئێمە ماڵە مەلایەکی هـەژاری خـوداین و بێکەسـین وتەواو، لـەبەرئەوە جێگەی مەترسی نین بۆیان.

جارۆژێ ئاهەنگی یادێك بوولـەمزگەوتی گـەورە، لەناومەلایانـدا دانیشـتبووم، خزمێکم هات وتی: کابرایەك وا لـەدەرەوە داوات ئـەکات، کەچـووم دەڕوانم وا

پیاوێ رانکوچۆغەیەکی رەشی لەبەردایە کەمنی دی وتی: تۆ نوری فارسی باوکی کاوەیت؟ وتم: بەڵێ بۆچی؟

وتی: برۆ دەمانچەیە بێنە و بمکوژەو رزگارم بکە، من یەکێکم لەو کۆمەڵەی کەکورەکەی تۆمان کوشتووە..

وتم: بابچینە ژووری لەژووری حافزەکان، لەوێ وتی: نارۆم هەتا نەمکوژی، ژیانم لێ تاڵ بووە، شەوتابەیانی نەقیبێکی عەسکەری دێتە گیانم، ئازارم دەدا ودەست دەخاتە بەربینم، هەتا بەیانی دەمتاسێنێ، هەموو شەوێ پێم دەڵێ:رۆژ لەرۆژ خراپترت لێدەکەم، ئەگەرنەچی بۆلای باوکی کاوە وئەم تاوانە ئاشکرانەکەیت!

وتی: ئێوە نازانن هەرشەوێکم مردنێکە، منیش لەگەڵ خزمەکەم هەرچی وت لەبارەی تاوانەکەوە لەکوتە کاغەزێ بەپەلە نووسیمان، ئەوجا پێمگوت: من لێرەدا لەپەنا قەبری کاك ئەحمەدی شێخدا پیاوناکوژم، بەلأم تۆ برۆ با ئەو پۆلیس و ئینزیباتانە پێت نەزانن و رێزی مزگەوت نەشکێ، بەیانی سەعات نۆ وەرەوە بۆ فلأن دوکان،وتی: باشە.. بەلأم ئێستا بێ یان بەیانی نەمکوژی نارۆم.کەچوومەوە ماڵەوە هەموو وتیان:چۆن هەڵەی وات کردووە تازە نایەتەوە، بەلأم من دڵنیابووم کەقورئان کەمەندکێشی کردووەو بەدەست خۆی نیە دێتەوە، چونکە زۆر پەرێشان و لەحالێکی سەیرابوو.

کەبەیانی چووین بۆدوکانەکە وتی: من لەسەعات هەشتەوە لێرەم، ئەمشەوم لەهەموو شەوێ ناخۆشتربوو، نەقیبەکە هاتەوە سەرم و وپێی وتم: ئەو پیاوە لەخۆت رازی نەکەیت خراپترت لێدەکەم.

وتم: بابچین بۆلای مودیری شورتە، کەئەوکاتە سەلاح چاوشین بوو.کاك سەلاح عەقیدێکی شورتەی بانگکردو هەموو دانپیانانەکەیان نووسی، ئنجا وتی:

دەی درەنگە کەی دەمکوژیت و رزگارم دەکەیت؟منیش وتم:من لـەم لەحزەیـەوە تۆم بەخشی، داواشم لەکاك سەلاح وشورتەکان کرد کە رێزی بگـرن و ئـازاری نەدەن، هەتا کاتی دادگایش لەگەڵ باوکیا بەکەفالەت ئازادمان کرد.

جائـــەوەی گرنگــــە، پـــاش ئـــەوەی ئیعتیرافـــی کـــرد و گـــەردنیم ئازادکردلەوحاڵەتەدەروونیە رزگاری بوو، هەروەها لەتاوانبارە ناوتۆمارکراوەکانی دادگاش هەشتیان لە شەڕە سەگی شڕەخۆریدا کوژران و خوا تۆڵەی لێسەندن.

مەلای ئەو گوندەی ئەو دووپیاوەی پێشــتر لێـوەی هـاتبوون بـۆی گێڕامـەوەو وتی:ڕۆژێ باوکی یەکێ لەوتاوانبارانە هات بۆمزگەوت وکتێبێکی بەدەستەوە بوو، وتی: مەلا ئەم کتێبەچی لێبکەم ئەمـە مـاڵی منـی وێـران کـرد، کەتەماشـام کـرد بەرگێکی تاج بوو کەتۆ بەدیاری دابوتێ وخوای تـۆ کوڕەکـەی لـەرێی پێنجـوین لەجەردەیدا کوژرایەوە.

ڕۆژێــك لـــەرێگای خزمێکمانـــەوە کەســێك هـــات وتـــی: ئەگەردەتـــەوێ بەئوتومبیلێکی بەڕازیلی فلانت بۆدەکـوژم کـە یـەکێ بـوو لـەبکوژەکان،منـیش دەرمکرد وبەخزمەکانم وت: من کەس بەگوللە ناکوژم، قورئانەکەم نیشانداو وتم: مـن ئەمـە چـەکی دەسـتمە وبـەس.. دەوری مـانگێکی پێچـوو عومـەر چاوشـین ئەوکابرایەی کوشت ولەکوردوستاندا دەنگی دایەوە..ل٢١٨ ژیاننامەی مامۆسـتا نووری فارس.

مامۆستای جەرگ سـوتاو دەڵێـت: زۆر شـەو لـەداخ وخەمـدا خـەوم دەزڕاو پەڕاوی فەرموودەکانی خۆشەویستم (د.خ) دەخستە سەرسنگم سەبوریم بۆدەهات و خەوم لێدەکەوت.

***

**لەخزمەت چەند فەرموودەیەکدا:**

**- النبي عليه الصلاة والسلام أوصى رجلاً، قال: استحي من الله استحياء ك من رجلين من صالح عشيرتك لا يفارقانك..**

پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر ئامۆژگاری پیاوێکی کردو فەرمووی: شەرم بکە لەخوا هەروەك چۆن شەرم ئەکەی لەدوو پیاوچاکی عەشرەتەکەت کەهەمیشە لەگەڵتابن.

خۆشەویست دروودی خوای لەسەر فەرمووی بەحاریسە:ئەی حاریسە حاڵت چۆنە؟

وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بڕوادارێکی راستەقینەم.

فەرمووی: بزانە ئەڵێی چی، هەموو شتێك حەقیقەتێکی هەیە، حەقیقەتی ئیمانی تۆ چیە؟

وتی: نەفسم دوورگرتووە لەدونیاوشەو شەونوێژئەکەم و بەرۆژیش بەڕۆژووم. وەك ئەوەی عەرشی خوابیینم بەئاشکرا و، ئەهلی بەهەشت ببینم سەردانی یەکتری ئەکەن و، ئەهلی دۆزەخ ببینم ئازارئەچێژن تیایدا..

ئنجا سێ جارپێی فەرموو: باش تێی گەیشتوویت بەردەوامبە.

وتی: دوعای شەهیدیم بۆبکە.ئەویش دوعای بۆکرد.

ئەوەبوو حاریسە شەهید کرا ودایکی هات ئەحواڵی کوڕەکەی پرسی کەئەگەر شەهیدە دڵخۆش بێت بۆی کەلەبەهەشتایە.. خۆشەویست دروودی خوای لەسەر فەرمووی: هەربەهەشتێك؟ کوڕەکەت وا لەبەهەشتەکاندا،کوڕەکەت لەفیردەوسی ئەعلادایە. دایکی بەخۆشیەوە رۆیشت و وتی: بەه، بەه، بۆتۆ ئەی حاریسە..

# دواوتە

خوایە وامان لێبکە کە بترسین و شەرمت لێبکەین لەئاشکراو نهێنیدا:اللهم انی أسألك خشیتك في الغیب والشهادة.

خوایە کەسانێك هەن وەك خۆشەویستمان هەواڵی داوینەتیَ، کەلەقیامەتا بەهێندەی چیای تیهامە چاکەیان هەیە هەمووی ئەبێتە تۆزو با و نابنە خاوەنی هیچی لەگەڵ ئەوەدا کەپەرستشی زۆر و شەونوێژیشیان کردووە، لەبەرئەوەی کە کاتیَ بەتەنها دەبوون گوناهیان دەکردو خراپەیان دەکردوسنووری خوایان ئەشکاند.

– لأعلَمَنَّ أقوامًا من أمَّتي يأتون يومَ القيامةِ بأعمالٍ أمثالِ جبالِ تِهامةَ بيضاءَ فيجعلُها هباءً منثورًا قال ثوبانُ يا رسولَ اللهِ صِفْهم لنا جَلِّهم لنا لا نكونُ منهم ونحن لا نعلمُ قال أما إنَّهم إخوانُكم ومن جِلدتِكم ويأخذون من اللَّيلِ كما تأخذون ولكنَّهم قومٌ إذا خلَوْا بمحارمِ اللهِ انتهكوها..المنذری

شێخ محمد شەنقیتی ئەڵێت: خوای گەورە هیچ ئامۆژگاریکارو بەربەستێکی دانەناوە گەورەتربێت لەدیواری چاودێری، جاهەرچی ئەو دیوارەی بەزاندو رووخاندی ئەوە جورئەت و زیادەڕەوی کردووە بەرامبەر بەوخوایەی ئەیبینێت، کەئەوەش خراپترین جورئەتە، هەرلەبەرئەوەشە هەندیَ لە پیاوچاکانی پێشینان وتوویانە: بەڕووکەش ئەولیای خوامەبەو لە پەنهانیشدا دوژمنی بیت..

خوای گەورە تاقیمان ئەکاتەوە تادەرکەویَ ئێمە لەپەنهاندا لەخوا ئەترسین یان نا، ئەوەتا لەکاتی ئیحرامدا جاری وایە نێچیرێك بەدەست یان بەرمێك راوئەکرێت کەچی یاساغی کردووە بۆئەوەی ئیرادەی موسڵمانان تاقیبکاتەوەو بە نهێنیش لەخوا بترسن وبزانن کەخوا ئەیانبینێت.

- ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَيَبْلُوَنَّكُمُ اللَّهُ بِشَيْءٍ مِنَ الصَّيْدِ تَنَالُهُ أَيْدِيكُمْ وَرِمَاحُكُمْ لِيَعْلَمَ اللَّهُ مَنْ يَخَافُهُ بِالْغَيْبِ فَمَنِ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ المائدة: ٩٤.

## خۆشەویست لە حەجی ماڵئاواییدا دوعای کردو فەرمووی:

كان فيما دعا به رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم في حجَّةِ الوداعِ: اللَّهمَّ إنَّك تسمعُ كلامي وترَى مكاني وتعلمُ سرِّي وعلانيتي لا يخفَى عليك شيءٌ من أمري أناالبائس الفقيرُ المستغيثُ المستجيرُ الوجِلُ المشفِقُ المُقِرُّ المعترِفُ بذنبِه أسألُك مسألةَ المسكينِ وأبتهِلُ إليه ابتهالَ المُذنِبِ الذَّليلِ وأدعوك دعاءَ الخائفِ الضَّريرِ من خضعَتْ لك رقبتُه وفاضت لك عيناه وذلَّ جسدُه ورغِم أنفُه لك اللَّهمَّ لا تجعلني بدعائِك شقيًّا وكُنْ بي رؤوفًا رحيمًا يا خيرَ المسؤولين ويا خيرَ المُعطين

الراوي: عبدالله بن عباس | المحدث: ابن عساكر | المصدر: معجم الشيوخ

الصفحة أو الرقم | ٢/٩٤٨ :خلاصة حكم المحدث: حسن غريب.

خوایە تۆ قسەکانم ئەبیستی و شوێنم ئەبینی، نهێنی و ئاشکرام ئەزانیت،هیچی من شاراوەنیە لات، منی هەژاری بێچارە، هاناهێنەری پەناگرتوو،ترساوی دڵ لەمشت،داننەر بەگوناهیا،وەك هەژاران داوات لێئەکەم، ئەپاڕێمەوە وەك پاڕانەوەی گوناهبارێکی زەلیل،نزا ئەکەم وەك نزای نابینایەکی ترساو،ئەوکەسەی کەگەردنی بۆت کەچکردووە،فرمێسکی بۆت سەرئەکا، لاشەی زەلیل کردووە بۆت، لووتی خۆی بۆ داوی لەزەوی، خوایە لەوەی داوام کردووە بێبەشم مەکەو بەسۆزومیهرەبان بەبۆم، ئەی چاکتریت داوالێکراو، ئەی چاکترین بەخشەر.

هەرشادبن تابەیەکگەیشتنەوەیەکی تر بەخواتان ئەسپێرم..

بەرهەمەکانی نووسەر:

١-بەرەو پەروەردەی ئیسلامی ٨-بەرەو ئیسلام

٢-بەرچاوڕوونی ٩-رازی قورئانی

٣-فەرهەنگی بانگخوازان ١٠- رامان لە قورئان

٤-لەخزمەت قورئاندا ١١ -هەزارویەك

٥-بەهاری دڵان ١٢-هەزارو دوو

٦-ژیانەوە ١٣- سەلیقەی بروادار

٧-نەسرەوتن بەرگی یەك و دوو ١٤-گەشتی ژیان پێنج بەرگ دەرچووە

چاوەڕوانی بەرگی شەش بن..

هەروەها بەئیزنی خوا چاوەڕێی بەرگی دووەمی باس وخواسی قورئانی بن

لەگەڵ نەسرەوتن بەرگی سێ..

## پێڕست

**خوای گەورە زانایی و قودرەت و دەسەڵاتی خۆیمان**